بەرگی
١

دکـــتۆر
یعقوب حسین عبدالکریم الراوی

# زانستی نوێ



# و



# کۆتایی بوونەوەر

نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی
بەراوردێک لە نێوان قورئان و فەرموودەو زانستی سەردەم

چاپی سێیەم




# زانستی نوێ
# و
# کۆتایی بوونەوەر

- نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی
- بەراوردێک لە نێوان قورئان و فەرموودەو زانستی سەردەم


نووسینی

**دکتۆر یعقوب حسین عبدالکریم الراوی**

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤
فەیس بووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
هەولێر-بەرامبەر دەرگای قەڵا- بازاڕی ڕۆشەنبیری




ناوی کتێب: زانستی نوێ و کۆتـــایی بوونـەوەر
نووسەر: دکتۆر یعقوب حسین عبدالکریم الراوی
نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: زەردەشـت کاوانی
بابەت: زانســـتی
چاپخانە: حاجـــی قـــادری کۆیـــی
چاپی: چاپی سێیەم/ ١٤٤٢ ـ ٢٠٢٠ .
تیراژ: ١٥٠٠
پێوانە : ( ١٧ x ٢٤ ) سم
لاپەڕە : ٤٠٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردن: (٥١٣) ساڵی (٢٠١٢) ی پێدراوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ )

# پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار، درودو سڵاوی خوای گەورە لەسەر گیانی پاکی موحەممەد (ﷺ) و یارو یاوەرو شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی.

لەم سەردەمەی ئێمە بابەتەکان تێکەڵ و پێکەڵ بوون، لە پەرتوکخانەو ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێتدا، درۆ و مەزەندە لێدانی خۆڕایی دەبینی بۆ ڕووداوەکانی داهاتوو، گوایە پشتیان بەستووە بە هەندێ ئایەت و فەرموودە کە ئاماژەیان تێدایە بۆ ڕووداو گەلێکی داهاتوو پەیوەست بێت بە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

چەندین دەردەسەری زیاد بکات لەسەر ئیسلام و شوێنکەوتووانی، ئەوەندە دەگەڕێن بە دوای ڕێگە چارەیەك.. یان زیاتر لە ڕێگە چارەیەك، جار جارە دەبیستی بە دەرچوونی مەهدی، یان بە نزیکبوونەوەی داستانێکی گەورە لەگەڵ جوولەکەو گاورەکاندا.. یان بە ڕۆچوونی زەوی ڕۆژهەڵات و خۆرئاوا.

بە دڵنیایی دەڵێین ڕاسترین قسەو گوفتار فەرمودەی خوایە، باشترین ڕەوت و ڕێبازیش هەڵگرتنی شوێن پێی پێغەمبەرە(ﷺ)، خراپترین کاریش لە ئاییندا داهێنراو و هەڵبەستراوە.

لای هەموو مرۆڤێك ئاشکراو ڕوونە کە خوای پەروەردگار پێغەمبەرمانی محەممەد(ﷺ) ناردووە بۆ ئەوەی ببێتە موژدەدەرو ترسێنەر تا ڕۆژی دوایی.

ئەم ئوممەتەش کۆتا ئوممەتە، پێغەمبەری خۆشەویستمان (محمد) کۆتایی پێغەمبەرانە، خوای پەروەردگار ئەم ئومەتەی تایبەتمەند کردووە کە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لێوەی سەر هەڵبدات و لەسەر زمانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی بکاتەوە.

بەرگی یەکەم

زانستی سەردەم ڕاستی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دەردەخات، بۆیە زۆر پێویستە لەسەر موسڵمانی ژیر، بیر لە کاتی هاتنی ڕوودانی ئەم ڕۆژە ترسناکە بکاتەوە.

خوای گەورە ئەوەندە هۆکارو توانای پێ بەخشیوین کە ئیتر هیچ بیانویەکمان بۆ نەمێنێتەوە لە کاتی هەر بەڵایەکدا، نایەتە بەر هەستم ئادەمیزادێك هەبێت لە دەرگای زانایەك بدات و پرسیاری لێ بکات نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر چییە؟ لەبەر ئەوەی بابەتەکەی بەلاوە گرنگ نیە.

بەڵام زۆر بەلایەوە ئاساییە پرسیار لە تیۆرێکی ئابوری بۆ نرخی ئەمڕۆی بەشەکەی لە فلانە کۆمپانیادا بکات با سەیری حاڵی دونیاو مەسەلەی ڕۆژی دوایی بکەین، ئێمە دەتوانین بڵێین کە باوەڕدارێك چەندی پێیە بۆ دونیاو دوا ڕۆژی، ئەگەر لەگەڵی دانیشتی کاتژمێرێك باسی دونیای کردو چەندین سەعات باسی قیامەتی کرد ئەوا دەتوانی بە ئەندازەی هەر یەکەیان دڵی و زمانی بخوێنیەوەو بۆت دەربکەوێت.

خوای گەورە نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی کردۆتە زەنگێکی ئاگادارکردنەوەی بەندەکان هەتا بە ئاگا بێتەوەو لە کاتی نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دواییدا دەرگای تەوبەکردنی بە هەمیشەیی بۆ واڵا کردوین.. چەند نیشانەیە؟ سەد نیشانە زیاترە، ئایا پێویستی بە سەد نیشانە زیاتر هەیە یان بە یەك نیشانە بۆ ئەوەی بە ئاگا بێینەوە.

باوەڕداری ڕاستگۆ یەك نیشانەی ڕۆژی دوایی بەسە، بەڵام سروشتی ئادەمیزاد وایە کەرەمی خوایی لەسەرمان بیردەچێتەوە، بۆیە نیشانە بە دوای نیشانەدا دەنێرێت هەتا هەمیشە لە یادمان بێت، ئەوەش ڕەحم و میهرەبانی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی، ئەگەر نیشانە بچوکەکانی ڕۆژی دوایی هەندێکیان یاخود هەموویان تەواو بوون یان گومانی سەرهەڵدانی نیشانە گەورەکانی کۆتایی بونەوەر سەریان هەڵداو خۆر لە خۆرئاواوە هەڵهات ئیتر دەرگای تەوبەکردن دادخرێت و ئەو خەڵکانەی کە لەو سەردەمەدا دەژین ڕووبەڕووی

چەندین تاقیکردنەوەی سەخت و دژوار دەبنەوە. واتە: ئیتر نامەی کردەوەکان بەرز دەبنەوەو قەڵەمەکانیش وشك دەبن[١].

وە بە تەواببوونی دواهەمین نیشانە بچووکەکانی کۆتایی بونەوەر ماوەیەکی زۆر دەکەوێتە نێوان نیشانەکانەوە، لەناکاو لە خەو هەڵستن یەکەم نیشانەی گەورەی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی دەجاله یان هەڵهاتنی خۆرە لە ڕۆژئاواوە.

لە دیکۆمێنتەرەکەی خۆیدا ڕاستیەکی ڕاچڵەکێنەر کە خەڵاتی ئۆسکاری پێ ڕەوا بینرا (ئەڵگۆر) باس لەوە دەکات کە ئەگەر مرۆڤ دەست بە زەویەوە نەگرێت، نەوەکانی داهاتوو شتێکیان بۆ نامێنێتەوە تا شەڕی لەسەر بکەن، لە ڕاستیدا تەندروستی گۆی زەوی لەوە خراپترە کە تا ئێستا باسی لێوە کراوە، تێکدان و لەناوبردنی ژینگەو بە دروستی بە کارنەهێنانی سەرچاوەکان، وادەکات نەوەکانی داهاتوو بە خێر یادی سەردەمی ئێمە نەکەنەوە.

من وای تێدەگەم کە هاتنی ڕۆژی دوایی زۆر نزیکە جا نازانم باش تێگەیشتووم یاخود هێشتا پێنەگەییوم.. هۆکاری ئەم تێگەیشتنە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چەندین ساڵە توێژینەوەیەکی زۆر ورد دەکەم سەبارەت بە گۆڕانکاریەکانی جیهان و نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر.

لەگەڵ ئەوەش تێزی دکتۆراکەم لە ژێر ناونیشانی (نهاية العالم بين القرآن الكريم وبعض الحقائق العلمية) بوو، واتە: کۆتایی بونەوەر لە نێوان قورئان و هەندێك لە ڕاستیەکانی زانستی .. دوای توێژینەوەیەکی چڕوپڕ گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە هاتنی ڕۆژی دوایی نزیکە، چونکە ڕۆژ بەڕۆژ نیشانەکانی هاتنی کۆتایی بونەوەر سەرهەڵدەدات.

مرۆڤایەتی لەم سەردەمە بە خێراییەکی زۆر بەرەو کۆتایی دەڕوات، چونکە دەتوانم بڵێم ٩٧٪ لە نیشانەکان هاتوونەتە دی.. وە ئێمە لە چاوەڕوانی دەرکەوتنی یەکەم لە نیشانە گەورەکانین.

---

(١) التذكرة، للقرطبي لا ٦١٦، وصحيح أشراط الساعة، محمد بيومي، لا ١٠، وحقيقة الخبر في المهدي المنتظر، مجدي سعد لا١٢٧.

بەرگی یەکەم

ئەم پەرتوکەی ژێر دەستت بریتیە لە ژێر ناونیشانی (زانستی نوێ و کۆتایی بونەوەر) لەم پەرتوکە هەوڵم داوە سەبارەت بە بابەتێکی زۆر گرنگ بدوێم کە جێگای وتووێژە لە ئاستە زانستیەکانی ئەمڕۆدا، بە تایبەتی زانستی فیزیا، ئەویش بابەتی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دواییە.

لەم پەرتوکە هەوڵم داوە ڕەددی ئەوانە بدەمەوە کە کاتی هاتنی کۆتایی بونەوەریان دیاری کرد، چونکە کەسانێك پەیدا بوون هەڵدەستن بە دیاری کردنی کاتی سەرهەڵدانی نیشانەیەك یاخود هاتنی ڕۆژی دوایی، بەداخەوە ئەمە لە سۆنگەی شەریعەتی ئیسلام جێگای نابێتەوە.

لەم پەرتووکە هەوڵم داوە کە خۆم بە دوور بگرم لە درێژەدان بە نوسینی نیشانەکان، هەندێ نیشانەی ڕۆژی دواییمان خستووەتە بەردەم ئێوەی خۆشەویست و سەنگین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لە نیشانەکانی قیامەتم لەم کتێبەدا نەخستۆتە ڕوو ئەمەش لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەکان..

لەم پەرتووکە هەوڵم داوە زۆرترین فەرموودە صەحیحەکان بخەمە ڕوو، هەروەها بەشێکیش لەم فەرموودانەی کە زانایانی فەرموودەناس بەبێ هێزیان بەردەستت باسم کردوون.. ئەوەش واتای ئەوە نییە کە ئیشی پێناکرێت، بەڵکو لە یاسای زانستی فەرموودەناسی فەرموودەی بێهێز ئیشی پێدەکرێت بە چەند مەرجێك کە زانایان باسیان کردووە.

لە کۆتایی داواکارم لەخوای پەروەردگار تەوفیقمان بدات بۆ سەر ڕێگە ڕاستەقینەکەی خۆی و لەگەڵ دایك و باوکمان بەرەو بەهەشت بچین و، ڕزگارمان بێت لە ئاگری دۆزەخ.

وصل الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

**دکتۆر يعقوب حسين عبدالكريم الراوي**

٥/ ٥/ ٢٠٢٠

بەشی یەکەم

# ڕێخۆشکەر

پێش ئەوەی بچیتە ناو ئەم پەرتوکەوە، حەز دەکەم بزانیت کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا زۆر گرنگی بە نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی داوە، بۆیە هەڵاتن لە کۆتایی بونەوەر و هاتنی ڕۆژی دوایی نییە.

یەکەم کەس کە گرنگی بە هاتنی کۆتایی بونەوەر دابێت و خۆی بۆ ئامادە کردبێت پێغەمبەرمان (محمد) بووە، کە لە فەرمایشتەکانی و ڕەفتارەکانیدا زۆر بە ئاشکرا بە دیار دەکەوێت.

زانستی سەردەم و زانایانی فەلەکناسی ئەم گرنگیە دووپات دەکەنەوەو دەڵێن: بە پێی ئەم توێژینەوانەی کە ئەنجاممان داوە، بۆمان دەرکەوتووە کە هیچ شتێك بە ئەندازەی هاتنی ڕۆژی دوایی نزیك نیە.

ئەوانەی کە ئامادە باشیان بۆ ڕۆژی دوایی هەبووە، قوتابیەکانی پێغەمبەرن(ﷺ) وە ئەوانەی لەسەر ڕێبازو ڕێچکەی ئەوان ڕۆیشتوون، چونکە ئەوان لەم ڕاستیە گەیشتوون.

بۆیە هەر پلەو پایەکت هەبێت.. هێشتا پێویستیت بە زانست هەیە.. تا وەکو ژیریت لەسەردابێت، هەر دەبێ بە دوای زانستدا بگەڕێیت.

زانراوە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر بە پەراوێك و دوو پەڕاو و سەد پەڕاو کۆتایی نایەت، بەڵام ئەگەر مرۆڤ بە گەردوون بەراورد بکرێت، دەردەکەوێت کە هەر چەندە تەمەنی بە گوێرەی تەمەنی گەردوون کەمترە، لە چرکەیەك بەرامبەر ڕۆژێك، قەبارەکەشی لە ئاستی قەبارەی گەردوون هەر دیار نیە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پایە بەرزیەی کە بە مرۆڤ دراوە، بە هیچ بوونەوەرێکی تر لەم گەردوونە نەدراوە.

ئەم پەرتوکەش سەرەتایەکی لەبارە بۆ شارەزایی پەیداکردن لە کۆتایی بونەوەر، نەك تەنها ئارەزوومەندانی ئەم بوارە، بەڵکو هەمو زانست دۆستێك دەتوانێ گەشتێکی پڕ لە گوشاد بە گەردووندا بکات.

وە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و گەردوون خۆشەویستیە نەك بەربەرەکانێ.. هەردوکیان ڕێبواری ڕێگایەکن، لە یەك سەرچاوەوە هاتون و هەر بۆ لای ئەو سەرچاوەیەش دەڕۆنەوە.

## هۆکاری گەڵاڵە بوونی ئەم بابەتە

ماوەیەکی دوورو درێژ بوو پڕ بەدڵ حەزم دەکرد بابەتێك لەم چەشنە بنوسم و خۆمی پێوە بەختەوەر بکەم، هەر چەندە ئێمەی پێنووس بە دەست پێنووسەکەمان کۆڵە، بەڵام باشترین بەرهەم بۆ ئێمە ئەوەیە بتوانین ڕاستیەکان وەك خۆی لە کانیاوی هەستی دەرونمانەوە بخەینە سەر ڕوپاری نوکی خامەکانمان.

ئەم پەرتووکەی لەبەر دەستت دایە، بە زمانێکی سادە داڕێژراوە، بە شێوەیەك هەموو کەسێك و هەموو ئاستێك دەتوانێت سودی لیێ ببینێت، وە هەوڵی خۆپارستنم داوە لە درێژ بوونەوەی باسەکان، مەگەر شوێن و کاتەکە ڕاڤەو تێبینی زیاتری ویستبێت.. وەهەروەها بۆ ڕاڤەکردنی ئایەتەکان پشتم بە چەندین ڕاڤەی قورئان بەستووە، هەروەکو ئاماژەم پێکردونە لە شوێنی دیاریکراودا.

هاوکات دەست بەرداری دەقە عەرەبیەکانی ئایەت و فەرموودەکان نەبوویمە، بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر ئاشنایی پەیدا بکات، بە زمانی عەرەبی و متمانە بەرامبەر ڕاڤەکان پەیدا بکات.. هەروەها سەرچاوەکانیشم دیاری کردووە لە ڕووی زانستیەوە، تاوەکو خوێنەری بەڕێز هەر کاتێك ویستی بگەڕێتەوە سەر سەرچاوەکان .

ئەم پەرتوکە بانگەوازێکە بۆ بڕوابوون بە خوای گەورەو ڕۆژی دوایی، وە بەڕاست زانینی ئەوەی کەوا پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوە ئەو پێغەمبەرەی کەوا هەق نەبێ وشە دەرنابڕێ کە ئەویش وەحی خوایە سەلام و بەرەکەت لەسەر خۆی و کەس و کار و هاوەڵانی بێ[1].

---

(١) أشراط الساعة، يوسف الوابل (لا ١٢ ـ ١٣).

# هۆکاری دروستبوونی ژیان و بوونەوەر

پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێکی ژیر بیربکاتەوەو لە خۆی بپرسێت سەرەتا گەردوون چۆن بەدیهێنراوە؟

کێ بەدیهێنەریەتی؟

بۆچی بەدیهاتووە لەم بونەوەرەدا؟

ئەرك و فەرمانی لەم سەر زەویەدا چیە؟

هەر کاتێ مرۆڤ بیرو هۆشی کردەوە، ئەم پرسیارانەی بە مێشك دادێت، داوای وەڵامێکی شیاوی لێ دەکەن، بۆیە پێویستە بیرو هۆشی خۆی بخاتە گەڕ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە گرنگانەو بەدوای وەڵامێکی گونجاو بۆیان بگەڕێت.

شورەییە بۆ مرۆڤ کە خوای گەورە بیرو هۆشی داوەتێ بەڵام ئەو نەیخاتە گەڕو بیر لەسەرەنجامی خۆی نەکاتەوەو بەبێ ئاگایی وەکو ئاژەڵ بژی بۆ خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن، تا لەناکاو مردن یەخەی دەگرێت ئەمجا پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام پەشیمانی دادی نادات و فریای هیچ ناکەوێ، مەگەر کەسێك خوا بۆ خۆی ڕەحمی پێ بکات.

بێگومان ئەو پرسیارانەی کە لە پێشەوە کران هەر دەبێت وەڵام بدرێنەوە، بۆ ئەوەی مرۆڤ بزانێت کێیەو لە کوێوە هاتووە؟

بۆچی بەدیهاتووە؟

سەرەنجامی بەرەو کوێیەو لە دوای تەواوکردنی ئەم تەمەنە کورتە چی ڕوو دەدات[١]؟

---

(١) علی حافة الحیاة، أحمد ابراهیم مصلح، لا ٢٤٩.

## یەکەم: لە کوێوە هاتووم؟

ئەمە گرێ و گۆڵێکی ژیانی ئەو ماددیانەیە کە تەنها باوەڕیان بە پێنج هەستـەکە هەیە، ئەویش (چاو، گوێ، لوت، دەم، دەست لێدان)، لەسەر ئەو کوێریەی خۆیان بەردەوام هەنگاو دەنێن، ئەو هەموو یاساو ڕێسا جوان و ڕێك و پێکانەی گەردوون بە دروستکراوی ڕێککەوتی کەڕو کوێرو لاڵی دادەنێن!

خوای گەورە لەسەر فیترەتی پاك ئادەمیزادی دروست کردوە، ئەوانەی بە بەڵێ وەڵامی فیترەتی پاکیان داوەتەوە و باوەڕیان وایە ئەم گەردوونە بێ خاوەن نیە، بەڵکو بەدیهێنەرێکی هەتا بڵێی گەورەو باڵادەستی هەیە، بە هەموو دڵێکیانەوە ڕووی تێدەکەن، بەترس و ڕێزەوە، بە هیواو ئومێدەوە، زۆر لایان گەورەیەو پشت و پەنای پێ دەبەستن.

هەر چەندە خاوەنی ئەو دەنگە فیتریە لە کاتی خۆشی و ڕابواردنەکانی دونیادا، بە ئەنقەست ئەو دەنگە دەشارێتەوە، بەڵام کاتێك ڕوداني سەخت و بەڵاو ناخۆشی ڕووی تێکرد، توانای خۆ ڕاگرتنی نەبوو، هیوا بڕاو بوو لە مرۆڤەکانی دەوروبەری، ئەو کاتە بەملکەچیەوە هاوار لەخوا دەکات و پەشیمان دەبێتەوە، کاتێك تەنگانەو ناخۆشیەکی توش دەبێ ڕوو لە پەروەردگاری دەکات و داوای لابردنی لێ دەکات.

پاشان ئەگەر خوای گەورە لەلایەن خۆیەوە بەهرەیەکی دایە، ئیتر ئەوە لەبیر خۆی دەباتەوە کە لەوەو پێش دەپاڕایەوە ڕزگاری بکات، چەند هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، هەتا جگە لەخۆی خەڵکیش گومڕا بکات و نەهێڵێ بەرەو ڕێگای خوا بچن، بڵێ: بەو کەسە بێبڕوایە کەمێکی تریش بەو تەمەنە کورت و کەمەوە رابوێرە لە دونیادا، چونکە تۆ بەڕاستی لە هاوەڵ و یارانی ئاگری دۆزەخی[١].

---

(١) على حافة الحياة، أحمد ابراهيم مصلح، لا ٢٥٠.

ئەم دروستکراوانە هەر لەسەرەتاوە بەبێهوودە بەدی نەهاتون، خۆشیان خۆیان بەدی نەهێناوە، کەسیش بانگەوازی بۆ ئەوە نەکردوە کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی بێ[1]!

کە ئەوەش شتێکی مەحاڵە، کەواتە ئەی کێ بەدیهێنەری ئەم بونەوەرەیە؟!

کەی ژێری ڕێگەی ئەوەی داوە دەرگایەکی تەختە لەخۆیەوە پەیدا ببێت بەبێ وەستا؟

یان کۆشك و تەلارێك هەروا لەخۆیەوە بەبێ وەستایەکی کارامە دروست بکرێت و برازێنرێتەوە؟

ئەی کەواتە بونەوەرێکی وەها فرەوان بە هەزاران کاکێشان و ملیارەها ئەستێرەو چۆن هەروا لە خۆیانەوە بەدیهاتوون ؟!!

## دووەم : بۆچی بەدیهێنراوم ؟!

دوای ئەوەی مرۆڤ خوا ئەم گەردوونەو ئەویشی بەدیهێناوە، پێویستە لەخۆی بپرسێت بۆچی دروستکراوم ؟!

بۆچی جیاکراومەتەوە لەسەرجەم بونەوەرانی تر؟

ئەرك و فەرمانم لەسەر زەویدا چیە؟

بێگومان وەڵامەکەی لای باوەڕداران ئامادەیە، بەڕاستی هەموو دروستکەرێك نهێنی ئەو شتەی دروستی کردوە ئەزانێت بۆچی دروستی کردوە؟

خوای گەورە بەدیهێنەری مرۆڤەکانە، کارو فەرمانەکانیان بەدەست ئەوە، ئایا پەروەردگار ئەم مرۆڤانەی بۆچی بەدیهێناوە؟

بۆ خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن؟

بۆ گەڕان بەسەر زەوی بە ئارەزووی خۆیان؟

---

(١) علی حافة الحیاة، أحمد ابراهیم مصلح، لا ٢٤٩.

بۆ خواردنی ئەو شتانەی لە خاك دەردەچن و دەچنەوە ناو خاك ؟
هەر بەو شێوەیە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ناو ئەو خاك؟
ئیتر سەرگوزەشتەی ژیان کۆتایی دێت؟
ئایا حیکمەت لەو ماوە کورتەی ژیانی پڕ لەبەڵاو ناسۆرو مەینەتی دونیا چیە؟
نهێنی ئەو هەموو توانایە دراوە بە مرۆڤ چیە[1]؟

خوای پەروەردگار وەڵامی ئەم هەموو پرسیارانە دەداتەوەو دەفەرموێ: [وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ][2].

## سێهەم: سەرەنجاممان بەرەو کوێیە؟

دوای ئەوەی مرۆڤ زانی خوای گەورە بەدیهێنەریەتی و، بۆ ناسین و پەرستشی خۆی بەدیهێناون، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین سەرەنجاممان بەرەو کوێیە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ماددیە سەر لێشێواوەکان وەڵامێکیان پێیە کەوا خەڵك بەرەو نزم بونەوەو ژیانی ئاژەڵی دەبەن و بە سوکی وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوەو دەڵێن: سەرەنجامی مرۆڤ بەرەو نەمانێکی هەمیشەیی دەڕوات، هەروەك چۆن گیانەوەرانی تر دەڕۆن بەرەو نەمانی هەمیشەیی و دەبنەوە بە گڵ و بەبادا دەچن.

جا ئەگەر وایە حیکمەتی بون لەم ژیانە چیە؟

کە ژیان و سەرگوزەشتەی مرۆڤ لای ئەوان ئەوە بێت، منداڵدانی دایك فرێی داتە دەرەوەو زەویش قوتی بداتەوە، ئیتر نە ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە هەبێت، چاکەو خراپە یەکسان و بەرامبەر بێت!

ئەگەر وایە ئەم مرۆڤە بۆچی جیاکراوەتەوە لە گیانەوەرانی تر؟

---

(١) على حافة الحياة، أحمد ابراهيم مصلح، لا ٢٥٣.
(٢) سورة الذاريات، الآية: (٥٦).

بۆچی ژیری و هۆشمەندی پێدراوە؟

ئەم هەموو شتانەی بۆچی بۆ فەراهەم هێنراوە؟

نهێنی لەچی دایە ئەگەر مرۆڤ لەم تەمەنە کورتەی ژیانی دونیا، کە بریتیە لە چەند ڕۆژێکی دیاریکراو ژیانێکی کورت بەسەر بەرێت و سەرەنجامی لەناوچون بێت؟ وەك بەچاوی خۆمان دەبینین کە ستەمکاران چەندەها خەڵك بەبێ گوناه دەکوژن لە پیاوی پیرو ئافرەتان و منداڵان، چەندەها کاری خراپ و ناپەسند لەسەر زەویدا ئەنجام دەدەن، کەچی لەگەڵ منداڵێکی کەم تەمەن کە مرد ئاکام و سەرەنجامیان چۆن یەك بێت!

باوەڕداران خاوەنی بیرو هۆشن، چاك ئەزانن سەرەنجامیان بەرەو کوێ دەڕوات، دەزانن لە دونیادا میوانین و مەنزڵگای هەمیشەییان بەهەشتی بەرینی خوایە، دونیا دەکەن بە کێڵگەیەك و کاری تیا دەکەن و بە پلەکانی عیبادەتدا سەر دەکەون، تا دەگەنە ئاستێکی بەرزو دەرونی خۆیان خاوێن رادەگرن، بۆ ئەوەی ببنە شایستەی ئەو بەهەشتە خۆش و ڕازاوەیە، کە هەتا هەتاییەو جێگەی پیاوچاکان و پاکانە، لە ڕۆژی دوایی بەرهەمەکەی وەردەگرنەوە و فریشتەکانیش پێشوازی گەرمیان لیٚ دەکەن.

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە دەگەینە ئەم ئەنجامانە، کە خوای گەورە دروستی کردوین بۆ ئەوەی بیپەرستین و فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی بکەین و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەین، سەرەنجامیشمان گەڕانەوەیە بۆ بەردەم دادگای پڕ لە دادپەروەری ئەو زاتە گەورەو بە دەسەڵاتە، پاداشتی کردەوەکانمان وەردەگرین بە بەهەشتی هەتا هەتایی، یان بەرەو دۆزەخی هەمیشەیی[1].

---

(١) على حافة الحياة، أحمد ابراهيم مصلح، لا ٢٥٥.

# پێناسەی ڕۆژی دوایی و
# واتای ڕۆژی دوایی چی دەگەیەنێت؟

ڕۆژی دوایی:

ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە کۆتایی بە ژیانی دونیاو سیستەمی ئاسمانەکان و زەوی دەهێنێت، قۆناغی کۆتایی ژیانی مرۆڤە، لە پاش قۆناغەکانی منداڵدانی دایك و ژیانی سەر زەوی و ژیانی بەرزەخ، ئەمەش لە مردنەوە دەست پێ دەکات تاکو زیندووبوونەوە.

ڕۆژی پێشوازیە لە ژیانی نوێ

ڕۆژی وەرگرتنەوەی پاداشتە بۆ چاکەکاران

ڕۆژی سزاو تۆڵەیە بۆ خراپەکاران و بێباوەڕان

ڕۆژێکە هەموو کەس بە ماف و چارەنوسی خۆی دەگات

ڕۆژێکە کەس فریای کەس ناکەوێت، مرۆڤ لە براو دایك و باوك و منداڵەکانی خۆی هەڵدێ و ڕادەکات، کەس لەتاو خۆی ئاگای لەکەس نیە، جگە لە بەزەیی خوای پەروەردگار، هەرچی سامان و دەسەڵاتی دونیا هەیە، بە کەڵکی ئەو ڕۆژە نایەت[1].

جیهانی ڕۆژی دوایی نزیك بێت یان دوور، دیار بێت یان نادیار

چ پەیوەندیەکی بە دونیای ئێمەوە هەیە؟

چ ڕۆڵێکی لەم دونیایەدا هەیە؟

کاریگەری ئەم دونیایەش لەسەر ئەو بونەوەرە چیە؟

---

(١) القيامة الكبرى، عمر بن سليمان بن عبد الله الأشقر (لا ١٩) بە دەستکاریەوە..

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: باوەڕ بە ڕۆژی دوایی واتای چی دەگەیێنێت؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ بە عەقڵ بزانێ و بەدڵ بەڕاستی بزانێ و بە زمان دانی پێدا بنێ و بە کردەوە بیسەلمێنێ، کە دوای ئەم جیهانە زیندوبونەوەو لێپرسینەوەو سزاو پاداشت هەیە، جێگەی باوەڕداران بەهەشتی بەرینی هەتا هەتاییە و جێگەی بێ بڕوایانی خراپەکاریش ئاگری دۆزەخە.

باوەڕ بە ڕۆژی دوایی بە کورتی ئەوەیە کە:

لە دڵی هەر یەکێك ئەو بڕوایە جێگیر بکاو بە زمان دەریبڕێ و بە کردەوەش بیسەلمێنێ، کە دوای ئەم ژیانەی دونیا زیندوبونەوەو لێپرسینەوەو سزاو پاداشت هەیە، لە قۆناغێکی دیکەی ژیاندا کە پێشەکیەکەی ڕاستەوخۆ پاش مردن دەست پێدەکات.

پاشان لە ڕۆژی دواییدا بە تەواوی بەرجەستە دەبێ و بە نیشتەجێ بوونی باوەڕدارانی چاکەکار لە بەهەشتدا و بێباوەڕان و خراپەکاران لە دۆزەخدا کۆتایی پێ دێت[1].

موعجیزەیەکی ژمارەیی لە قورئان سەبارەت بە ڕۆژی دوایی :

ئەگەر چاوێك بە قورئاندا بخشێنین، دەبینین ڕۆژانە موعجیزەکانی قورئان دەردەکەون، جا یەکێـك لە موعجیزەکانی قورئان موعجیزەیەکی ژمارەییە سەبارەت بە دونیاو ڕۆژی دوایی:

لە سەرەتای ئیعجازی ژمارەییدا (عبدالرزاق نەوفل) پەڕاوێکی نووسی لە بارەی دونیاو ڕۆژی دوایی، تا بیسەلمێنێ کە ئیسلام هاوسەنگی کردووە لە نێوان دونیاو ڕۆژی دواییدا گرنگی بەهەردوولا داوە:

---

(١) القيامة الكبرى، عمر بن سليمان بن عبد الله الأشقر (لا ٢٠) بە دەستکاریەوە.

بەشی یەکەم

لە کاتێکدا کە وشەی دونیا و ڕۆژی دوایی لە قورئان دەرهێنا

بۆی دەرکەوت کەوا (١١٥) جار وشەی دونیا

(١١٥)جار وشەی ڕۆژی دوایی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە[١].

## خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوایی :

پێویستە موسڵمان بەردەوام لە ئامادە باشیدا بێت بۆ ڕۆژی دوایی، خوای گەورە دەفەرموێ: [وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ][٢].

واتە: پەلە بکەن و پێشبڕکێ بکەن تا دەگەن بە لێخۆشبونی پەروەردگارتان و بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بە قەد ئاسمانەکان و زەویە، ئەم بەهەشتەش بۆ پارێزکاران ئامادەکراوە.

پێشەوا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری یەکێك لە هاوەڵانی کردو پێی فەرموو: (اغْتَنِمْ خَمْسًا قَبْلَ خَمْسٍ: شَبَابَكَ قَبْلَ هَرَمِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَقَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ، وَفَرَاغَكَ قَبْلَ شُغْلِكَ، وَحَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ)[٣].

واتە: پێنج شت بەهەل بزانە لە پێش پێنج شتەوە: گەنجیت پێش پیریت، لەش ساغیت پێش نەخۆشیت، دەوڵەمەندیت پێش هەژاریت، دەست بەتاڵیت پێش سەرقاڵیت، ژیانت پێش مردنت.

پێشەوا عومەری کوری خەتاب (ﷺ) دەڵێت: لێپرسینەوەی نەفسی خۆتان بکەن پێش ئەوەی لێپێچینەوەتان لەگەڵدا بکرێت، کردەوەکانتان بکێشن پێش

---

(١) کتاب الإعجاز العددي، عبد الرزاق نوفل، لا ٩٢ .

(٢) سورة آل عمران، الآية: (١٣٣).

(٣) المستدرك على الصحيحين (٤/ ٣٤١)، كتاب: الرقاق، برقم: (٧٨٤٦)..

ئەوەی لە ڕۆژی دوایی بۆتان بکێشن، خۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕۆژی دوایی، ئەو ڕۆژەی هەموو کردەوەکانتان پیشان دەدرێت[١].

لەبەر ئەوە پێوستە هەموو موسڵمانێك لێپرسینەوەی نەفسی خۆی بکات لەسەر گوفتارو کردەوەکانی، چونکە ئەوەی لە دونیادا لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات، لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی بۆی ئاسان دەبێت .

پیاوچاکانی پێشین لەخۆ ئامادەکردنیان بۆ ڕۆژی دوایی، بە کردەوەی چاکی خۆیان بوون بە نمونەی بەرزو پێشەنگ بۆ نەوەکانی دوای خۆیان، هیچ دەروازەیەك لە دەروازەکانی خێرو چاکە نەبوە پێشبڕکێیان نەکردبیٚ بۆ چونە ژورەوە لێیەوە، هیچ دەروازەیەکی خراپیش نەبوە خۆیان لیٚ نەپاراستبیٚ، هەموو ئەمانەش لەبەر ئەوە بووە پەیڕەو کاری ئایەتەکانی قورئانی بون.

خۆ ئامادەکردنی پیاوچاکانی پێشین بۆ گەیشتن بەخزمەتی پەروەردگاری خۆیان، تەنها بە وتەی ڕوت و بەبیٚ کردەوە نەبوە، بەڵکو لە کانگای دڵیانەوە بووە و گشت ئەندامەکانی جەستەشیان گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوای کردگار بووە.

پیاوچاکانی پێشین هەمیشە کارو کردەوەی ڕۆژی دواییان پێش بەرژەوەندی و ئیش و کاری دونیایی دەخست.

پێشەوا عەلی کوری ئەبوتالیب (ﷺ) دەڵێت:

ئەوەی زۆر لێی دەترسم شوێن کەوتنی هەواو هەوەس و هیوا درێژییە، بێگومان شوێنکەوتنی هەواو هەوەس وا لە مرۆڤ دەکات بەربەرکانیٚ و دژایەتی هەق بکات، هیوا درێژیش ڕۆژی دوایی لەبیر دەباتەوە، دونیا پشتمان تێدەکات و ڕۆژی دوایی ڕومان تێدەکات، هەر یەکەیان کوڕی خۆی هەیە، دەی ئێوەش کوڕی قیامەت بن و مەبنە کوری دونیا، ئەمڕۆ ڕۆژی کارکردنە، نەك لێپرسینەوە، بەیانی ڕۆژی لێپێچینەوەیە، نەك کارکردن[٢].

---

(١) إحياء علوم الدين (٤ /٤٠٢).

(٢) حلية الاولياء، ابو نعيم الاصبهاني (١/٤٠).

بەرگی یەکەم

مالیکی کوری دینار(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

ئەوەی دونیا بخوازێت و داوای لێ بکات، با هەموو دینەکەی بکاتە مارەیی، بەوەش بێت و ڕازی بێت.

شاعیری گەورە (ئەبو عەتاهیە) لە سەرزەنشتی ماڵی دونیادا دەڵێت:

یـــا جامع المال في الدنيا لوارثـــه هـل أنت بالمال بعد الموت تنتفع
لا تمسك المال واسترضي الإلـه بـــه فإن حسـبـك مـنـه الري والـشبع[1]

واتە: ئەی ئەو کەسەی سامان و دارایی لە دونیا کۆدەکەیتەوە بۆ ئەوانەی بە میراتی دەیبەن، ئایا ئەو دارایی و سامانە هیچ سودێك بەتۆ دەگەیەنێت لە دوای مردنت، بەو سامانە خوای گەورە لەخۆت ڕازی بکەو ڕژدی مەکە لە بەخشینی بەهەژاران، لێیان مەگرەوە پێیان ببەخشە، چونکە بەڕاستی تەنها ئەوەندەت بەسە کە برسی و تینو نەبێت و تێر بێت!

پێشەوا ئیبنو جەوزی بەغدادی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

پێوستە لەسەر ئەو کەسەی کە نازانێت چ کاتێك مردن یەخەی دەگرێت، خۆی بۆ ئامادە بکات و هەمیشە بۆی لەحاڵەتی ئامادەباشیدا بێت، بەگەنجێتی و لەش ساغیەکەی هەڵنەخەڵەتێت، بە ڕاستی زۆرترینی ئەوانەی کە دەمرن گەنج و لاوەکانن و کەمترینیان پیرو بەساڵاچووەکانن[2].

---

(١) موسوعة الشعر الإسلامي، (٥٧/٥).

(٢) صيد الخاطر، ابن الجوزي (٢٠٦/١).

## هیوا زۆری و بێئاگایی لە ڕۆژی دوایی :

زۆرێك خەڵكی ئەم سەردەمە بێئاگان لە نزیكبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، بێگومان ئەمەش بۆیان ناچێتە سەر، هەتا خوای گەورە سزایەكی لەناكاویان بۆ دەهێنێت، هەروەك دەفەرموێ: [ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ][1].

واتە: لێیان گەڕێ بابخۆن و ڕابوێرن و ئومێد بێ ئاگایان بكات، بێگومان لە داهاتوو دەزانن چۆن سزایان دەدەین.

پێشەوا ئەنەس(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ وَتَبْقَى مِنْهُ اثْنَتَانِ: الْحِرْصُ، وَالْأَمَلُ )[2].

واتە: نەوەی ئادەم پیر دەبێ، بەڵام دوو شت لەگەڵیدا دەمێنێتەوە: سوربوون لەسەر ماڵ و سامان و هیواو ئومێد.

پێشەوا قورتبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

هەقیقەتی هیوا بریتیە لە سووربوون لەسەر ماڵ و سامان و سەركردنە دونیاو خۆشەویستی بۆی و پشتكردنە لە ڕۆژی دوایی.. كەواتە هیوا زۆری دەردێكی كوشندەیەو نەخۆشیەكی درێژخایەنە، هەر كاتێك دڵی داپۆشی خراپی دەكات، هیچ دەرمانێك چارەسەری ناكات، تەنانەت پزیشكەكان و حەكیمەكان و زانایانیش دەستەوسانن لەبەرامبەریداو ناتوانن چارەسەری بكەن[3].

هەندێ لە حەكیمان گوتویانە:

سەیرمان بە كەسێك دێ كە غەم و پەژارە دایدەگرێ و دڵگران دەبێ بە لەناوچونی ماڵ و سامانی، بەڵام بە لەناوچونی تەمەنی دڵگران نابێ، سەیرمان

---

(١) سورة الحجر، الآية: (٣).

(٢) صحيح مسلم، كتاب: الزكاة، باب: كراهة الحرص على الدنيا، ژمارە (١٨١٢).

(٣) جامع لأحكام القرآن، القرطبي (١٠/ ٦).

بە کەسێك دێ دونیا پشتی تێ دەکات و ڕۆژی دوایی بەرەو ڕووی دێ، کەچی ئەو خۆی سەرقاڵی دونیا دەکات.

پێشەوا ئیبنو عومەر(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ)[1].

واتە: لە دونیادا وابژی وابزانە غەریبی یان ڕێبوارێکی تێدەپەڕی[2].

پێشەوا عەلی کوری ئەبوتالیب (ﷺ) دەڵێت:

ئەوەی زۆر لێی دەترسم شوێن کەوتوانی هەواو هەوەس و هیوا زۆریە، بێگومان شوێنکەوتنی هەواو هەوەس وا لە مرۆڤ دەکات بەربەرەکانێ و دژایەتی هەق بکات، هیوا زۆریش ڕۆژی دوایی لەبیر دەباتەوە.

پێشەوا غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

پێویستە لەسەرت خۆت بپارێزی و دووربکەویتەوە لە هیوا زۆری، چونکە ئەگەر مرۆڤ هیوای زۆر بێت توشی چوار شت دەبێت:

١- وازهێنان لە خواپەرستی و تەمەڵی کردن تێیاندا.

٢- وازهێنان لەتەوبەو پەشیمانی و دواخستنی.

٣- سوور بوون لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و سەرقاڵ بوون بە دونیاوەو فەرامۆشکردنی ڕۆژی دوایی.

٤- دڵڕەقی و لەبیرکردنی ڕۆژی دوایی، چونکە ئەگەر بەهیوای ژیانێکی درێژبێت، ئەو کاتە یادی مردن و گۆڕ ناکات[3].

---

(١) صحيح البخاري (٨/ ٨٩) باب: قول النبي (ﷺ)، برقم: (٦٤١٦).

(٢) چونکە ڕێبوار لە هیچ شوێنێکدا بەهەمیشەیی نامێنێنەوە، هەمیشەی بەدوای گەڕانەوەن بۆ مەنزڵگای خۆیان.

(٣) إحياء علوم الدين (٣/ ٤٣).

بەرگی یەکەم

چارەسەری هیوا زۆری بەزۆر بیرکردنەوە لە مردن دەبێت، بیرکردنەوە لە مردنی دۆستان و هاوڕێیان و کەسە نزیکەکان ئەوانەی بەدرێژایی تەمەنیان هەوڵیان بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان بوو کەچی لە دوای خۆی هەمووی لەناوچوو!

پێشەوا شافعی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) یەکیٚ لە شیعرەکانیدا دەڵێت:

تـزود مـن الـتـقى فـإنــك لا تــدريإذا جـن اللـيـل هـل تعيش إلى الـفـجر
فـكـم مـن عـروس زيـنـوهـا لزوجهاوقــد أخـذت أرواحـهـم لـيـلـة الـقــدر
وكـم من صغـار يرجى طول عمرهـموقـــد أدخلت أرواحـهـم ظـلمة القـــبر
وكـم مـن سـليم مـات مـن غير علـةوكـــم من سقيـم عـاش حين من الدهر
وكـم مـن فـتى يمسي ويصبح لاهـيـاوقـــد نـسجت أكـفـانـه وهـو لا يـدري[1]

واتە: تێشوی تەقواو چاکەکاری زیاد بکە لە دونیادا، چونکە تۆ نازانی کە تاریکی شەو هات ئایا تا بەیانی دەژیت، چەند بوك ڕازێنرایەوە بۆ زاوا، لە شەوی خۆشی و شادیدا ڕۆحیان دەرچوو بەیەك نەگەیشتن، چەند منداڵ هەبوون باوك و دایك و خۆشەویستانیان هیوای تەمەن درێژیان بۆ دەخواستن، بەڵام مردن یەخەی گرتن و ڕۆشتنە ناو تاریکایی گۆڕەوە، چەندین کەسی ساغ و سەلیم مردن بەبیٚ ئەوەی هیچ جۆرە نەخۆشیەکیان هەبێت، چەند کەسی دەردەدارو نەخۆش ماوەیەکی زۆر لە رۆژگارمانەوە لە ژیاندا، چەندین گەنج بەیانیان و ئێواران بیٚ ئاگابوون لە مردن، کفنی بۆ چاك کرا بە خۆی نەزانی.

لە ڕۆژی دواییدا ڕاستیەکان هەمووی ئاشکرا دەبن و نهێنیەکان و شاراوەکان دەکەونە ڕوو، ئەو ڕۆژە کەس نایپەرژێتە سەر کەس، کردەوەکانیش وردو درشتیان تۆمارکراون، دەدرێنەوە بە ڕووی خاوەنەکانیاندا.. مرۆڤ شەرمەزار و خەجاڵەت دەبێت و تازە کاریش لەکار ترازاوەو هیچ چارەیەك نەماوە.

---

(١) ديوان الإمام الشافعي المسمى جوهر النفيس في شعر الإمام محمد بن ادريس، اعداد وتعليق وتقديم: محمد ابراهيم سليم، لا ٨٢، مكتبة ابن سينا للنشر والتوزيع، جامع الفتح ـ القاهرة..

بەشی یەکەم

شاعیری بەناوبانگ (مەولەوی) ئامۆژگاری نەفسی خۆی و ئێمەش دەكات و دەڵێت:

دڵـــــە ڕێـگـاكەت گـەلێ تـاریـكەپـردەكە سـەخـتـە خـەیـلێ باریكە
دەشـتـی هـیـدایـەت تـاریك ئەبینمرێگەی ڕزگـاریـت بـاریـك ئـەبینم
چـرایـە سـازكە ڕێـی پـێ بـڕوانـیـتـوێـشـوو هەڵبگرە هـەتا ئـەتـوانـی
گەر لە ڕێی ڕاستی لای داوی تـاوانبگرە شوێنی پێ ی كردەوەی پیـاوان
تـا لەو دیواندا دێوانەی سـەرشێت!ڕوو زەردی بـەزمی یـاران نـەگـا پێت
گـەر غـەفڵەت لەڕێت داوی تەنیوەهیچ نیت بە تـەنگی شەرمـەزاریەوە
بـە دڵدا بـێـنـە یادی ئەو سـەروەرئەگەر پێی بڵێن لەو دەشتی مەحشەر
ئـەمـە سەربـە تـۆو كرداری ئـاوا!سەر چۆن هەڵئەبڕێ سـەرداری ئاوا!
ئەو كە دای نـەواند سەری لەشەرمامـن ئەبێ كام خـاك بكەم بەسەرمـا؟
ئێستە دەمبینی بەم تەرزە زەلیـلها نـامە، هاوار ، های ساقی دەلیل![1]

---

(١) دیوانی مەولەوی، لا ٧٢ .

پێویستی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی بۆ ژیانی تاکی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ :

ماموستا سەعید نورسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

باوەڕ بە ڕۆژی دوایی گرنگترین بەردی بناغەی ژیانی تاکە کەسی و کۆمەڵایەتی مرۆڤە، بنچینەی هەموو کەمالات و ڕەوشت بەرزی و بەختەوەریەکانیەتی، بۆیە لە سەدان بەڵگە تەنها ئاماژە بۆ تەنها سێ دانە لەو بەڵگانە دەکەین:

بەڵگەی یەکەم:

«منداڵان» کە نیوەی گرۆی مرۆڤ پێك دەهێنن، ئەگەر هێزی مەعنەویی «ئیمان بە بەهەشت» نەبێت کە لە دەروون و بوونی ناسك و لاوازی خۆیاندا هەستی پێ دەکەن، ناتوانن ئەو بارە ناخۆشانەی چەشنی «مردن» هەڵبگرن کە لە پێش چاویاندا ڕوو دەدەن و بە ڕواڵەت دڵتەنگ و بە ئازار دیارن، ئەم ئیمانەیان بە بەهەشت دەرگای ڕونی هیواو ئاوات لە بەردەم سروشتە ناسکەکانی ئەواندا دەکاتەوە، کە هێندە ناسك و نیانە توانای بەرگریان نیە و بە بچوکترین گیروگرفت دڵیان گەرد دەگرێت و دەدەنە پڕمەی گریان، بەڵام بەهۆی ئەم ئیمانەوە کە لە دڵیاندا چەکەرەی کردووە، دەتوانن بە خۆشی و شادی ژیان و گوزەرانیان بەسەر بەرن، چونکە هەر منداڵێك کە باوەڕی بە بەهەشت ببێت لەبەر خۆیەوە بە خۆی دەڵێت: برا بچوکەکەم، یان هاوڕێ خۆشەویستەکەم، کە کۆچی دوایی کرد، ئێستا یەکێکە لە باڵندەکانی بەهەشت، کەواتە ئەو بەسەربەستی لە بەهەشتدا گەشتی خۆی دەکات و دەحەوێتەوەو ژیانی ئێستای ئەو لەوێ لە چاو گوزەرانی ئێمە لێرەدا گەلێ باشترە[1].

بەڵگەی دووەم:

«پیران»یش کە نیوەی گرۆی مرۆڤن و لەسەر لێواری گۆڕەکانیان ڕاوەستاون، تەنها «ئیمان بە دوا ڕۆژ»ە کە ئارامیان پێ دەبەخشێت، ئەو پیرانەی کە وەك

---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور، بەرگی یەکەم وتەکان، ٧١٣٨٧، نووسینی: سەعیدی نوورسی، فاروق ڕەسول یەحیا کردوویەتی بە کوردی.

منداڵیان لێ هاتووتەوەو هەستی گیان و سروشتیان بەجارێ ناسك بووەتەوە، تەنها بە هیوامەندی ژیانی دوا ڕۆژەوەیە کە ئارام دەگرن و بەرگری ئەو نائومێدیە جەرگبڕانەی پێ دەکەن کە لە مردن و نەمانەوە پەیدا دەبن.

بەڵگەی سێیەم:

(لاوان) و (هەرزەکاران) کە جەمسەری ژیانی کۆمەڵایەتین، جگە لە مەترسی ئاگری دۆزەخ هیچ شتێکی تر نیە قوڵپە قوڵپی هەستەکانیان هێمن بکاتەوەو دەستیان لە ستەم و دەست درێژی و کاولکاری بگەڕێتەوەو بەرەنگاری هەڵەشەیی هەواو ئارەزوویان ببێتەوەو لە پەیوەندی کۆمەڵایەتیاندا هەرە باشیان بۆ دابین بکات.

بەم جۆرە گەر تەنها یەك ئەنجام لە نێوان سەدان ئەنجامی »باوەر بە حەشر« دا کە پەیوەندی بە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە هەیە، سەدان ڕوو و سوودی هەمە جۆرەی لێ دەبێتەوە، لەسەر ئەو سێ بەڵگانەی ئێستا باس کران قیاس بکرێت، ئەوا دەزانرێت کە هاتنەدی ڕاستی «حەشر» بە ئەندازەی چەسپاویی ڕاستی بەرزی مرۆڤ و پێداویستیە هەمەکیەکانەوە چەسپاوە.

دەبا زانایانی کۆمەڵناسی و ڕامیاری و ڕەوشتناسی لەوانەی کە بایەخ بە کاروباری کۆمەڵ و ڕەوشتی مرۆڤ دەدەن، گوێ لەمە ڕابگرن و با بێن و پێمان بڵێن: بە چی ئەم بۆشاییە پڕ دەکەنەوەو بە چ چارەسەریەك تیماری ئەم زامە قووڵ و بەسۆیانەی مرۆڤ دەکەن[1]!

---

(١) سەرجەمی پەیامەکانی نوور، بەرگی یەکەم وتەکان، لا ١٣٩.

# قورئان و فەرموودەو زانستی سەردەم شایەتی دەدەن لەسەر نزیکی ڕۆژی دوایی

بەرگی یەکەم

لە قــورئـــان:

قورئان دەیسەلمێنێت کە هیچ شتێك بە ئەندازەی هاتنی ڕۆژی دوایی نزیك نیە، هەروەکو دەفەرموێ: [أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ][1].

واتە: فەرمانی خودایی (ڕۆژی دوایی) هات و خێرایی لێ مەکەن پاك و بێگەردی و بەرزی بۆ خودا لەو هاوبەشیانەی بۆی بڕیار دەدەن.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای باڵا دەست بە کرداری ڕابردوی هێناوە واتە: (ماضي) بە وشەی {أَتَىٰٓ} نەیفەرموو (يأتي)، کەوایە مادەم هاتنی ڕۆژی دوایی نزیکە ئێوەش پەلە مەکەن لە هاتنی ئەو ڕۆژە بێگومان هەردێت، پاکو خاوێنی و بەرزی و بڵندی هەمیشە بۆ خوای گەورە، لەو شتانەی ئەوانە دەیکەنە هاوبەشی و هاوەڵی و زیاد لەوەی کە دەڵێن ناتوانێ ڕۆژی دوایی بێنێ.

هەروەها دەفەرموێ: [ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ][2].

واتە: لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بۆتەوە بەڵام ئەوان لە بێ ئاگایی و غەفڵەتدا پشت تێکەرو ڕوو وەرگێڕن (لە ئایینی خوا).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: [ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ ذِكۡرَىٰهُمۡ ][3].

---

(١) سورة النحل، الآية: (١) .

(٢) سورة الانبياء، الآية: (١).

(٣) سورة محمد، الآية: (١٨)

واتە: دەی ئایا ئەو (ناپاك)انەچاوەڕوانی چی دەکەن جگە لە ڕۆژی دوایی کە کت و پڕ یەخەیان بگرێت، بێگومان هەندێ لە نیشانەکانی هاتۆتە دی، کاتێ (ڕۆژی دوایی) یەخەیان بگرێت ئیتر کەی بیر دەکەنەوە.

هەروەها دەفەرموێ: [يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ][1].

واتە: (ئەی محەممەد (ﷺ) خەڵك پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی (بەرپابوونی) ڕۆژی دوایی، بڵێ: زانین و (بەرپابوونی) ئەو ڕۆژە تەنیا لای خوایە، تۆ چوزانیت، لەوانەیە ڕۆژی دوایی نزیك بێت (بەڵام خەڵك نازانن).

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: [ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ][2].

واتە: ئایا جگە لە ڕۆژی دوایی چاوەڕوانی چی دەکەن کە کت و پڕ بێت بۆیان، لە کاتێکدا ئەوان هەست ناکەن.

**پرسیارێك !!**

لەوانەیە کەسانێك پرسیار بکەن و بڵێن: چۆن هاتنی ڕۆژی دوایی نزیکە؟ ئەوە هەزارو چوار سەد ساڵ پێش ئێستا ڕاگەیەنراوە، هەتا ئێستاکەش هیچ ڕووی نەداوە؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەشدا دەڵێین: ڕۆژی دوایی لە زانست و خەملاندنی خودا نزیکە، هەر چەندە بە پێوەرە مرۆییەکان دووریش بێتە بەرچاو، بەڵام لە لای بێباوەڕەکان ڕۆژی دوایی دوورە، خوای گەورە دەفەرموێ: [إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا ﴿٧﴾][3].

---

(١) سورة الأحزاب، الآية: (٦٣).

(٢) سورة الزخرف، الآية: (٦٦).

(٣) سورة المعارج، الآية: (٦-٧).

واتە: بەڕاستی بێباوەڕەکان ڕۆژی دوایی بە دوور دەبینن، بەڵام ئێمە بە نزیکی دەبینین.

هەروەها دەبێ لەوەش ئاگاداربین ئەوەندەی دونیا ماوە بە گوێرەی ئەو بڕەی لێی تێپەڕیوە کەمە، بۆ نمونە: ئەگەر یەکێك قەرزارت بوو، تۆ ماوەیەکی درێژت بۆی دانا تا قەرزەکەت بداتەوە، بۆ نمونە پەنجا ساڵت مۆلەت پێدا، ئەگەر چل و پێنج ساڵ تێپەڕی ئەوا کاتی قەرز دانەوەکە نزیك دەبێ بە گوێرەی ئەو کاتەی دیاریکراوە بۆ دانەوەی کە پەنجا ساڵ بوو[١].

لە فەرموودە:

پێشەوا ئیبنو عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (إنما أجلكم فيمن مضى قبلكم من الأمم من صلاة العصر إلى مغرب الشمس)[٢].

واتە: وادەی ئێوە لە چاو ئەو ئومەتانەی پێش ئێوە تێگەییون لە نوێژی عەسرەوە تا ڕۆژ ئاوابوونە.

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بوونی مرۆڤ بە ڕۆژێك لە ڕۆژانی دونیادا ڕادەنوێنێ، بوونی ئومەتی ئیسلام لە کاتی عەسری ئەو ڕۆژەدا دەستی پێکردووە، جا کاتی تێپەڕیوو لە تەمەنی بوونی مرۆڤ بە گوێرەی ئەو ڕۆژە لە بەرەبەیان تا کاتی عەسرەو ئەوەندەی لە تەمەنی زەمەنیشدا ماوە تا ڕۆژی دوایی، وەکو نێوانی عەسرو ڕۆژ ئاوابوونە، دەقەکانیش بە ڕاشکاوی ڕادەگەینن، کە ئێمە دوایین ئومەتین لە بووندا و کۆتایی بوونی ئەم ئومەتەش بە هاتنی ڕۆژی دوایی دەبێت[٣].

---

(١) القيامة الكبرى، عمر بن سليمان بن عبد الله الأشقر (لا ١٧)

(٢) صحيح البخاري، (٦/ ٤٩٥) كتاب: مواقيت الصلاة، برقم: (٥٥٧).

(٣) أشراط الساعة العلامات الصغرى والوسطى، ماهر أحمد الصوفي، لا ٨٢ .

بەشی یەکەم

شاعیری خواناس (مەحوی) دەڵێت:

خەبەردانی لە موستەقبەل قسەی چی لی بکەم تا حەشر
هەموو بەرتبقی فەرموودەی ئەوە ئەم واقیعاتانە
بەیانی شەش حەو ئیعجازی لە جوملەی سەد هەزار ئیعجاز
ئەوەی دەیکا پەشیمانە، ئەوەی نەیکا پەشیمانە

پێشەوا سەهل (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دوو ئەنگوستی خۆی درێژ کردو ئاماژەی پێکردن و ئەمجا فەرمووی: (بعثت أنا والساعة كهاتين)[1].

واتە: ڕەوانە کرانی من و ڕۆژی دوایی وەکو ئەو دوانەن کە ئاماژەی بە پەنجەی شایەدمانی و ناوەڕاست کردووە.

پێشەوا قورطبي دەڵێت: هەر بۆ خوایە نهێنی و پەنهانیەکانی ئاسمانەکان و زەوی، هاتنی ڕۆژی دواییش (بەلای خواوە) هەر وەکو چاوتروکانێك وایە، یان نزیکتر لەوەش، بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێك بە توانایە[2].

پێشەوا ئەحمەد لە عوتبەی کوری غەزوان دەگێڕتەوە دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) وتارێکی بۆ داین و سوپاس و ستایشی خوای کردو پاشان فەرمووی: (فَإِنَّ الدُّنْيَا قَدْ آذَنَتْ بِصَرْمٍ وَوَلَّتْ حَذَّاءَ، وَلَمْ يَبْقَ مِنْهَا إِلَّا صُبَابَةٌ كَصُبَابَةِ الْإِنَاءِ، يَتَصَابُّهَا صَاحِبُهَا، وَإِنَّكُمْ مُنْتَقِلُونَ مِنْهَا إِلَى دَارٍ لَا زَوَالَ لَهَا، فَانْتَقِلُوا بِخَيْرِ مَا بِحَضْرَتِكُمْ)[3].

واتە: ئیتر دونیا نێزیکی پچڕان بووەو پێی لێ هەڵکردوە، هەر بە قەد دوا چۆڕێکی ماوە کە خاوەنەکەی لە قاپێکی بکات، ئێوەش بێگومان تێیدا دەگوازرێنەوە بۆ خانەیەکی نەبڕاوەو لە بن نەهاتوو، جا بە چاکترین کردەوە لێوەی بگوازنەوە.

---

(١) صحيح البخاري، (٧/ ٥٣) كتاب: الرقاق، باب: قول النبي (ﷺ) (بعثت أنا والساعة كهاتين)، برقم: (٥٣٠١).

(٢) جامع لأحكام القرآن، القرطبي (١٦/ ٣).

(٣) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٧٨) كتاب: الزهد والرقاق، برقم: (٢٩٦٧).

لێرەدا پرسیارێکی بەرهەڵستکار دەهێنمەوە بۆ ئەوەی لای هەموومان ئاشکراو ڕوون بێت، لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و ڕەخنەمان لێبگرێت و بڵێت: ئێوە خەڵك دەترسێنن بە هاتنی نزیك بوونەی ڕۆژی دوایی؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێم: ئەوانەی دەڵێن: ڕۆژی دوایی زۆری ماوە ئەوانە ئیسلام وەرناگرن.. عەقیدە وەرناگرن، چونکە ئێستا لای خەڵکی ئیمان و باوەڕداری بووەتە داینەمۆیەك بۆ ئەوەی پاڵ بە ئیماندارەوە بنێت ئیش بکات، پاڵی پێوە دەنێ دونیا ئاوەدان بکاتەوە پاڵی پێوە دەنێ بە تەنگ براکەیەوە بێت، بەڵام ئەو کەسانەی کە کۆمەڵگایان بیر دەچێت، ئەو کەسانەی نیشتیمانەکەی خۆیان فەرامۆش دەکەن، ئەو کەسانەی کە واز لە لێپرسراویەتی دەهێنن، ئەبێ ئێمە بیریان بخەینەوە بە دادگایی خوای گەورە، چونکە بەوە ڕاست دەبنەوە، بەڵام ئەو کەسەی ڕێك هاتووەو شوێن پێغەمبەر(ﷺ) کەوتووە، ئەوە لە ئاگری دۆزەخ ناترسێ، ئەوە ئارەزوو دەکات کە ئەو ژووانە زوو کۆتایی بێت، ئارەزوو دەکات کە زوو زەنگی تاقیکردنەوە لێ بدرێت تا وەکو زوو بڕوانامەکەی وەربگرێتەوە.



### لە زانستی سەردەم:

بێباوەڕەکان باوەڕایان وایە کە ئەم بونەوەرە لە خۆیەوە دروست بووەو هەر دەمێنێ و کۆتایی پێ نایەت بەڵام قورئان نەفی لە بیروباوەڕەکەیان دەکات و قسەکانیان بە درۆ دەخاتەوە، دەبێ ڕۆژێك بێت ئەم بونەوەرە کۆتایی پێ بێت و کەس نەمێنێت جگە لە خوا.

زانستی سەردەم شایەتی ئەوە دەدات کە هیچ شتێك بەئەندازەی هاتنی ڕۆژی دوایی نزیك نیە، وە هەر جارێك کە زاناکان هەقیقەتی زانستی نویّ ڕوون دەکەنەوە، ئەوە دووپات دەکەنەوە کە بونەوەر لە ماوەیەکی نزیك کۆتایی دێت..

گۆڤاری (نیوزویك)ی ئەمریکی کە باس لە زانست و ڕۆژی دوایی دەکات و دەڵێت: زانستی وشکی فیزیا و فەلەك و جیۆلۆجی هەر ئەوە نیە خەفەتمان بدەنێ، بەڵکو

ئەوەندە پێشکەوتوون بە بەڵگەوە تەحەددامان دەکەن کە هیچ شتێك بە ئەندازەی هاتنی ڕۆژی دوایی نزیك نیە[١].

دکتۆر (دۆناڵد ڕۆبرت کار) مامۆستای کیمیای جیۆلۆجی و پسپۆر لە دیاریکردنی تەمەنی جیۆلۆجی بە هۆی تیشکە سروشتیەکانەوە دەڵێت: ئێستا چەند ڕێگایەکی جیاواز بەکار دەهێنرێ بۆ دیاریکردنی تەمەنی زەوی، کە ئەنجامەکانیان لە یەکەوە نزیکن و بە ( ٥ ) ملیۆن ساڵ مەزەندە دەکرێ، جا لەبەر ئەوە بوونەوەر ئەزەلی نیەو سەرەتایەکی هەیە[٢].

زانای فەلەکی (برایان مارسدن) لە بنکەی (هارفارد سمثونیان) بۆ فیزیایی فەلەکی حیسابێکی کردووە کە لە (١٤)ی أغسطس لە ساڵی (٢١٢٦) میلادی جارێکی تر لا دەدات و بە هۆی تەقینەوەکانی سەر ڕووکەیەوە لە ڕێڕەوە نەگۆڕەکەی خۆی لایداوەو ڕەنگە بەر زەوی بکەوێ کە ڕۆژی دوایی دێ و ڕەنگە نەوەی مناڵەکانی ئەمرۆ ئەو ڕۆژە سامناکە ببینن[٣].

دکتۆر (جۆن کلیفلاند کوثران) سەرۆکی بەشی زانستی سروشتی زانکۆی (دولث) دەڵێ: (ئەم جیهانە ماددیەی ئێمە دەبێ دروست کراوبێ و بەدیهێنرابێ، لەو ڕۆژەوە دروست کراوە لە سەر یاساو بەرنامەیەکی تایبەت بەڕێوە دەچێت، کە بە هیچ جۆرێك ڕێککەوتی تێدا نیە، جا کە ئەم بوونەوەرە خۆی بەدی نەهێنابێ، کەواتە پەروەردگارێك بەدی هێناوە، کە بە دەسەڵات و زاناو بە توانایە، ڕۆژێك دێت کۆتایی پێ دێت، ئەمەش لەماوەیەکی نزیك)[٤].

لێژنەی وزەی ئەتۆمی ڕایگەیاند کە دکتۆر (ئیرنست لورنس) گەیشتۆتە دۆزینەوەیەکی ترسناك ئەویش ئەوەیە کەوا (کەهارب) پەیدابووە لە نەژادی

---

(١) آيات الله المبصرة، أ. د. توفيق علوان، لا ١١٢.

(٢) سەرچاوەی پێشوو..

(٣) سەرچاوەی پێشوو.

(٤) سەرچاوەی پێشوو لا ١١٤.

پرۆتۆن بەڵام لە جۆری سالب (-) لە چینەکان سەرەوەی بەرگە هەوا، ئەمەش دژی سروشتەو مەترسیەکی وای هەیە کەوا ئەقڵی ئادەمیزاد پێشبینی ناکات[١].

زانای فەلەکناس (کلارك چابمن) کە لێکۆڵەرەوەیە لە دەستەی جیهانی بۆ جێبەجێ کردنی جیهانی.. لە شاری تویکسۆن لە ئەریزۆنا دەڵێت: هەرەشەو مەترسی گەورە لەسەر جیهانەکەمان هەیە لەناوچەی دوورەوە، لە دوای ئەستێرەی بلۆتۆوە هەوری (اوتر) هەیە کە پێك هاتووە لە بەردی گەورە گەورەو غازی بەستووخۆڵ، کە لە سەد ساڵێکدا جارێك بەرەو زەوی دێن بەهۆی جازبیەتەوە، گەرمی خۆر غازە بەستووەکەی دەکات بە هەڵم و کلکی بۆ دروست دەبێت و ڕووەکەشی دەتەقێتەوە بە دەرچوونی غازو غوبار لێوەی، کە ئەوانیش (٢٠٠) دانە دەبن.. بەڕاستی مەترسی گەورە ڕوودەکاتە جیهانەکەمان کە ئێمە نایبینین و ڕەنگە هەستیشی پێ نەکەین تا تەواو دێتە سەرمان[٢].

(ئەدوارد کلارك) زانای بواری فەلەکناسی و نوسەری چیرۆکە زانستیەکان لە بەریتانیا، بانگگەشەیەکی تەواوی زانایانی جیهان دەکات کەوا بیر لەوە بکەنەوە، کە ئەستێرەیەکی بچوك لە داهاتویەکی نزیکدا خۆی بەزەویدا بکێشێ و ژیانی تێدا ژێرو ژوور بکات، چونکە کاتێ دەڵێین: ئەستێرەی بچوك مەبەستمان پێی قەوارەی تۆپێکی پێ یان باڵۆنێکی غازی نیە، بەڵکو پێ چواندنەکە لەگەڵ زەوی دایە کە پێ دەچێ کەمێك لە زەوی بچوکتر بێت، ئەو زانایە دەڵێ: لە حاڵەتی پێ بەرکەوتندا بەلای کەمەوە لایەکی زەوی بە دەشت و شاخ و دۆڵیەوە دەبێتە تەپوتۆز، هەرچی ڕەونەق و جوانی زەوی هەیە لەگەڵ تۆزو گەردو خۆڵی ئەو تەقینەوەیەدا تێکەڵاو دەبێ و حەشرێکی سەیر هەڵدەستێ، لاکەی تری زەوی توشی بومەلەرزەیەکی وەها دەبێ، هەرچی دامو دەزگاو کۆشك و تەلارو بیناسازی هەیە، شەق شەق دەبن، کەڵکی ژیانیان تێدا نامێنێ[٣].

---

(١) آيات الله المبصرة، أ. د. توفيق علوان، لا ١١٢.

(٢) سەرچاوەی پێشوو..

(٣) آيات الله المبصرة، أ. د. توفيق علوان، لا ١١٤.

بۆیە لەناوچوونی گەردوون لەسەر ئەندازەی بارستایی ڕاوەستاوە، جا ئەم بارستاییە چەند گەورەتر بێت، ئەوەندە درەنگتر لەناو دەچێت، وە زانایان دەڵێن: ئێستا بارستایی گەردوون زۆر زۆر بچووك بۆتەوە، واتە: هێندەی نەماوە کۆتایی بونەوەر بێتە دی.. وە گەورەبوونی جەمسەری ئۆزۆن کە چینێکە زەوی دەپارێزێ لە لەناوچوون نزیکە، زانایان دەڵێن: کونێکی زۆر گەورە دروست بووە لە چینی ئۆزۆن[1] کە خەریکە دونیا بەرەو کۆتایی ببات.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ]. واتە: کاتێ ئاسمان کەرت بوو.

لە ئایەتێکی تر باس لە کونبوونی چینی ئۆزۆن و پیسبوونی ژینگەو ڕوودانی کارەساتی گەورەو کۆتایی ژیانی سەر زەوی دەکات و دەفەرموێ: [فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ].

زاناکان لەو باوەڕەدان کە سەردەمی کۆن خڕۆکەی زەوی گەرمبووە، ئاو لەسەر ڕووەکەی نەبووە بەڵکو هەڵمی ئاو لە ئاسمانەکەی زۆر بووە، تیشکی سەرووی بنەوشەیی گەردیلەکانی هەڵمەکەی لە یەکتر ترازاندووەو کردوونی بە هایدرۆجین و ئۆکسجین، هایدرۆجینەکە سووکە چونکە هەورازە، بەڵام ئۆکسجینەکە هاتۆتە سەر زەوی و ئاسمانەکەی، سەرەنجام ژیان لەسەر زەوی پەیدابووە، ئێستا بەهۆی کونبوونی چینی ئۆزۆن کە بەرەبەرە لەبەر پیسبوونی ژینگە زیاد دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی هاتنی هەمان تیشك لە ڕێژەی زۆر بۆ سەر زەوی، ئەمەش وا دەکات بەخێرایەکی زۆر ئاو لەسەر زەوی ببێتە هەڵم و باران نەبارێ[2].

مەترسی کونبوونی ئەو چینە چەند وڵاتێکی گەیاندە ئەو باوەڕەی کە ڕێککەوتننامەیەك بۆ ڕێگەگرتن لە کونبوونی ئەو چینە مۆر بکەن، بۆیە ڕێککەوتنامەی (مۆنتریال) دامەزراوەو (١٩٣) وڵات تێیدا ئەندامن.

---

(١) چینی ئۆزۆن یەکێکە لەو چینانەی کە دەوری گۆی زەوی داوە بۆ پاراستنی کاریگەری تیشکی خۆر، کاتێك تیشکی خۆر لە زەوی دەدات، ئەو چینە بەشێك لە تیشکی خۆر دەمژێت، چونکە گەیشتنی تیشکی خۆر بۆ سەر زەوی بەڕێژەیەکی زۆر کاریگەری لەسەر پێستی مرۆڤ دەبێ..

(٢) گۆڤاری خاك، باپیرمان چۆن پێی گرتوە، ژ (٥٠)/ ٢٠٠١ لا٤١-٤٣، ئاوات ع.

پرۆفیسۆر (پاول دیفیز) لە پێشانگای کتێبی کە لەم دواییەدا بەشێوەی زنجیرە ئەڵقە لە چەند لاپەڕەیەکدا بڵاوکرایەوە دەڵێت: ئێستا لە توانای زانایاندا هەیە تەمەنی هەر ئەستێرەیەك و پاشکۆیەك دیاری بکەن بەهۆی پێوانی کردارەکانی فیزیاویی کە لەناویاندا ڕوودەدات، وەك پێوستی بە سوتەمەنی ناوەوەو ئەو وزەیەی کە دەریدەپەڕێنێ بۆ ئاسمانی دەرەوە، تازە ڕوون بۆتەوە کە ڕێژەی ون بوون پەیوەستی هەیە بە پەیوەندی کارۆموگناتیسی لەگەڵ هێزی ڕاکێشانی زەوی[1].

وە پاش هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی[2]، ئەم شەڕەی کە چەکی نەوەوی تیایدا بەکارهێنرا، ئەم چەکانەی کە هەموو جیهانی وێران کرد، بە تایبەتی ئەو وڵاتانەی کە چەکی ناوەکیان هەیەو بڕیاریان بە دەستە، هەر شەڕێك چەکی نەوەوی تیایدا بەکارهێنرا ئەوا سەردەکێشێت بۆ لەناوچوون و کۆتایی هاتنی ژیانی مرڤایەتی..

---

(١) آيات الله المبصرة، أ. د. توفيق علوان، لا ١١١.

(٢) بۆیە پێی دەوترێت جیهانی کۆتایی، ئەم جیهانە خاوەنی ماکی شەرمەزاری دوو جەنگی جیهانی و کۆمەڵکوژی و تەکنەلۆژیایە، لەسەرەتای دروست بوونیەوە تا کۆتاییەکەشی هەر شەڕو تاریکی بوو، دوو جەنگی کاوڵکاری تیایدا ڕوویداوەو جەنگی سێیەم و چوارەمیشی بەڕێوەیە، من بۆ تەمەنی شارستانیەتی مرۆڤ گەشبین نیم و تەنها ماوەیەکی کەمی ماوەو لەوەی کە ئێستاش هەیە، کاتی زیاتری نەماوە بۆ زیاتر پێشکەوتنی، بۆیە من وای بۆ دەچم لە کۆتایی نیوەی دووەمی سەدەی بیست و دوو و بیست و سێدا شارستانیەتیەکەمان بەم شێوەیە بمێنێت، ئەگەر بە یەکجاری کۆتایی پێ نەیەت، ئەوا بە یەکجاری لە سەرانسەری جیهان کەم دەبێتەوەو ژمارەی زانایان زۆر کەم دەبێت، بەڵام هەرچەندە نیوەی دووەمی سەدەی بیست و یەکیشە سەرەتای کاوڵکاریە سروشتیەکان دەبێت، بۆیە بە گومانم کە ١٥٪ ی دانیشتوانی زەوی بۆ سەرەتای نیوەی یەکەمی سەدەی بیست و دوو و بیست و سێ بە کاوڵکاریە سروشتیەکان لەناو بچن، جا بە هەر چ جۆرێك بێت لە لافاو و بومەلەرزەو کەم بوونی خۆراك و.. هتد، ئەمەش هۆیەکەی بە هۆی کەم بوونی ڕێژەی باران بارینە بە زیاتر لە ٣٠٪ گرکانەکان و ڤایرۆسی جیاجیاو ... هتد، ئەگەری ئەوەش هەیە کە جەنگی سێیەمی جیهانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکدا ببێت و ڕوویدات، ئەم جەنگەش کۆتایی بە زۆر شت دێنێت و ڕێگاش بۆ ئەوە خۆش دەکات کە جەنگی چوارەمی جیهانی بە شمشێرو دارو بەرد ئەنجام بدرێت.

بەرگی یەکەم

چەندان ڕووداوی کەونی هەن کە دەبنە هۆکار بۆ لەناوچوونی ژیان، چونکە هەر گۆڕانێکی جەوهەری ئەگەر لە ناوەڕۆکی ماددەکان ڕوویدات، لەسەر ئاستی وزە ئەوا وزەی خۆر زیاد دەبێت یان کەم دەبێت، زیادبوونی وزەش سەردەکێشێت بۆ کاریگەریەکی زۆر لەسەر گیانلەبەرەکان، جا وزەی خۆر ئەگەر زیادو کەم بکات ئەوا کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر زەوی، بۆ نمونە: ئەگەر پلەی گەرمی سەر زەوی زیاد بکات بە هۆی زیادبوونی ئەو وزەیەی کە لە خۆر دێت، یان بەهۆی مەداری زەوی کە لە دەوری خۆر دەسوڕێ نزیك بێتەوەو تێك بچێت و بگۆڕێت، ئەوا هەموو مرۆڤ و گیانلەبەرو گژوگیا لەناو دەچێت و ژیان لەسەر ڕووی زەوی نامێنێت[1].

تەنانەت لە ڕووی زانستیشەوە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ئاو هەمووی دەبێتە بوخار بەمەرجێ پێش ئەوەی بگاتە پلەی گەرمی، وە نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە ژیان لەسەر هەسارەی زەوی هەیەو لەسەر هەسارەکانی تر نیە، چونکە هەسارەکانی تر یان لە ڕۆژ دوورن یان نزیکن بەڵام هەرچەندە زەویە وانیە بەڵکو ناوەڕاستە نە لە خۆر دوورە نە لەخۆریش نزیکە، ئەمەش ئەگەر خوای پەروەردگار نەبێت کەسی تر نیە چاودێری ئەم دیاردە جوانە بکات.

ڕۆژێك دێت خۆر دەبێتە ئەستێرەیەکی سروشتی وەکو ئەستێرەکانی تری لێدێت، ئەو خۆرەی ئێمە دەیبینین، هاوشێوەی وەکو ئەستێرەکانی ترە، بەڵام ئێمە بە گەورەیی دەیبینین، چونکە لە ئێمە نزیکە، کەچی ئەو خۆرە زۆر زۆر لە ئەستێرەکانی تر نزیکترە.

زاناکان دەڵێن: نزیکە تەقینەوەیەکی زۆر لە ناو خۆر ڕوویدات، ئەمەش دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە هیچ شتێك لەسەر ڕووی ئەو زەویە نەمێنێت لە ژیان و ئاو شارستانیەت و.. هتد، هەبوونی ژیانیش لەسەر زەوی مرۆڤ و ژیانلەبەرو رووەکە، بۆیە ڕۆژێك لە ڕۆژان زوو بێت یان درەنگ ئەم بونەوەرە لەناو دەچێت، دەتوانین ئەم ڕۆژەش ناوی لێبنێین (یوم الفناء)، یان هەر ناوێکی تر، جا

---

(١) آيات الله المبصرة، أ. د. توفيق علوان، لا ١١١.

ئەم ناوە لای تۆ جێگای خۆشەویست بێت، یان جێگای ترس بێت وەکو (قیام الساعة) واتە: هاتنی ڕۆژی دوایی، یان هەر زاراوەیەك بێت کەوا مەبەست لە هاتنی ڕۆژی دوایی بگەیەنێت، جا ئەم زاراوانە هەموویان بریتین لەو کاتانەی کە هیچ مرۆڤ و ژیانلەبەرو ڕووەکێك بوونیان نامێنێت لەسەر ڕووی زەوی.

ڕوودانی هاتنی ڕۆژی دوایی لەلایەن هەموو زانایان و ئایینەکانەوە ناونراوە بە (القیامة) هەتا لە لای ئایینی مەسیحیەت ئەو کاتەی کە هیچ شتێك لەسەر ڕووی زەوی نامێنێت و لەناو دەچێت پێی دەڵێن: (قیام الساعة).

قورئان لە وەسفی جیا جیا باس لە هاتنی ڕۆژی دوایی دەکات، بەڵام لە توێژینەوەکان بە دەردەکەوێت ئەو وەسفە جیا جیایانەی باس کراوە بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی لە قورئاندا هەموویان یەك واتا دەگەیەنن وەکو (الصاخة، الحاقة، القارعة، الواقعة، الطامة. .. هتد)، جا ئەم ناوانەو وەسفانەی قورئان پێچەوانەی یەکتری نین، ئەگەر پێچەوانەی یەکتری بووایە ئەوا هەر ڕووداوێك بە شێوازێك ڕووی دەدا، بەڵام ئەو وەسفانەو ناوانە دژی یەکتری نین، بەڵکو چەند قۆناغێکی جیاجیانە لەو ڕووداوانەی کە پێی دەوترێت (قیام الساعة)، واتە: چەند ڕووداوێك ڕوودەدات لە یەك کاتدا، جا لەناوچوونەکە دەست پێدەکات، بەڵام بۆ دیاریکردنی هەر جێگایەك یان هەر ڕووداوێك لە کەون، کە ڕوویدات چوار ڕووداو هەیە، سێیان بە پێی شوێنە یەکێکیشیان بە پێی کاتە بۆ ئەوەی جێگای ڕووداوەکە دیاری بکرێت[1].

کۆتایی بونەوەر ڕووداوێکە کە لە داهاتوو ڕوودەدات، ئەمەشیان دەتوانین لەچوار لایەن و کەناڵ توێژینەوەی لەسەر بکەین:

١- کەناڵی لێکۆڵینەوەی زانستی فیزیا (الفیزیا).

٢- کەناڵی لێکۆڵینەوەی زانستی ئەستێرەکان (النجوم).

---

(١) الإيمان مجلة العلم والإيمان: العدد: ٣٦، قيام الساعة بين القرآن والعلم، بقلم الدكتور عبدالقادر جليل محمد. وەرگێردراوە بە دەستکاریەوە.

٣- کەناڵی لێکۆڵینەوەی زانستی بوونەوەر (کوسمولوجی).
٤- کەناڵی لێکۆڵینەوەی زانستی زەوی (جیۆلۆجی).

زانستی بونەوەرو فیزیا ئیشارەت بۆ ئەوە دەکەن، کە یەکەمجار بوونەوەر تەقینەوەیەکی گەورەی تووش هاتووە، ئەمەش قورئان دووپاتی دەکاتەوە کە دەفەرموێ: [أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾].

واتە: ئایا ئەوانەی بێباوەڕ بوون نەیان بینووەو بۆیان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە بوون لەوەودوا لێکمان جیاکردەوە، لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟

زۆربەی بیردۆزە پێشنیارکراوەکان بۆ لێکدانەوەی گەشەی گەردوون لەلایان زانایانی ئەمڕۆ پەسند بێت بریتیە لە (بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە) ئەمەش بە سوود وەرگرتن لە گەورەترین توانای بەڵە هەستیەکان لەوەش فرەوانبوونی گەردوون و بوونی پلەی گەرمی جێگیر لە لایەکانی بەشی هەست پێ کراوی گەردوون و وێنەگرتنی پاشماوەی دوکەڵی بەرهەم هاتوو لە کرداری تەقینەوە گەورەکە لە لایەکانی ئەو بەشە هەست پێکراوەی گەردوون[1]..

لە کۆتاییشدا بەچڕبوونەوەیەکی گەورە کۆتایی دێت، کە یەکەمجار چۆن بووە لە کۆتاییشدا ئاوای لێدێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ].

واتە: ئەو ڕۆژەی کە ئاسمان وەکو پەڕەیەکی نووسراوەکان دەپێچینەوە، وەکو یەکەمجار دەستمان پێی کردەوە دەیگێڕینەوە، پەیمانمان داوە کە ئێمە کردوومانەو

---

(١) الإيمان مجلة العلم والإيمان: العدد: ٣٦، قيام الساعة بين القرآن والعلم، بقلم الدكتور عبدالقادر جليل محمد. وەرگێردراوە بە دەستکاریەوە.

ئێمە دروستی دەکەینەوە، یان بە واتایەکی تر بڵێین: ئێمە دروستمان کردووەو لەناوی دەبەین و دروستی دەکەینەوە.

قورئانیش دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە جارێکی تریش تەقینەوەیەکی گەورە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی ڕوودەدات.

یەکێکی تر لەم کەناڵانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بوونەوەر لەناو دەچێت ئەویش (إحساس العام)ە، واتە: هەستکردن لە نێوان خەڵك و مرۆڤ، هەموومان دەبینین مرۆڤ چۆن لە دایك دەبێت، پاشان پیر دەبێت، پاشان دەمرێ و لەناو دەچێت، جا هەموو شتەکانی سەر ڕووی زەوی لە مرۆڤ و ژیانلەبەرو ڕووەکەوە لە ڕێگای توێژینەوەی گەردوون لە پێش چاوی خۆمان دەبینین، مرۆڤ دەمرێت و لەناو دەچێت، بۆیە ئەگەر توێژینەوەیەك لەسەر بوونەوەر بکەین، دەبینین کە هەندێ شارستانی هەبووە، کە چەند سەد ساڵ حوکمی کردووەو پاشان لەناوچووە، هەر چەندە ئەم شتانە بەچاوی خۆمان نەمانبینیوە بەڵام لە مێژوودا بۆمان باس کراوە، هەندێك جێگا هەن، تەنها چەند شوێنەوارێکی لێماوە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان شارستانیەتێك بووە[1].

پێش ئەم دوو کەناڵانەی کە باسمان کرد، کەناڵی زانستی و کەناڵی هەستی مرۆڤایەتی، کەناڵێکی تریشمان هەیە، ئەویش کەناڵی ئاینەکان و هاتنی نیگای پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت)، بۆیە تایبەتمەندی و پسپۆڕیەتی یەکێکە لە یاساکانی ئەم بوونەوەرە، خوای پەروەردگار ئامادەباشی مرۆڤایەتی دابەش کردووە بە پێی ئەو پسپۆڕیەی خزمەت بکات، بۆ نمونە: هەندێك خەڵك دەبینین لە فیترەتەوە وا دروست کراون کە دەتوانن شیعر بنوسن و بڵێن، هەندێکی تر خوای گەورە وای دروست کردوون ببن بە پزیشکێکی باش، یان کەسانی تایبەتمەند لەوانەیە کۆمەڵە توانایەکی هەبێت کەسێکی تر نەیبێت،

---

(١) بۆ نموونە: کیشوەرێك هەیە کە کیشوەری (ئەطلەنتی) پێ دەڵێن: کە پێشتر کیشوەرێك بووە بەڵام نوقمی ژێر ئاو و زەوی بووە، چونکە هەندێك پاشماوەیان دۆزیوەتەوە لە دەریای (ئەطلەنتی) زاناکان دەڵێن: پێشتر کیشوەرێك هەبووە بێجگە لە کیشوەری ئاسیاو ئەفەریقیاو ئەوڕوپا پێیان دەگوت: کیشوەری (ئەطلەنتی)، یان پاشماوەی بابلی کە هی ئاشوریەکان بوو.

وەکو مامۆستایەتی و ئەندازیاری.. هتد، یان کۆمەڵێکی تریش هەڵبژێردراون بۆ ئەوەی ببنە پێشەوای خەڵك، یان پێغەمبەرایەتی شتێکی نادیارەو بەهەموو کەس نەدراوە، بەڵام ئەو کەسانەی تایبەتمەندن دەتوانن شتێك بکەن کەوا مرۆڤ لەو توانایەی دا نەبێت، هەر چەندە ئەوانەی خواپەرست و زانان لە ئاین ژمارەیان زۆرە، بەڵام هەرچی پێغەمبەرایەتیە شتێکی تایبەتمەندە.

ئەو سێ کەناڵانەی پێشتر باسمان کرد بریتی بوون لە کەناڵی زانست و کەناڵی هەستی مرۆڤ و، کەناڵی ئایینەکان و نیگاو پێغەمبەران، ئەم سێ کەناڵە جەختیان لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە کۆتایی هاتنی ژیانی سەر زەوی زۆر زۆر نزیکە، بەڵام کۆتایی هاتنی ئەم بوونەوەرە هەریەکەو بەپێی پلەی خۆیەتی، بۆیە جیاوازی هەیە لەسەر ئەو زانیاریانەی کەوا دەیدەن.

ئەو هەستە ناوەکیەی کە لە مرۆڤدا هەیە و هەموو کەسێك هەستی پێ دەکات، هەر مرۆڤێك عەقڵێکی تەواوی هەبێت ئەوا دەتوانێ هەستی پێ بکات چونکە ئەو کەناڵە ناوەکیە ئەو هەستەی دەداتێ کە ڕۆژێك لە ڕۆژان کۆتایی بەم بونەوەرە دێت[1].

کەناڵی یەکەم کە کەناڵی زانستی فیزیایی و ئەستێرەناسەکانە کراوەیە، لەوانەیە هەندێك مرۆڤ پەی پێ ببات لە وشەکانم، هەندێکیش پەی پێ نابات لە ڕووی کردەوەی زانستی، بۆیە هەموو خەڵك ناتوانێ لەم هەموو قسانەی کە پێشتر ئاماژەم پێی کرد پەی پێ ببات، چونکە ئەوە زانستەو ئەوانەی زانستیان پێیە کۆمەڵێکی زۆر لە خەڵکی شوێن کەوتەی وان دەبن و ئەمجا تێدەگەن و ئەو هەستەیان بۆ دروست دەبێت، ئەوانەی بە دوای ئەو کۆمەڵە کەوتوونە تەنها ئەو کەسانەن کە زانستیان لایە بەڵام ئەوانەی کە خۆیان فێرناکەن و بە دوای زانستدا ناگەڕێن، ئەوانە ئەگەر زانستی فیزیاییشیان بۆ باس بکەیت، ئەوا لێی تێناگەن، بۆیە زانایان هەرچی بڵێن دەبارەی زانستی فیزیاو نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دەڵێن: ڕاستە.

ئایا لەناوچوونی مرۆڤ و هاتنی ڕۆژی دوایی بە تێکچوونی زەوی دەبێت؟

---

(١) الإيمان مجلة العلم والإيمان: العدد: ٣٦.

یان بەهۆی بومەلەرزەو شەق بوون کە زەوی خۆی لەبەر ڕانەگرێت؟

یان کۆتایی هاتنی ئەم بوونەوەرە لە ئەنجامی پێککەوتنی تەنێکی ئاسمانی یان پارچە ئەستێرەیەك یا هەر شتێکی ترە کە لەزەوی بدات؟

یان بەهۆی چەند گۆڕانکاریەکە کە توشی خۆر دەبێت؟

یان هاتنی کۆتایی زەوی بەهۆی چەند بنەڕەتیەکە کە لە ڕەگ و ڕیشەوە ئەو گۆڕانکاریانە ڕوودەدات توشی ئەستێرەکانی ئەو فەلەکیە دەبێت کە (درب التبانه) ی پێ دەڵێن؟ یان کۆتایی هاتنی ئەم بوونەوەرە بە هۆی لەناوچوونی ئەستێرەکانە؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارانە بە پێی ئەو هەموو گۆڕانکاریانەی کە زاناکان تێبینیان کردووە کە توشی ئەستێرەکانی تر دەبن لەبونەوەر، ئەمەش بۆ پاراستنی ووزەو ماددەیە، زاناکان دووپاتی دەکەنەوە کە ئەم خۆرەی لەسەر ئێمەوەیە ڕۆژێك دێت نامێنێت و کۆتایی دێت، پاش ئەوەی کە سووتەمەنی نەوەیەکەی نامێنێت، ئەگەر سەرچاوەیەکی تر نەبێت وزەی بداتێ وزەی خۆی هیچ نامێنێت.

هەندێك لە زانایانی تر دەڵێن: لەناوچوونی مرۆڤایەتی، لەسەر ڕووی زەوی بەهۆی زیلزال و بورکان و بومەلەرزەو نەخۆشیە پێش کۆتایی هاتن بە وزەی خۆر. واتە: ئەگەر وزەشی نەبڕێ پێش ئەو کاتەش لەوانەیە ئەم ڕووداوانە ڕوویدات.

هەندێکی تر دەڵێن: گەردوون هەمووی بە تێکڕایی لەناو دەچێت، هەندێکی تریش دەڵێن: گەردوون لەناو ناچێت بەڵام کۆتایی دێت.

ئەم جیاوازیانە بۆ زانینی ئەندازەی بارستایی تەنە ئاسمانیەکان و ئەستێرەکانە، جا لەناوچوونی گەردوون لەسەر ئەندازەی بارستایی ڕاوەستاوە، جا ئەم بارستاییە چەند گەورەتر بێت، ئەوەندە درەنگ تر لەناو دەچێت، بۆیە زانایان دەڵێن: ئێستا بارستایی گەردوون زۆر زۆر بچووك بۆتەوە، واتە: هێندەی نەماوە کۆتایی بونەوەر بێتە دی[1].

---

(١) الإيمان مجلة العلم والإيمان: العدد: ٣٦ .

هەندێکی تر دەڵێن: ئێستا هیچ زانست و زانیاریەکمان نیە بۆ ئەوەی بزانین پلەو پایەی بارستایی بوونەوەر لەسەر ڕووی زەوی چەندە، هەر زانایەك بە شێوەیەکی ورد لە بونەوەردا ئیعتیماد دەکاتە سەر ئەو زانیاریەی کە لەلایەتی، ئەگەر بیربکەینەوە لێرەش جیاوازی لە نێوان زانایان ڕوودەدات، چونکە پێوانەیەك نیە هەموویان یەك بۆچوونیان هەبێت، هەریەکەو پێوەرێکی خۆی هەیە، ئێمەش کە مرۆڤێکی سادەین و لە زانستی فیزیاو کیمیاو فەلەکناسیدا هیچ زانیاریەکمان نیە دەربارەی ئەم گەردوونە، هەر ئەوەندە دەتوانین بەدوای قسەی پسپۆر لە بواری فیزیاو فەلەکناسی بکەوین و قسەکانیان لێ وەربگرین، ئەگەر باوەڕ بە زانستەکان بکەین دەبێ قسەکەیان وەربگرین، کە بوونەوەر هەمووی لەناو دەچێت و نامێنێت بەڵام پێویستە پێش ئەو کاتەی کە زانستی سەردەم هاتنی کۆتایی زانستی بسەلمێنێت، ئێمە باوەڕمان بەو نیگایانە هەبێت کە خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەرانی ناردۆتە خوارەوە (سەلامی خوایان لێ بێت) لەبارەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

ئەم ڕێگایانەی کەوا بەڵگەن بۆ لەناو چوونی ئەم گەردوونە نیگای پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) بە تایبەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان محمد(ﷺ).

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا باسی دەکات و فەرمویەتی: [يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ][1].

یان ئایەتی: [يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ (٤٨) وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ][2].

هاتنی ڕۆژی دوایی بەو واتایەی کە دیاریمان کرد، پاش لەناو چوونی مرۆڤە، ئەمجا ژیان نامێنێ لەسەر ڕووی زەوی، ئەمەش ڕووداوێکەو زانایانی بڕوادارو بێ بڕوا دووپاتی ئەم شتە دەکەنەوەو هیچ جیاوازیشیان نیە، هەموو

---

(١) سورة الأنبياء، الآية : (١٠٤).

(٢) سورة إبراهيم، الآية : (٤٨ — ٤٩).

زانایانی زانستیش لەسەر ئەوە کۆکن کە ڕۆژێك دێت کۆتایی بەم بونەوەرە دێت، جا هاتنی ڕۆژی دوایی واتە: لەناوچوونی خۆرو مانگ و ئەستێرەو ئاسمانە، زانایان لەسەر ئەم قسەیە هەموویان کۆکن بەڵام ئەو زانیاریانەی کە هەیە بەس نیە بۆ ئەوەی بزانین ڕووداوەکان چۆن دەبێت، بەس چۆنیەتی لەناوچوونی تەنها خوای پەروەردگار دەزانێت، بەڵام ئەوەی کە لە ڕێگای نیگا (وەحی)یەوە بۆ پێغەمبەران هاتووە لەو ڕووداوانەی کە ڕوودەدات باشترینیان ئەوەیە کە لەسەر زمانی پێغەمبەرمان محەممەد(ﷺ) هاتووە.

ئەم ئایەتانەی کە باسکرا تەنها بۆ ئەوەیە، ئێمە بیزانین و دەری ببڕین بە شێوەیەکی بەستنەوە (مترابط) بەیەکتری، ئەم ڕووداوانەی کە ڕوودەدەن دەبێ ڕاڤەیەکی جوانی بۆ بکەین بۆ ئەوەی بگەین بە ڕاستی، ئەم ڕووداوانەش وەکو چەند ئەڵقەیەکە یەك لە دوای یەکەوە بێت، لە قورئاندا هەریەکەو بە پێی وەسفێکەوە هاتووە بۆ ئەوەی توێژینەوەی لەسەر بکەین.

جا بیربۆچوونی بەندەش ئەوەیە کە پێویستە توێژینەوەیەکی تەواوی بۆ بکەین، لە هەموو لایەکەوە، بە تایبەتی ئەو کەسانەی پسپۆڕی زانستی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرو(ﷺ) زانستی زمانی عەرەبی و فەلەکناسی و فیزیاییین، بۆ ئەوەی هەر پسپۆڕێك هەر یەکەو لە لایەنێکەوە بیروبۆچوونی خۆی دەرببڕێ [1].

پرۆفیسۆر (ئاندریا لیندی) لە کۆلێژی (ستانفوردی ئەمەریکی) لە بەشی زانستی فیزیا لەگەڵ خێزانەکەی (ریناتا کاوش) ئەوە دوویات دەکەنەوە:

کە ئەم بونەوەرەی تیایدا دەژین ڕۆژێك دێت لە فرەوانبوون دەوەستێت، ئەمەش لە ماوەیەکی نزیك ڕوودەدات.

ئەگەر مرۆڤ بە دڵێکی بینایی باوەڕی بەوە هەبێت کە خوای گەورە ئەم قورئانەی دابەزاندووەو بە گرنگی سەیری بکات و لەهەمان کاتدا ترسی خوای لە دڵدا بێت، ئەمجا دەزانێت کە هاتنی ڕۆژی دوایی چەند نزیك بۆتەوە.

---

(١) الإيمان مجلة العلم والإيمان: العدد: ٣٨، قيام الساعة بين القرآن والعلم، بقلم الدكتور عبدالقادر جليل محمد. وەرگێردراوە بە دەستکاریەوە.

# زانستی هاتنی ڕۆژی دوایی

هاتنی ڕۆژی دوایی کەس نایزانێت لە چ کاتێك بەرپا دەبێت، قورئان زۆر بە ڕاشکاوی ڕایگەیاندووە کە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی زانستێکە تایبەتە بە خوای گەورەوە، بۆیە بە کەسی ڕانەگەیاندووە، تەنانەت پێغەمبەران[1] و فریشتەکانی خوداش نایزانن کەی ڕۆژی دوایی دێت، خوای گەورە لە قورئان ئاگادارمان دەکاتەوە کە کەس هاتنی ڕۆژی دوایی نازانێت، هەروەکو دەفەرمویٚ:

[ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ][2].

واتە: ئەی (محمد) پرسیارت لیٚ دەکەن لە بارەی ڕۆژی دواییەوە کەی دەبێت؟ ئەی (محمد) تۆش پێیان بلٚیٚ: زانینی ئەو ڕۆژە تەنها لای پەروەردگارمە، هیچ کەس (ناتوانیٚ) کاتەکەی ئاشکرا بکات، جگە لەو (پەروەردگار)، (بۆیە هاتنی ڕۆژی دوایی) بۆ ئاسمانەکان و زەویش گران و قورسە، نایەت بەسەرتاندا (ڕوونادات) لە ناکاو نەبێت، لە تۆ دەپرسن وەك ئەوەی کە تۆ لە (هاتنی) ڕۆژی دوایی ئاگاداربی، ئەی ((محمد)) پێیان بلٚیٚ: بێگومان زانینی (هاتنی) ئەو ڕۆژە تەنها لای خوایە، بەلاٚم زۆرێك لە خەلٚکی نایزانن.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویٚ: [يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾][3][3].

---

(١) پێشەوا بەرزنجی لە پەرتوکەکەی (الإشاعة) بۆ ئەوە چووە کە پێغەمبەر(محمد) کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی زانیوە بەلاٚم ڕێگای پیٚ نەدراوە ئاشکرای بکات، جا ئەمە بۆچوونەو قسەیەکی بیٚ بەلٚگەیە. سەرچاوە: الإشاعة لأشراط الساعة (لا ٣).

(٢) سورة الأعراف، الآية: (١٨٧).

(٣) سورة الأحزاب، الآية: (٦٣).

واتە: ئەی (محمد)خەڵکی دەربارەی ڕۆژی دوایی پرسیارت لێ دەکەن پێیان بڵێ: بێگومان زانستەکەی لەلای خودایە، تۆ چوزانیت ڕەنگە ڕۆژی دوایی نزیك بێت.

لە ئایەتێکی تر دەفەرموێ: [يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾][1].

واتە: ئەی(محمد) لە بابەت ڕۆژی دواییەوە لێت دەپرسن کە چ کاتێ ڕوو دەدات؟ جا تۆ چیتە لە باسکردنی ئەو ڕۆژە، واتە: تۆ هیچی لێ نازانیت کەی ڕۆژی دوایی دێت، ئیتر ئەوانە بۆ گلەییت لێ دەکەن، ڕۆژی دوایی زانستەکەی لە لای خوداوە کۆتایی پێدێت و تەنها لە لای ئەوە.

دایکمان خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت:

بێباوەڕەکان دەهاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) دەیانگوت: ئەی (محمد) کەی ڕۆژی دوایی دێت؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە.

خودای گەورە ئەفەرموێ: [ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾][2].

واتە: بەڕاستی زانیاری هاتنی ڕۆژی دوایی هەر لای خودایە، جگە لە خودا کەسێکی تر نازانێت کەی ڕۆژی دوایی دێت، تەنها ئەویش باران دەبارێنێ، لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا، کەسێکی تر ناتوانێت باران ببارێنێ، ئەویش دەزانێ چی لە منداڵدانەکان دایە، واتە: هەر لەو کاتەوە خودا خۆی دەیزانێ کوڕە یان کچە، بەختیار و سەرفرازە، یان لاسار و بەدبەختە، بەژن و باڵای کورتە یان درێژە.. هتد، هەروەها هیچ کەسێك نازانێت کەوا بەیانی چی دەکات، لە چاکەو خراپە، هیچ کەسیش نازانێت لە کام شوێندا دەمرێ، چونکە

---

(١) سورة النازعات، الآية (٤٢-٤٤).

(٢) سورة لقمان، الآية: (٣٤).

بەشی یەکەم

هەر خودا زانا و ئاگادارە بە تەواوی ڕووداوەکان و گشت نهێنییەکان، زانستی ئەو (خودا) دەوری هەموو کەس و شتێکی دایەو هیچی لێ بەدەر نیە.

لەم ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێ کە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی کەس نایزانێت، تەنها خوای گەورە نەبێت، دەرکەوت کە هاتنی ڕۆژی دوایی، یەکێکە لە پێنج غەیبەکان[1]، کەس نازانێت تەنها خوای کردگار نەبێت، ئێمەی موسڵمانیش دەبێ بە دڵێکی ڕاست و دروستەوە باوەڕێکی پتەومان بە شتی پەنهان هەبێت، چونکە باوەڕ تەنها هاندەرە بۆ ژیانی ژیاری.. لە مەرجەکانی باوەڕ دەبێ باوەڕمان بە پەنهان هەبێ، کە بەشێکی لە دونیادا دێتە دی بە گوێرەی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگایە، بەڵام خوای گەورە لە نێوانی دوو ماوەدا شتێك بۆ مرۆڤ دەردەخات، دەزانێت لەو قۆناغەدا پێویستی پێیەتی، مرۆڤایەتی کە ژمارەی زۆر بوو، ئەو کاتە نەخۆشی دەیان فەوتێنیت.. خوای گەورە ڕێنموویی کەسانێکی کرد بۆ دروستکردنی مایکرۆسکۆب بۆ دۆزینەوەی میکرۆب، میکرۆبیش هۆیەکە بۆ نەخۆشی چارەسەر کرا، هەروەها هەموو ماوەیەك خوای گەورە شتێك دەردەخات، کە یارمەتی دەدات بۆ گەشە پێدان و گواستنەوە، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی بەرزتر، بەشێکی ئەو غەیبە دەرناکەوێ، تاکو ڕۆژی دوایی.. بەشێکی تر هەیە جگە لە خوا و پاشان جگە لە هەندێ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) کەسی تر نایزانێت.

پێشەوا عومەر (ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژێکیان لەلای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووم، لە ناکاو پیاوێك بە دیارکەوت، جلێکی سپی و جوانی لەبەردابوو، ڕیشێکی ڕەشی جوانی هەبوو، کەس لە ئێمە، واتە: (هاوەڵەکان) نەیاندەناسی و هیچ شوێنەواری ڕێبواریشی پێوە دیار نەبوو..

ئینجا هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت و چۆکی خۆی بە چۆکی پێغەمبەرەوە(ﷺ) نوساند، دەستەکانیشی لەسەر ڕانی داناو چەند پرسیارێکی ئاراستە کرد سەبارەت بە ئیسلام و باوەڕو ئیحسان ئاراستەی پێغەمبەری کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامی پرسیارەکانی کابرای یەك بەیەك وەڵامی دایەوە..

---

(١) غەیب: ئەو شتەیە کە هەستیارەکان هەستی پێ ناکەن ئەوە پێی ئەوترێت غەیب.

ئەمجا کابرا گوتی: ئەی (محمد) زانیاریم بدەریٚ کەی ڕۆژی دوایی دیٚت؟

پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموی: پرسیار لیٚکراو پیٚی زاناتر نیە لەوەی پرسیاری کردووە، ئەمجا دوای ئەم پرسیارە، کابرا هەندیٚ پرسیای لیٚکرد سەبارەت بە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

پیٚغەمبەریش (ﷺ) فەرموی: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، دایك دەبیٚتە خزمەت کاری کوڕو کچ، ئەگەر دیتت کەنیزەیەك[1] گەورەی خۆی لیٚبکەویٚتەوە[2] خاوەن میٚگەل لە بنیاتی تەلاران سنور بەزیٚنی بکەن و پیٚخواسی برسی باری سەر خەڵکی ببنە سەرکردە[3]، ئەوانە لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییىن، گوتیان: ئەی پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) خاوەن میٚگەل و پیٚخواسی و برسی باری سەر خەڵکی کیٚن؟ فەرموی: عەرەبن[4].

پیٚشەوا ئیبنو رەجەبی حەنبەلی (ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت): لەبارەی ئەم فەرموودەیەی جبریل (سەلامی خوای لیٚ بیٚت) دا دەڵیٚت: ئەو نیشانانەی ڕۆژی

---

(١) ئەمەش لە سەردەمی پیٚش ئیسلام و دوای ئیسلام وەکو شتو مەك مامەڵەی پیٚدەکرا بەڵام ئیسلام قۆناغ بە قۆناغ ئەم بەندایەتیەی نەهیٚشت.

(٢) لە فەرمودەکەی جبریل (سەلامی خوای لیٚ بیٚت) دا هاتووە کە دەفەرمویٚ: کەنیزەك گەورەی خۆیان لیٚ دەبیٚ و لیٚیان دەکەویٚتەوە.

زانایان دەربارەی ئەم فەرمودەیە دەفەرمون: مەبەست لەم فەرمودەیە زۆربوونی کەنیزەکانە کە منداڵیان لە گەورەو خاوەنەکانیان دەبیٚت، ئەو منداڵانە دەچنە پلەو پایەی باوکیان، دەبنە گەورەی دایکیان، چونکە ماڵی مرۆڤ بۆ منداڵیەتی و دەتوانیٚ وەکو خاوەن ماڵ هەڵسوکەوتی تیٚدا بکات و بە مۆڵەتی ڕاستەوخۆی باوکی بیٚ یان عورفی ڕاهاتن و بەکارهیٚنان.

هەندیٚکی تر دەڵیٚن: مەبەستی فەرمودەکە وایە کەنیزەك پاشایان لیٚدەکەویٚتەوە، دایك بە تیٚکڕایی ڕەعیەت دەکەویٚت و ئەم دەبیٚتە گەورەی خەڵکی و گەورەی دایکیشی.

(٣) ئەگەر پیٚخواسی ڕووت و قوت و شوانە میٚگەلان، کە نەزان و نەفام و کەللە وشك و ڕەقن، ببنە سەرپەرشتیاری خەڵکی و خاوەن ماڵ و سامانی زۆر کۆشك و تەلارو بینای مەزن بنیات بنیٚنن، بەم شیٚوەیە سیستەمی ژین و دین تیٚك دەچیٚ.

(٤) صحیح مسلم، بە ژمارە: (٨).

دوایی كە لەم فەرمودەیەدا هاتوون، ناوەڕۆكەكەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە كاروبار دەدرێتە دەست كەسانی نەشیاو و ناشایەن، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (إِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَ: إِذَا أُسْنِدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ)[1].

واتە: ئەگەر ئەمانەت ون كرا ئەوە چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بن، هاوەڵەكان گوتیان: ون كردنی ئەمانەت چۆنە؟ فەرموی: گەر كاروبار درا دەست كەسی نەشیاو چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی بە.

كاتێ كابرا ڕۆیشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەزانن ئەمە كێ بوو؟ هاوەڵەكانیش گوتیان: خوداو پێغەمبەرەكەی دەزانن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەمە جبریل بوو، هات تا لە ئیسلام شارەزاتان بكات.

یەكێ لە پرسیارەكانی جبریل ئەوە بوو كەی ڕۆژی دوایی دێت، ئەمجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نازانم.

ئەگەر جوبرائیل كەوا پلەدارترین فریشتەیە، ئەگەر پێغەمبەرمان (محمد) كە پایەدارترین مرۆڤە لەسەر ڕووی زەوی نەزانێت كەی ڕۆژی دوایی دێت، جا من و تۆ دەزانین ـ بە دڵنیاییەوە نا؟

پێشەوا ئیبنو قەییم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمویەتی: بێگومان لەوانەی بانگەشەی زانست دەكەن بە ئاشكراو درۆ برەو پێدەدەن لەم سەردەمەی ئێمەدا، كەوا پێغەمبەر(ﷺ) دەیزانی كەی ڕۆژی دوایی دێت، جا كاتێ پێی گوترا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پرسیار لێكراو زاناتر نیە لە پرسیاركار! جا واتاكەی دەگۆڕن و دەڵێن: واتای من و تۆ دەزانین.

پێشەوا عەبدوڵلای كوری مەسعود (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

---

(١) صحيح البخاري، (٨/ ١٠٤) باب: رفع الأمانة، بهژماره: (٦٤٩٦).

لە شەوی میعراج گەیشتمە ئیبراهیم و موساو عیسا، جا باسی کارەکانی ڕۆژی دوایی کراو کارەکەیان گەڕاندەوە لای ئیبراهیم ..

جا دەفەرموێ: من هیچ زانستم دەربارەی نیە ..

جا کارەکەیان گەڕاندەوە لای موسا..

ئەویش گوتی: من هیچ زانستێکم لەم بارەوە نیە..

جا کارەکەیان گەڕاندەوە لای عیسا ..

ئەویش گوتی: هاتنی بە یەکجاری و کاتی دیاری کراوی کەس نازانێ تەنیا خوا نەبێ، بەڵام ئەوەی کە خوای گەورە بەمنی سپاردووە ئەوەیە کە دەجال دەردەچێ بۆ خەڵك، دوو خەنجەری تیژم لایە جا کاتێ کە دەم بینێ لە ترسان دەتوێتەوە هەروەك چۆن مس دەتوێتەوە جا خوای گەورە لەناوی دەبات[1].

پێویستە ئێمەش خۆمان هەڵماڵین و خۆمان چالاك بکەین بۆ کردەوەی چاکە بە تایبەتی خۆشەویستی خوداو پێغەمبەر(ﷺ).

پێشەوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێت:

پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کەی ڕۆژی دوایی دێت؟

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی: (وَمَاذَا أَعْدَدْتَ لَهَا، قَالَ: لاَ شَيْءَ، إِلَّا أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ (ﷺ)، فَقَالَ: أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)[2].

واتە: چیت بۆ ئەو ڕۆژە ئامادەکردووە..

گوتی هیچ شتێك: تەنها خۆشویستی خواو پێغەمبەرم(بۆ ئامادە کردووە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: تۆ لەگەڵ ئەوانەی کە خۆشت دەوێن.

---

(١) ضعيف: رواه الإمام أحمد في (المسند)، بەژمارە: (٣٥٥٦)، وضعفه الألباني في ضعيف الجامع الصغير (٥/ ٢٠) بەژمارە: (٤٧١٢).

(٢) صحيح البخاري، (٥/ ١٢) باب: مناقب عمر بن الخطاب، بەژمارە: (٣٦٨٨).

پێشەوا ئەنەس(ﷺ) دەڵێت:

هیچ شتێك نەبوو هێندەی ئەو فەرموودەیە خۆشحاڵم بکات، هەرچەندە کردەوەشم وەکو پێغەمبەرو(ﷺ) ئەبوبەکرو عومەر نیە، بەڵام ئەوانم خۆش دەوێت، ئومێد دەکەم حەشریشم لەگەڵ ئەوان بێت.

ئەوەی گرنگە بۆ ئێمەی مرۆڤ ئیش و کار کردنەو خۆئامادەکردنە بۆ ئەم ڕۆژە بە خۆشویستنی خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ)، نەك زانینی کاتی هاتنی.

**لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: دانایی لە شاردنەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی چیە؟**

لە وەڵامی ئەو پرسیارە: شاردنەوەی پەیوەستە بە چاکبوونی دەروونی مرۆڤ و ئەو ڕووداوە مەزنەی مرۆڤ دەبێ یەقینی بە وەدی هاتنی هەبێ، بەڵام نەزانێ کەی لە ناکاو دەیگاتێ و لێی دێتە مەیدان، ئەمەش وا لە مرۆڤ دەکات بەردەوام چاوەڕوانی هاتنی ڕۆژی دوایی بێت.

پێشەوا سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی پەنهان و شاردنەوەی ڕۆژی دوایی دەفەرموێت:

نادیار ڕەگەزێکی بنەڕەتە لە ژیانی مرۆڤ و لە پێکهاتەی دەروونیان، بۆیە هەمیشە پێویستە نادیارێك هەبێ چاوی تێببڕن، ئەگەر مرۆڤ هەموو شتێکی لەلا دیارو ئاشکرا با، ئەوا چالاکیان دەوەستاو ژیانیان بۆگەنی دەبوو، جا مرۆڤ بەدوای نادیار ڕادەکەن، بۆیە ئاگایان لە خۆ دەبێت و دڵ و هەستیان بەو کاتە نادیارە پەیوەست دەبێ و لە بێئاگایی دەیانپارێزێ، چونکە ئەوانە نازانن کەی ڕۆژی دوایی دێت، جا بەردەوام لەم ژوانگەیەدان و خۆیان بۆ ئامادە دەکەن، ئەوەش بۆ کەسانێکە کە فیترەیان دروست و ڕاست بێت[1].

باشە توێژینەوەی ئەم بابەتە گریمان کە لە ساڵێکی دیاریکراو ڕوودەدات، ئەوانەی ملیان بەم قسەیە ناوە، ناکۆکن لەگەڵ بەرنامەی قورئان و پەیڕەوی

---

(١) في ظلال، سيد قطب، واليوم الآخرة، لا ٨٩.

پێغەمبەر (ﷺ)، پێویستە خەلك واز لە توێژینەوەی ئەم بابەتە بهێنن، چونکە کاتەکەی بەس لای خودایەو کەس نایزانێت.

ئەوانەی لەم بوارەدا دەکۆڵنەوە، وا گومان دەبەن کە دەتوانن شتێك بزانن کە پێغەمبەرو(ﷺ) جبریل نەیانزانیبێ، ئەوەندەش بەسە بۆ کەسانێك کەوا دڵیان زیندووەو چاویان بینا بێ.

من بەو جۆرە کەسانە دەڵێم: کە خۆیان خەریك کردووە بە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی:

ئێوە هێندەتان بەس بێ کە بۆ پێغەمبەرو(ﷺ) یاوەرانی بە درێژایی مێژوو، بۆ پێشەوایانی ئەم ئومەتەش بەس بووە، ئەگەر زانینی ئەوکاتە باش و چاك بوایە، ئەوا خودا هەواڵی کاتی ڕوودانی بە مرۆڤ ڕادەگەیاند، بەڵام ئەوەی لێ داپۆشیون و پەنهانی کردووە، بەرژەوەندی مرۆڤیش لەوە دایە کە مرۆڤ نازانێت کەی ڕۆژی دوایی دێت، پێویستە بۆ ئەو کەسانەی دێن پەند لەوانەی ڕابردوو وەربگرن، چونکە هەندێك لەو زانایانەی ڕابردوو ڕۆژی دواییان دیاریکرد، یان ڕوودانی هەندێك نیشانەی ڕۆژی دواییان دیاری کرد، سەرەنجام ئاکامی گەیشتێ و هیچ لەم شتانەش ڕووی نەدا، نە ڕۆژی دوایی هات و نەنیشانە دیاریکراوەکان پەیدابوون.

تەنانەت لە ئێستادا زانایانی گەردوون خەریکی دروست کردن و ناردنی دوو تەلەسکۆبی گەورەن، کە چۆنیەتی دروست بوونی گەردوون و چۆنیەتی کۆتایی پێهاتنی گەردوون ئاشکرا بکات.

بۆ ئەم مەبەستەش لە بەرنامەیاندا هەیە، لەم ساڵەدا ئەم تەلەسکۆبانە ڕەوانەی بۆشایی گەردوون بکەن و لە تەمەنی ئەم گەردوونە بکۆڵنەوە، کە (١٣,٧) ملیار ساڵ دەبێت، ئەم تەلەسکۆبانە لە چۆنیەتی دروست بوونی ئەستێرەکان و هەسارەکان دەکۆڵێتەوە.

تەلەسكۆبی یەكەم بە ناوی (بلانك سیدرس) كە لە پاش ماوەی تەقینەوە گەردوونیەكان و كونە ڕەشەكان دەكۆڵێتەوە.

تەلەسكۆب دووەم بە ناوی (هیرشیل سیركز) كە بە تیشكی ژێر سوور پشكنینەكانی خۆی لەسەر هەسارەكان ئەستێرەكان ئەنجام دەدات[1].

ئەمانە وادەزانن ئەگەر ئەم كارە ئەنجام بدەن دەتوانن كاتی ڕۆژی دوایی دیاری بكەن، بەڵام نازانن دەست بەتاڵن و ئەمە زانستێكە پەیوەستە بە خوای گەورەو هیچ كەسی تر نایزانێت.

(١) Brehm, J.J. and Mullin, W.J., "Introduction to the Structure of Matter: A Course in Modern Physics," (Wiley, New Yor(محمد) 1989, ISBN 0-471-60531-X

## دیاریکردنی هاتنی ڕۆژی دوایی

پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بەرهەڵستی ئەو کەسانە دەداتەوە کە سەبارەت بە هاتنی ڕۆژی دوایی لە کاتێکی دیاریکراو قسە دەکەن و دەفەرموێ:

هەر کەسێك دەربارەی کاتی دیاریکراوی ڕۆژی دوایی قسە بکات، ئەوە وەکو ئەو کەسە وایە کە کتێبێکی نوسیوە بە ناوی (الدر المنظم في معرفة الأعظم) و تیایدا (١٠) ئاماژەی هێناوەتەوەو کاتەکەی پێ دیاریکردوون، وە ئەوانەی کەوا دەربارەی هاتنی ڕۆژی دوایی قسە دەکەن مەبەستیان گومڕاکردنی خەڵك نەبووە، وەکو پێشەوا (تەبری و سیوطي و..) هتد، بەڵام بە هەڵەدا چوو بوون، هیچ کەسیش نیە لە ژیاندا کە هەڵە نەکات، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ)[1]. واتە: هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، باشترینیشیان ئەو کەسانەن کە کاتێ هەڵەیەك دەکەن، پەشیمان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە لای خودا.

هیچ گومانیش لەوەدا نیە، ئەوانەی کە بانگەشەی زانینی کاتەکەی دەکەن، ئەمە قسەیەکی بێ بنەماو زانستە، ئەوانە بە هەوەسی خۆیان دەربارەی هاتنی ڕۆژی دوایی دەدوێن.

ئەو کەسانەی بەبێ بەڵگە قسە لە دیاریکردنی ڕۆژی دوایی دەکەن و بە حیسابی خۆیان کاتەکەی دەردەخەن، ئەو ئایەتە دەیانگرێتەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

[ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ][2].

---

(١) سنن ابن ماجة، (٢/ ١٤٢٠) باب: ذكر التوبة، برقم: (٤٢٥١).

(٢) سورة الاعراف، الآية: ٣٤.

واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان بڵێ پەروەردگارم هەموو کارێکی خراپ و ناشیرنی حەڕام کردووە، جا چ بە ئاشکرا بێت یان بە نهێنی، وە هەم گوناە و تاوان و لە سنوور دەرچوون و دەست درێژی کردن بۆ سەر خەڵك بە ناهەق و بەبێ هیچ بەڵگەیەکی خوایی و هاوبەش دانان، وە لە ئاخاوتن و قسەکردن دەربارەی خودا دەدوێن بەبێ زانین، ئەوانە قسەیەك دەکەن هیچ زانیاریەکیان لا نیە.

پێشەوا محەممەد صالح مونجید دەڵێت:

ئەو کەسەی کە هاتنی کاتی ڕۆژی دوایی دیار دەخات (إما مخطئ أو كذاب)[1]. واتە: یان هەڵەی کردووە یان درۆزنە.

**ئەو کەسانەی هاتنی ڕۆژی دوایی دیاری دەکەن دوو جۆرن:**

• هەندێك لە زانایانی ئیسلامی هەن کە هاتنی ڕۆژی دوایی دیاری دەکەن، لەکاتێکی دیاریکراودا، ئەم زانایانە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) تەنها ئیجتیهادی خۆیان بووە، نەك بە ئارەزووی خۆیان ئەم ساڵە دیاری بکەن، ئەمەش ئیجتیهادێك بووە ئەم زانایانە نەیانپێکاوە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ).

• وە هەندێکی تر هەستاون هاتنی ڕۆژی دواییان دیاری کرد وەکو ئەستێرەناسەکان و پێشبینیکاران و ئەهلی کیتاب، کە بەڕاستی ئەمەش کێشەیەکی زۆر گەورەیان بە نێو جیهانی بونەوەر دروست کردووە.

چونکە بڕیارەکانیان بەهۆی ئارەزووی خۆیانەوە بووە، هەندێکیشیان پێشبینیان کردوە، هەندێکیشیان پەیوەندیان بە ئیسلامەوە هەر نەبووە، ئەوانە بە کەیفی خۆیان بەناو کەوتوون و بەبێ توێژینەوەو بەڵگە.

---

(١) نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، وتاری بەرێز: د. عبدالله .

# هەندێک لە زانایانی ئیسلام
# هاتنی ڕۆژی دواییان دیاری کرد!

نەك تەنها ئەستێرەناسەکان و ئەهلی کیتاب و زانایانی سروشتی هاتنی ڕۆژی دواییان دیاری کردبێت، بەڵکو بەشێك لە موسڵمانانیش کەوتونەتە هەڵەیەك لە دیاریکردنی تەمەنی زەوی و کۆتایی بونەوەر، بە نمونە:

• دکتۆر عەبدولناصر مەدبولی لە پەرتوکی (الحرب العالمية الثالثة بين الإسلام والغرب) دەڵێت: ساڵی ١٩٩١ کاتی دەرچوونی مەهدیە، لە ساڵی ١٩٩٣ کاتی جەنگی عەرەب و جولەکەیە، ساڵی ٢٠٠٠ سەرهەڵدانی مەسیحی دەجالە، وە ئەم کتێبەش لە ساڵی ١٩٩٠ لە چاپ دراوە. ئەگەر سەیری ڕووداوەکان بکەین بەلایەنی کەم ٢٠ ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوانە تێپەڕیووەو هیچ کامێك لەم نیشانانەی قیامەت نەهاتووەتە دی[1].

• عاشوری کوڕی عەبدوسەلام لە پەرتوکی (نبوءات الكتب المقدسة ونهاية العالم) دەڵێت: محەممەدی مەهدی لە ساڵی ١٩٩١ دەردەچێت، لە ساڵی ١٩٩٣ ئاشکرا دەکرێت، وە دەجال لە ساڵی ٢٠٠٠ سەرهەڵدەدات. ئەم پەرتوکە دوای سەرهەڵدانی شەڕی خەلیج لە چاپ دراوە، وە هاوشێوەی پەرتوکی دکتۆر عەبدولناصرە[2].

• (بەشیر محەممەد عەبدوڵلا) لە پەرتوکی (زلزال الأرض العظيم) دەڵێت: لە ساڵی ١٩٩٤ بومەلەزرە گەورە لە زەوی دەدات، کە بومەلەرزەی هاتنی ڕۆژی دواییە، لە ئێستادا لە ساڵی ٢٠٢٠ دەژین تا ئێستا بومەلەرزەکەش نەهاتووە[3].

---

(١) الحرب العالمية الثالثة، عبدالناصر مدبولي، (لا ٣٦).

(٢) موعد الساعة، (لا ٨٤).

(٣) موعد الساعة (لا ٨٥).

• پێشەوا سیوطي (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) یەکێکە لەوانە لە بەشێکی کەوا ناوی (الكشف عن مجاوزة هذه الأمة الألف) وای دەرخستووە کە هاتنی ڕۆژی دوایی لەسەری پازدەهەمین سەدە پاش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوودەدات[1].

پاشان باسی هەندێ حیسابات دەکات کە گەیشتۆتە ئەوەی کە ئەم ماوەی ماوە ناگاتە هەزارو پێنج سەد ساڵ، پاشان هەندێ فەرمووده باس دەکات کە پشتی پێ بەستاوە، لەم قسانەیدا یەکێ لەم فەرموودانە ئەوەیە کە پێشەوا (طبراني) لە (معجم الكبير) لە ضەحاکەوە دەڵێت: خەوێکم بینی جا بۆ پێغەمبەرم(ﷺ) گێڕایەوە گوتم: تۆم بینی ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر دوانگەدا کە حەوت پایەی هەبوو، وە تۆ لە پایەی هەرە بەرزی بووی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەو دوانگەی کە بینیوتە حەوت پایەی هەبوو من لە پایەی هەرە سەرووی بووم، جا دونیا حەوت هەزار ساڵەو ئێستا من لە کۆتایی هەزارەکە دام. وە باس دەکات کە ئەم فەرموودەیە پێشەوا بەیهەقی لە پەرتوکی (الدلائل) گێڕاویەتیەوە، وە پێشەوا (سوهەیلی) باسی کردووە کە ئەم فەرمودەیە بێهێزە لە سەنەدا بەڵام گێڕدراوەتەوە لە ئیبنو عەباس بە چەند ڕێگایەکی ڕاست و دروست.

پاشان پێشەوا سیوطی ڕوونی کردۆتەوە کەوا واتای فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێ: (وأنا في آخرها ألفاً) . واتە: بەشی هەرە زۆری گەلی موسڵمان لە هەزارەی کۆتایی دایە بۆ ئەوەی ڕێك بێت لەگەڵ ئەوەی کە دوایی باسی دەکەین کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانە کراوە لە کۆتاییەکانی هەزارەی شەشەم جا ئەگەر لەسەرەتای هەزارەی حەوتەم ڕەوانە کرابا ئەوا ئەو کاتە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی وەکو دەجال و هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیساو هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاوا ئەوا دەبوایە ڕوویدابا زیاتر لە سەد ساڵ تاکو ڕۆژی دوایی دابێ لە تەواوبوونی هەزار ساڵەکەدا بەڵام هیچ شتێ لەمانە ڕووی نەداوە بۆیە بەڵگەیە کە ئەوەی ماوە لە هەزارەی حەوتەمدا زیاترە لە سێسەد ساڵ[2].

---

(١) لوامع الأنوار البهية، (٢/٦٦).

(٢) الحاوي للفتاوى، للسيوطي (٢/ ٨٨).

ئا ئەوە پوختەی قسەی پێشەوا سیوطی بوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە پێچەوانەیە لەگەڵ قورئان و فەرموودە دروستەکاندا کەوا ماوەی دونیا کەسێك نازانێت تەنیا خوای گەورە نەبێ، لەبەر ئەوە ئەگەر ئێمە ماوەی تەمەنی دونیامان زانیبوایە ئەوا دەمانزانی کەی ڕۆژی دوایی دێت کە بێگومان لەوەو پێش زانیت لە ڕوانگەی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە کەس نازانێت چ کاتێك ڕۆژی دوایی دێت.

بەڕاستی واقیعی ئەمرۆ ئەمە ڕەت دەکاتەوە چونکە ئێمە لە سەرەتای سەدەی پانزەمین لە مێژووی کۆچیدا نە دەجال هاتووەو نە پێغەمبەر عیسا دابەزیوە، چونکە پێشەوا سیوطی باس دەکات کەوا هاتووە لە فەرموودەدا کە دەجال لەسەری سەد ساڵەدا دەردەچێ و پێغەمبەر عیسا دەیکوژێ پاشان چل ساڵ لە زەوی دەمێنێتەوە.

جا لەسەر قسەی ئەم پێشەوا گەورەیە گەر ئێستا دەجال بێت ئەوا دوو سەد ساڵی بۆ دابین بکەین کە ئەو کاتیش دەکات هاتنی ڕۆژی دوایی دەبێتە ڕێککەوتی هەزارو شەسەد ساڵ.

• یەکێك لەوانە پێشەوا تەبەری (رەحمەتی خوای لێ بێ) کە لە هەندێك دەقاندا وای بیرکردبویەوە، کە پاش(٥٠٠) ساڵ لە ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) دونیا تەفرو تونا دەبێت[١].

ئەوا نزیکەی (١٤٤٠) ساڵە بەسەر ئەو ئاکامە تێپەڕیوە، هەتا ئێستاش هیچ ڕووی نەداوە.

• پێشەوا (سوهەیلی)یش هەستا بە توێژینەوەی پیتە پچر پچرەکانی سەرەتای سورەتەکانی قورئان کۆیکردنەوەو دووبارەکانی لێ دەرهاویشت و بە حیسابی ئەبجەدی لێکی دایەوە و لەسەر ئەم گریمانەی خۆی ئاکامێکی دیار کرد، کە لە چەند سەد ساڵێك تێنەدەپەڕی[٢].

---

(١) المقدمة، ابن خلدون، (لا ٥٩٠).

(٢) القيامة الصغرى، الدكتور عمر سليمان الأشقر (لا ٨) .

ئەم زانایانەی لە پێشەوە باسمان کرد وەکو پێشەوا طبری و سیوطي و سوهەیل (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ).. هتد، ئەمانە توێژینەوەیان سەبارەت بە دیاریکردنی ڕۆژی دوایی کرد.

• پێشەوا نوعەیمی کوڕی حەمماد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەیگوت: لە ساڵی ١٢٠٠ محەممەدی مەهدی دێت و خەڵکی لە دەوری کۆدەبنەوە[١].

ئەگەر بە ساڵی کۆچی و عیسایی بکەین ١٢٠٠ ساڵ تێپەڕی هەتا ئیستاش محەممەدی مەهدی نەهات.. لە کاتێکدا ئێمە لە ساڵی ١٤٤٠ی کۆچی بەرامبەر بە ٢٠٢٠ ی عیساییین..

هیچ کەسێ نازانێ کەی ڕۆژی دوایی دێ، بەهەمان شێوە هیچ کەس نازانێ کەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەردەکەوێ، وە ئەوەی هاتووە کە لە فلانە ساڵ وا دەبێ وە لە فلانە ساڵ ئەمە ڕوودەدات ئەوە ڕاست نیە لەبەر ئەوەی مێژوو لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دانەنراوە بەڵکو لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) دانراوە بە فەرمانی ئەو سەرەتای مێژووی بە ڕۆژی کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە دانرا.

پێشەوا قورتبی (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

بێگومان ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوە لە ئاشوبەکاندا ئەوە بەڕاستی ڕوو دەدەن بەڵام دیاری کردنی ڕۆژگارەکەی و لە ساڵێکی دیاریکراو پێویستی بە ڕێگایەکی دروست و فەرموودەی بەهێز هەیە کە بیانوو بڕ بێ، لەبەر ئەوەی ئەمە وەکو کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی وایە، هیچ کەسێك نایزانێ لە چ ساڵێك یان مانگێك ئەمە ڕوودەدات بەڵام زانراوە کە لە ڕۆژی جومعە لە کۆتایی کاتەکەیدا ڕوو دەدات کە ئەو کاتەیە کە پێغەمبەر ئادەمی تیا دروست کراوە، بەڵام کامە جومعە کەس نازانێ دیاریکردنی ئەم ڕۆژە تەنیا خوای گەورە دەیزانێت[٢].

---

(١) ضعيف: رواه نعيم بن حماد في (الفتن) برقم: (٩٦٢) بسند ضعيف..

(٢) التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة (لا ٦٢٨).

کەواتە زانایانی ئیسلام لە بابەتی دیاریکردنی هاتنی ڕۆژی دوایی نەیانپێکاوە، بۆیە دیاریکردنی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی هیچ کەسێك نایزانێت جگە لە (الله)، ئەگەر نمونەیەك بهێنینەوە:

ئێستا ساڵی ٢٠٢٠ ی عیساییە:

ئەگەر دابنێین ئەو ساڵە محەممەدی مەهدی دێت، ماوەیەکی تەواوی دەوێت هەتا کۆتایی بونەوەر دەست پێدەکات، وەکو:

- (٧ تا ٩) ساڵ سەردەمی محەممەدی مەهدی.
- (٧ تا ٤٠) ساڵ سەردەمی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ).
- (٣) ساڵ سەردەمی خەلیفەی تەمیمی.
- (١٢٠) ساڵ سەردەمی دوای هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە.
- (١٠٠) ساڵ سەردەمی دوای بایە نەرمەکە.
- (٤٠) ساڵیش نێوان هەردوو نەفخی صورەکە.

کەواتە کۆی گشتی (٧ + ٤٠ + ٣ + ١٢٠ + ١٠٠ + ٤٠ + ٢٠٢٠ یەکسانە بە ٢٣٣٠ عیسایی.

ئەگەر کەمێك ورد ببینەوە مەهدی ئەو ساڵی ٢٠٢٠ بێت ئەوا ڕۆژی دوایی ساڵی ٢٣٣٠ بەرپا دەبێت.

کەواتە ئەوانەی بانگەشە بوونی هاتنی ڕۆژی دوایی دەکەن لە ساڵێکی دیاریکراو ئەوا هیچ ئەسڵ و بنچینەیەکی نییە.

- هەروەها یەکێك لەوانەی کە هاتنی ڕۆژی دوایی دیاریکرد (ئەمین محەممەد جەمالەددین) بوو، پەرتوکێکی خستە چاپ لە ژێر ناونیشانی (عمر أمة الإسلام) کە تەمەنی ئوممەتی ئیسلامی دیاری کردبوو بە کەمتر لە ١٥٠٠

ساڵ دوای هاتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)[1]، بە وتەی (ئەمین) بێت دونیا ٥٩ ساڵ کەمتری ماوە، کە ئەمەش هیچ بنچینەیەکی نییە.

• لە دوای پەرتوکی (عمر أمة الإسلام) پەرتوکێك دەرچوو بەناوی (رسائل آخر الزمان) لە نوسینی: ئەحمەد ئەبو نور کە تەمەنی ئوممەتی ئیسلامی دیاری کرد لە ٢٠٨٦ ساڵ[2]، کە ئەمەش لە هیچ گۆشەیەکی ئیسلام جێگای نابێتەوە.

• دکتۆر (ڕەشاد خەلیفە) لە وڵاتی ئەمریکا توێژینەوەیەکی کرد بە ناوی (نهاية العالم ستقع بعد ٢٩٨ سنة) کۆتایی بونەوەر لە دوای ٢٩٨ ساڵ ڕوودەدات.. بە پێی توێژنەوەکەی وای لێکداوەتەوە کە لە ساڵی ٢٢٨٠ کۆتایی بونەوەر دەست پێدەکات[3]. لە کاتێکدا ئەم وتەیە هیچ بنچینەیەکی نییە، نەك توێژینەوەیەك تەنانەت ئەگەر هەزاران توێژینەوەی لەسەر بکرێت.

بەڕگی یەکەم

---

(١) عمر أمة الإسلام، أمين محمد جمال الدين، (لا ٤٣).

(٢) رسائل آخر الزمان، أحمد ابو النور (لا ٦٠ ـ ٦١).

(٣) موعد الساعة، (لا ١٢٠).

# دیاریکردنی هاتنی ڕۆژی دوایی لەلایەن ئەستێرەناس و جادووگەران

لە دێر زەمانەوە کەسانێك هەبوون کە بڕوایان بە ئەستێرەناسی هەبووە، وە کەسانێکیش بە هۆی ئەستێرەناسیەوە تووشی فیتنەو ئاشوب بوونە، هەندێك وایانزانی خودایە یان ڕووحی خودایە، بۆیە بیروباوەڕیان وابوو کە ئەستێرە کاریگەری بەسەر شارەکانی جیهانەوە هەیە، وە هەندێك لە ئەستێرەناسەکان بیروباوەڕیان وایە کە پەیوەندیەك هەیە لە نێوان لاشەی ئاسمانی و لاشەی مرۆڤ، بە نمونە: لە کاتی لە دایکبوونی منداڵێك ئەستێرەکانی ئاسمان کاریگەریان بەسەرەوە دەبێت.. بە پێچەوانەوەش یان برسیەتی و دڵخۆشی ڕووداوی ترسناك.. ئا بە هەموو شێوەیەك زانایانی زانستی سەردەم بە هەموو شێوەیەك ئەم خوراڤیاتەی ئەستێرەناسی ڕەت دەکەنەوە، چونکە هیچ پەیوەندیەکی زانستی نییە لەگەڵ هەسارەکان.

بەداخەوە.. کەسانێکی جادووگەریش لە کوردستان کار بە بورج و هەسارەکان دەکەن بۆ داهاتووی ژیانی خەڵکی، تەنانەت ڕاگەیاندنەکانیش برەو بەم کارە قێزەوەنانە ئەدەن.

زانایان ئیشکردن لەسەر ئەستێرەناسی بە بەشێك لە خوراڤیات و درۆ دەزانن، بەڵام لە سەدەی بیستەم دووبارە ئەم خوراڤیاتە زۆر بە خێرایی بڵاوبوویەوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، تەنانەت کۆمەڵەیەکیشیان دروست کرد لە ژێر ناونیشانی (الجمعية الدولية لأبحاث التنجيم) لە ویلایەتی (ئۆهایو)ی ئەمریکا.

تەنانەت زۆر لە دەوڵەتەکانیش بە ڕەسمی دانیان نا بەم کۆمەڵەیە وەکو: ینبال و بۆڕما و سریلانکا و سیکیم و هیند.. هتد.. تەنانەت لەم دواییە ڕۆژئاواییەکانیش پەرەیان بە ئەستێرەناسی و جادووگەری دا، بۆیە لە ئێستادا لە هەر شارێك و گوندێکی ئەوروپا و ئەمریکا ئەستێرەناسی بووەتە پێشەیەك و بڵاوبۆتەوە[1].

---

(١) حقائق وغرائب، مكتبة مدبولي، لا (١٣٠ ـ ١٣١).

بۆیە ئەستێرەناسەکان هەر بەوەندەوە نەوەستاون، بەڵکو هەڵساون بە دیارکردنی هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەمەش چەند نمونەیەکی ئەستێرەناسەکان کە هەمووی درۆ دەرچووەو ئەسڵی نەبووە:

• ئەستێرەناسەکان بانگەشەی ئەویان کرد کە گوایە ڕۆژی دوایی لە ڕۆژی ٣١ ی دیسەمبەری ساڵی ٩٩٩ ی عیسایی ڕوودەدات، ئەمەش بووە مایەی دڵە ڕاوکێ و ترس لە هەموو ئەوروپا.. ئێستا ئێمە لە ساڵی ٢٠٢٠ داین، هەتا ئێستاش قیامەت نەهاتووە.. لە کاتێکدا ١٠٠١ ساڵ بەسەر ئەم بەروارە تێپەڕیوە[١].

• (تاهك میونخ وان) بەڕێوەبەری پەیمانگای جیهانی بۆ ئایینەکان لە کۆریای باشور ڕایگەیاند کە ڕۆژی قیامەت لە نیوەی شەوی ٢٨ ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٢عیسایی ڕوودات، ئێستا ئێمە لە ساڵی ٢٠٢٠ ین، هەتا ئێستاش قیامەت نەهاتووە.. لە کاتێکدا ٢٨ ساڵ بەسەر ئەم بەروارە تێپەڕیوە.. لە کاتێکدا ملیۆنان کەس لە کۆریای باشورو یابان و سەنغافورەو ئۆستۆڕالیاو تایلەندو چین بڕوایان بە پێشبینیەکانیان هەبوو.. لەگەڵ ڕێزم زۆربەی ئەو میلەتە قەت عاقڵ نابێت و بڕوا بە ئەستێرەناسی دەکات[٢].

• لە ئۆکرانیا (مارینا تسیفیجی) بانگەشەی خوایەتی دەکرد، لە تەمەنی ٣٣ ساڵی پێشبینی کرد کە ڕۆژی یەك شەممەی ٢٤ ی نۆفەمبەری ساڵی ١٩٩٣ عیسایی قیامەت سەرهەڵدەدات، دواتر پەشیمان بوویەوەو گوتی: هەڵەیەکی لە حیساب کراوە بۆیە قیامەت لە ڕۆژی یەك شەممەی ١٤ ی نۆفەمبەری ساڵی ١٩٩٣ عیسایی ڕوودەدات، لەسەر ئەو بەروارە بۆلیسی ئۆکرانی هەستا بە دەستگیرکردنی و ١٥٠٠٠٠ هەزار کەس لە شوێنکەوتووانی، ئێستا ئێمە لە ساڵی ٢٠٢٠ داین، هەتا ئێستاش قیامەت نەهاتووە.. لە کاتێکدا ١٧ ساڵ بەسەر ئەم بەروارە تێپەڕیوە[٣].

---

(١) المجئ الثاني هل هو على الأبواب ـ مجدي صادق ـ (لا ٦١).

(٢) نهاية العالم وموعد مجئ السيد المسيح ـ جوزيف بطرس ـ (لا ٤٥).

(٣) موعد الساعة بين الكتب السماوية والمتنبئين، هشام كمال عبدالحميد، لا ١٩.

• نۆسترا دامۆس[1] لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا کە بەشێوەی چوارینە نوسیویەتی، لە چوارینەکەیدا پێشبینی ئەوەی کردووە، کە دوای دوانزە ساڵ لە کۆتایی دوو هەزاردا کە دەکاتە ساڵی (٢٠١٢) هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر تێکدەچن و ئەو کاتەش ژیان کۆتایی پێ دێت، نۆسترا دامۆس یەکێك بوو لەو کەسانەی کە خەڵکی هەڵخەڵەتاند لەسەر ئەم بابەتە، ئەریك ڕووسێل (ErieRussell) لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (Astrology&prediction) باس لەوە دەکات، کە زۆرێك لە ئەستێرەناسەکانی هاوسەردەمی نۆسترادامۆس پێشتر هەواڵی (لافاوی ترسناکی ئاو) یان بیستبوو، ئەوان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بە بۆچوونی خۆیان هەموو هەسارەکان لە بورجی نەهەنگدا کە پڕە لە ئاو کۆدەبنەوە، ئەم قسەیە ئەوەی دەگەیاند، کە بەبێ گومان گۆی زەوی بەرەو لەناوچوون دەچێت، تا کار گەیشتە ئەوەی، ئەوانەی دەوڵەمەند بوون بەلەمەکانیان لە دەربەندەکاندا ئامادە کردبوو،

---

(١) (نۆسترا دامۆس) لە ساڵی (١٥٠٣)عیسایی لە باشوری فەرەنسا لە دایك بووە، باوکی بە ڕەچەڵەك جولەکە بووە، پاشان چووەتە سەر باوەڕی (کاثۆلیکی)، هۆکارەکەشی ترس بووە لە دەرکردنیان بە دەستی مەسیحیە دیندارەکانی ئەوروپا، هەروەك لە ئیسپانیا دەریانکردن بە تۆمەتی کوشتنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لەلایەن جولەکەکانەوە، تەنانەت هەندێك لە جولەکەکان ناچاری قبوڵکردنی مەسیحیەت بوون، (نۆسترا دامۆس)یش لەبەر ئەمە لە بارودۆخێکی جووت کولتوری تێکەڵ لە داب و نەریتی جولەکانەو ڕواڵەتی دەرەوەی مەسیحیانە گەورە بوو.

باوك و باپیرانی (نۆسترا دامۆس) لە خێڵی ئیسا شاری جولەکەییەوە هاتبوون، ئەم خێڵە لێهاتووە لە بواری کاهینیدا خاوەنی مێژوویەکی دەوڵەمەند بوون.

باوك و باپیرانی لەگەڵ سیحربازو نوشتە نوسە عەرەبەکاندا هەمیشە لە پەیوەندیەکی باش دابوون، (نۆسترا دامۆس) لە ساڵی (١٥٢٩) دا بوو بە دکتۆر لە شاری (ئاگەن) نیشتەجێ بوو، پاشان ژنی هێناو دوو منداڵی بوو، دوایی بە هۆی نەخۆشی تاعونەوە ژن و دوو منداڵەکەی لە دەستداو نۆرینگەی داخست و ئیشی کەوتە کاری دەستگێڕی، لە نێوان ساڵانی (١٥٤٦ تا ١٥٤٨) دا لە ململانێیەکی سەخت دا دەبێت لەگەل نەخۆشی دا، لە ساڵی (١٥٥٦) لەلایەن (پاشا هێنری دووەم)ەوە وەك ڕاوێژکاری پزیشکی خۆی بانگهێشت کراو، لە ڕاستیدا ناوبانگی کاهینەکەی زیاتر بیسترابوو، پاشاش هەر ئەو لایەنەی زیاتر بەلاوە گرنگ بوو، بەرەبەرە بوو بە پزیشکی تایبەتی پاشاو لە هەمان کاتیشدا ئەستێرەناسی کۆشکی پاشایەتی بوو.

ئەمەش وای کرد کە قازانجێکی باش بگەڕێتەوە بۆ وەستاکانی بەلەم دروست کردن، هەموو دونیا چاوەڕێی ئەم کۆتاییەی دەکرد بەڵام هیچ شتێك ڕووی نەدا .

• ڕاپۆرتێکی زانستی پێشبینی ئەوەی کرد، کە لە ساڵی (٢٠١٣) ڕەشەبایەکی زۆر بەهێز هەڵدەکات لەسەر ڕووی زەوی، چەند بڕگەیەك لە ڕاپۆرتی (نیو ساینتیست) بڵاوکراوەتەوە، کە بەخراپترین کارەساتی سەر ڕووی زەوی وەسف دەکات لە سەدان ساڵی ڕابردوو، ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوە دەکات، کە ڕەشەبایەکە دەبێتە هۆی بچرانی هێڵی کارەبا لە هەموو خزمەتگوزارییەکان و جیهان دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی تاریکی، هەروەها دەبێتە هۆی لە کارکەوتنی مانگە دەستکردەکان و تۆڕی پەیوەندی و ئینتەرنێت و پەخشی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، ڕاپۆرتەکە پێشبینی کرد کە بایەکی زۆر بەهێز لە کۆتایی مانگی ئەیلولی (٢٠١٣) هەڵبکات و لەسەرەتادا شێوەیەکی ڕۆژ ئاوابونێکی جوان لەخۆ دەگرێت و پاش کەمتر لە (٩٠) سانیە هیچ ڕووناکیەك لە ئاسمان نامێنێ و لە ماوەی کەمتر لە (١) کاتژمێر هیچ ڕووناکیەك لەسەر ڕووی زەوی نامێنێت، ڕاپۆرتەکە هۆشداریدا بەهەڵکردنی ئەو ڕەشەبایە کە جیهان توشی کارەساتێکی ئابووری دەبێت، چونکە هەموو چالاکیەکانی ژیانمان لەسەر کارەبایە، (ریتشارد کارینجتون) کە زانایەکی گەورەی ئەستێرەناسی بەریتانیە ڕوونیکردەوە کە ماوەیەکی زۆرە لەچاودێری کردنی جولانەوەیەکی ناسروشتی دەبینین لە دەورەی ڕۆژو کۆبونەوەی سەراب و تیشك و تەنەکان لە دەوروبەری ڕۆژ کۆدەبنەوەو دەسوڕێنەوەو چەند گیژەلۆکی هایدرۆجینی گەرم پێك دێنن و هێدی هێدی لە زەوی نزیك دەبنەوەو ئەگەر بەر ناوچەی کێشکردنی زەوی بکەوێت (المجال المغناطيسي للأرض) کارەساتێکی گەورەی لێدەکەوێتەوە، ساڵی (٢٠١٣)ەش کۆتایی هات و ئەم ڕووداوەش نەهاتە دی، ئەمەش جگە لە هەڵخەڵەتاندنی مرۆڤایەتی هیچی تر نیە.

• زۆرجار لە کەناڵەکانی ئاسمانی باس لە دیاردەی گۆڕانی کەش و هەوا و گەرمبوونی گۆی زەوی و گەرمبوونی ئاوی دەریای ناوەڕاست دەکرێت، کە بەڵگەن لەسەر تێکچوونی ئەم بوونەوەرە، بۆیە زاناکان پێشبینیان کردووە کە لە ساڵی (٢٠٦٠) جیهان کارەساتێکی ترسناك بەخۆیەوە ببینێت.

• لە کتێبەکانی جولەکەو گاورەکان هاتووە کە شەڕی (هەرمەجیدۆن) وەکو لە کیتابی موقەدەس (ئینجیل) هاتووە کە لای جولەکەکان لە ساڵی (١٩٩٨)ع، و لای گاورەکان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠١)عیسایی دەبوایە ئەم شەڕە ڕوویدا بوایە[1]. وە ئێمە وەکو موسڵمان باوەڕمان وایەو دەڵێین: زوو بێت یان درەنگ کۆتایی بەم بونەوەرە دێت، بەڵام بۆمان نیە هاتنی کۆتایی بونەوەر دیاری بکەین.

• (جین دیسکون) یەکێکە لە ئەستێرەناسە بەناوبانگەکان گوتی: لە ساڵی ١٩٩٢ کاتی دەرچوونی محەممەدی مەهدیەو لە ساڵی ١٩٩٩ کاتی ڕووداوی مرۆڤایەتیە، ئەوە لە ساڵی ٢٠٢٠ داین هەتا ئێستاش محەممەدی مەهدی نەهات[2].

• ئەستێرناس (کرشانا ساماتیا) ی هیندی دەیگوت: ڕۆژی قیامەت لە کاتژمێر شەشی بەیانی ١٧ی یولیوی ساڵی ١٩٩٩ عیسایی، دەبێت، لە کاتێکدا ئێستا ئێمە لە ساڵی ٢٠٢٠ ین و ٢١ ساڵ تێپەڕیوە بەسەر کاتەکەی و هەتا ئێستاش قیامەت نەهاتووە[3].

• ئەستێرەناس (لویس تشاریتر)ی بەریتانی کتێبێکی نوسی لە ژێر ناونیشانی (أسرار الكون) بە پێی ئەو کاتەی کە داینابوو دەیگوت: لە ساڵی ٢٠٠٣ عیسایی، قیامەت دێت.. ئەوە ١٧ ساڵ بەسەر کاتەکەی ڕۆیشتووەو هەتا ئێستاش قیامەت نەهاتووە[4].

• ئەستێرەناس (نیڤیل سبیرمان)ی ئەمریکی دەیگوت: ڕۆژی قیامەت لە ساڵی ٢٠٠٧ عیسایی دێت، ئەوە ١٣ ساڵە بەسەر ئەو کاتەوە ڕۆیشتووە هەتا ئێستاش ڕۆژی قیامەت نەهاتووە[5].

---

(١) http://www.neelwafurat.com/itempage.

(٢) الحرب العالمية الثالثة بين المسلمين والغرب، د. عبدالناصر مدبولي، (لا ٣٩ ـ ٤٠).

(٣) نهاية العالم يوليو، سنة ١٩٩٩، عاطف النمر، (لا ٥).

(٤) موعد الساعة، (لا ٣٠).

(٥) نهاية العالم يوليو، سنة ١٩٩٩، عاطف النمر، (لا ٥).

بەشی یەکەم

# دیاریكردنی هاتنی ڕۆژی دوایی لەلای ئەهلی كیتاب

لە پێشوودا باسی ئەوەمان كرد كە كۆتایی بونەوەر لەلایەن ئەستێرەناسەكان گرنگی پێدراوە بۆ ئەوەی خەڵكی هەڵبخەڵەتێنن بە وتە ناڕاستەكانیان، بەهەمان شێوە لەلایەن بەشێكی زۆری ئەهلی كیتابیش هەمان گرنگی پێدراوە لە دیاریكردنی نزیكبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

چۆن ئەستێرەناسەكانی پێشوو شكستیان هێنا لە دیاریكردنی هاتنی ڕۆژی دوایی، بە هەمان شێوە جولەكەو گاورەكانیش شكستیان هێنا لە دیاریكردنی.

• یەكێك لەوانەی هاتنی ڕۆژی قیامەتی دیاریكرد (بەرحیا) بوو كە گوتی: لە یەكێك لەو ساڵانە (١٢٣٠ - ١٣٥٨ - ١٤٤٨)ی عیسایی مەسیحی جولەكەكان دەردەچێت، ئەوە لە ساڵی ٢٠٢٠ ین هەتا ئێستاش مەسیحی دەجال دەرنەچووە[١].

• ڕابی (ڕاش) پێشبینی كردبوو كە سەرهەڵدانی مەسیح لە ساڵی ١٣٥٠ ی عیسایی دەردەچێت. واتە: (٦٧٠) ساڵ پێش ئێستا[٢].

• (ئیسحاق ئیبرابانیل) دەیگوت: لە ساڵی ١٥٠٣ عیسایی، كاتی دەرچوونی مەسیحی دەجالە. ئەوە (٥١٧) ساڵە بەسەر ئەو بەروارە تێپەڕیوە[٣].

• (ئیبراهامی كوری یەعزر) پێشبینی كردبوو كە لە ساڵی ١٥٣١ی عیسایی، مەسیحی دەجال دەردەچێت. ئەوە ٤٨٩ ساڵ بەسەر بەروارەكەی تێپەڕیوەو هەتا ئێستاش دەرنەچووە[٤].

---

(١) المسیح الیهودي، د. منی ناظم، (لا ١٢٥).

(٢) موعد الساعة، (لا ٤٥).

(٣) المسیح الیهودي، د. منی ناظم، (لا ١٥٥).

(٤) موعد الساعة، (لا ٤٦).

• (صموئیل ی کوڕی یەهوزای فلریو) وای پێشبینی کردبوو کە لە ساڵی ١٨٦٨ی عیسایی مەسیحی دەجال سەرهەڵدەدات. ئەوە ١٥٣ ساڵ بەسەر کاتەکەی تێپەڕیوەو هەتا ئێستاش دەجال دەرنەچووە[١].

• (یوسفی کوڕی داودی کوڕی یەحیا) کە لە سەدەی شانزەهەم ژیاوە، وای دانابوو کە مەسیحی دەجال لە ساڵی ١٩٣١ ی عیسایی دەردەچێت، ئێستا ساڵی ٢٠٢٠ ی عیساییە، هەتا ئێستا دەرنەچووە[٢].

• (ئەنتیوخوس ئیبیفانوس) دەیگوت: لە ساڵی ١١٦٤ ی عیسایی قیامەت سەرهەڵدەدات، ئەوە (٨٥٦) ساڵ بەسەر کاتەکەی ڕۆیشتووەو تا ئێستاش هیچ دەنگو باسی نییە[٣].

• (دیسقورس) پێشبینی کردبوو کە لە ساڵی ١٩٩٧ عیسایی کاتی سەرهەڵدانی جەنگی هەرمەجیدۆنە، وە لە ساڵی ١٩٩٨ عیسایی کاتی دەرچوونی مەسیحی دەجالەو ساڵی ٢٠٠١ عیسایی کاتی دابەزینی پێغەمبەر عیسایە لە ئاسمانەوە. خۆتان بڕیار بدەن ئەی بۆ تا ئێستا هیچ کامێك لەم ڕووداوانە ڕوویان نەداوە[٤]؟

• (مەجدی صادق) کە مامۆستایە لە پەیمانگای توێژینەوەی کەنیسەی میصری، لە کتێبەکەی بەناوی (المجئ الثاني هل هو على الأبواب؟) کاتی هاتنی عیسای کوڕی مەریەم لە ساڵی (٢٠١٣)ی عیسایی دەبێت. ئەوە حەوت ساڵە بەسەر کاتەکەی ڕۆیشتووەو هەتا ئێستاش دانەبەزیوە[٥].

• حاخامەکانی جولەکە دەڵێن: دوای چارەکە سەدەیەك ڕۆژی دوایی دێت، باراك ئۆباما ناوی هاتووە کە شەڕی یەئجوج و مەئجوج لە ساتە وەختی فەرمانڕەوای

---

(١) المسيح اليهودي، د. منى ناظم، (لا ١٧٨).

(٢) موعد الساعة، (لا ٤٧).

(٣) المسيح اليهودي، د. منى ناظم، (لا ١٧٨).

(٤) موعد الساعة، (لا ٥٩).

(٥) المجئ الثاني هل هو على الأبواب، مجدي صادق، (لا ٦١).

بەرگی یەکەم

ئەودا دەبێت، جەنگی ئیسرائیل لە ئێرانەوە دەست پێدەکات و سوریاو حیزبوڵڵا دەبنە هاوپەیمانی ئێران، لە نێوان ساڵانی ٢٠١١ و ٢٠١٢ بومەلەرزەیەکی گەورە ئیسرائیل دەهەژێنێت و بورجی تەلئەبیب بەسەر دانیشتوانەکەیدا دەڕوخێت، نەیزەکێك لە ئەمریکا دەکەوێتە خوارەوەو لافاو و گەردەلولێکی گەورە دروست دەکات، حاخامەکانی پەیمانگای (هارعتسیۆن) لە قودسی داگیر کراو دوای گەڕانیان لە نێو کتێبی پیرۆزدا سێ جار ناوی باراك ئۆباما ـ یان دۆزیەوەو هاوکات ئەومیان ئاشکرا کردووە ئیسرائیل دوای ڕووبەڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ کۆمەڵێك کۆسپ و نارەحەتی دواتر دەگاتە ئامانجەکانی، بە پێی بۆچوون و لێکدانەوەی ئەو حاخامانەی جولەکە کە لەسەر ماڵپەڕێکی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە، حاخام مەردەخای شاکید بە ڕۆژنامەی (یدیعوت احرونوت)ی ئیسرائیلی وتوە لە ساتە وەختی سەرۆکایەتی باراك ئۆباما گەڕان پشکنین و وردبوونەوە لە کەسێتی ئەو پیاوە دەستی پێکردووەو ئاماژەکانی تەورات ئەوە دەڵێن: بەپێی لێکدانەوەی (جومەل) کە حیسابێکی پیت و ژمارەیە، لە نێوان (التکوین) و (حەزقیال) و (ئەرمیا) لەو نێوەندەدا وشەی (سەرۆك) هاتوەو دواتر پیتی ناوی (ئۆباما) بە شێوەی جیاواز هاتوەو لە نێوان هەر پیتێك، حەوت پیت هاتووەو ژمارە حەوت پیرۆزیەکی تایبەتی هەیە لە تەورات و ئینجیل، لەلایەکی ترەوە حاخام یۆنی بارنون باس لەوە دەکات ئۆباما ناوی لە دەستەواژەکانی (حەزقیال) هاتووەو لە (ئیصحاح)ی ٣٨ و ئایەتی دووەمدا، هاوکات شەری یەئجوج و مەئجوج لەسەر وەختی دەسەڵات و فەرمانڕەوای ئەودا دەبێت و دوای ئەوە ڕۆژی دوایی بەسەر گۆی زەویدا دێت و لە ماوەیەکی کەمدا حاخامەکان وێنەی تەواوی چۆنیەتی هاتنی ڕۆژی دوایی و مێژوو ڕۆژەکەیان دیار کردووە لە هاتنی دەجال و شەڕی یەئجوج و مەئجوج و حاکم و فەرمانڕەوایانی عەرەب لە دەسەڵات دوور دەخرێنەوە، موسڵمانەکان دەسەڵات دەگرنە دەست و ناکۆکی توند لە نێوان موسڵمانان و جولەکەکان دەست پێدەکات، دواتر لە ساڵی ٢٠٣٥ ڕۆژی دوایی دادێت و خوای گەورە سەرجەم ڕوحی ئادەمیزاد دەکێشێت[١].

---

(١) المجيء الثاني هل هو على الأبواب، مجدي صادق، (لا ٦٦).

• دکتۆرێکی بەهائی وتبوی ڕۆژی دوایی لەساڵی (١٧١٠)عیسایی دێت، ئەمەش وای هەڵبەستابوو، کە ئەمە بە حیسابی ئەبجەدی لە پیتە پچڕاوەکانی سەری سورەتەکانی قورئان هەڵێنجاوە، بەڕاستی ئەمەش بەرنامەیەکی هەڵەیە، چونکە خەڵکانێك لە پێشودا پشتیان بەم بەرنامەیە بەستوەو هیچیش ڕووی نەداوە[1].

لەگەڵ ئەوەش لەناو پیاو ماقوڵانی جولەکەو گاور هەن کە ڕەتی دیاریکردنی هاتنی ڕۆژی دواییان کردووە: (یوسی) دەڵێت: ئەوانەی هاتنی ڕۆژی دوایی دیاری دەکەن هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆیان نییە، هەر یەکێك لە وتەکانی (یوحەنان) و (شەمعون) و (زئیرا) لە هاتنی مەسیحی دەجال گومانی لەسەر نییە، بەڵام بە نیسبەت دیاریکردنی کاتەکەی ئەوە لای خودا کاتەکەی شاردراوەتەوە لە هەموو مرۆڤایەتی، وە کاتەکەی دیاری نەکردووە[2].

لە سەدەی یانزەی عیسایی (یافس لاوی) دەڵێت: هەر وتەیەك کاتی بۆ دیاری کرابێت بۆ هاتنی مەسیح ئەوە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر شکستی کەسایەتی، جار هە کەسێك بێت[3].

(ئیسحاق ئەڕاما) زۆر بە توندی هێرش دەکاتە سەر (بەرحیا) کە کاری کردووە لەسەر ئەستێرەناسی و کاتی دیاریکردنی هاتنی ڕۆژی دوایی و دەڵێت: کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی ڕانەوەستاوە بە هیچ هەسارەیەکی ئاسمانەوە، بەڵکو هەموو بە ئیرادەو مەشیئەتی خوای گەورەیە ڕووداوەکان[4].

---

(١) موعد الساعة، (لا ١٢٤).

(٢) المسيح اليهودي (لا ١٩٢ ـ ١٩٣).

(٣) موعد الساعة، (لا ٦٥).

(٤) نهاية العالم موعد ممجئ السيد المسيح، جوزيف بطرس، (لا ١١٢).

# چارەنووسی زەوی لە ساڵی (٢٠١٢)
# لە نێوان تێکچوون و بەردەوام بوون

ماوەیەك بوو خەڵکی باسیان لە دیاردەیەکی گەردوونی ترسناك دەکرد، کە بریتی بوو لە پیاکێشانی تەنێکی گەردوونی بە هەسارەی زەوی، ئەم دەنگ و باسە نەك تەنها کوردستان، بەڵکو سەراپای جیهانی گرتەوەو جۆرەها سیناریۆی بۆ دارێژرا، کە گوایە لە ساڵی (٢٠١٠) یان (٢٠١٤) زەوی بەشێکی لەناو دەچێت.

کاتێك باس لە زەوی دەکەین، گرنگە پارێزگاری لە مانەوەی بکەین، چونکە چارەنوسی ئێمەی مرۆڤ تا ڕاددەیەکی زۆر بەستراوە بە چارەنووسی هەسارەی زەوی، وا چاکە لەگەڵ ئاو و هەواو کانزاو دارو بەردی ژینگەکەمان بەچاکی مامەڵە بکەین، ئەمە کارێکە لە دەسەڵاتی خۆماندایەو ئاوەدانکردنەوەی زەوی ئەرکی سەرشانی ئێمەی مرۆڤەو دەبێ هەمیشە دژ بەجەنگ و کاولکاری بین[1].

زەوی ئەندامێکی کۆمەڵەی خۆرەو تا ئەمرۆ تاقە هەسارەی ئەم کۆمەڵەیە کە ژیانی تیایە، جگە لە زەوی بەپێی پۆلێنی تازەی هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر کە لەساڵی (٢٠٠٦) دا ئەنجامدرا حەوت هەسارەی تر هەن کە بریتین لە (عەتارد، زوهرە، مەریخ، موشتەری، زوحەل، ئورانوس، نیبتون) ئەمە جگە لە ژمارەیەکی زۆر لە هەسارۆکە کە لەپشتێنەی نێوان مەریخ و موشتەریدان و بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، هەروەها ژمارەیەك مانگ و کلکدارو تەنی گەردوونی ئەم بارودۆخەی ئێستای هەسارەکان لەم کۆمەڵەیەدا سەلامەتی لەسەدا سەدی تا هەتا هەتایە پێ نابەخشێت، بەڵکو دەشێت هێزی کێشکردن و کاریگەری تەنەکان و خێراییە جیاوازەکانیان لە سوڕانەوەدا لە سەدان هەزارو

---

(١) تنبؤات نوسترا داموس، منصور عبدالحکیم، لا ٤٩ .

ملیۆنەها ساڵدا دووچاری ڕووداوی کتوپڕیان بکات، بەڵام دووچاربوونی زەوی بە پیاکێشانی گەورە کە ترس و دڵە ڕاوکێی خستۆتە دڵی خەڵکەوە زیاتر ئەو بەسەرهاتەمان دێنێتەوە یاد کە لەسەرەتاکانی سەدەی پێشوودا ڕوویدا کاتێك کلکداری (هالی) بەلای زەویدا تێپەڕی، خەڵك جۆرێك ترسێنران کە گوایە گازەکەی (هالی) دەگاتە سەر زەوی کە گازێکی کوشندەیەو مرۆڤ تووشی نەخۆشی و ژەهراوی بوونی دەکات، بۆیە هەندێك لەوانەی بازرگانی بەچارەنووسی مرۆڤەوە دەکەن، حەبێکیان خستە بازاڕەوە بەو بیانوەی کە مرۆڤ لە مەترسی هالی دەپارێزێت، بەوەش پارەو سامانێکی زۆریان کۆکردەوە، بەڵام کاتێك (هالی) لە هەشتاکانی سەدەی پێشوودا دەرکەوتەوە خەڵکی هۆشیارتربوون و بەم مەسەلەیە ئیستیغلال نەکران.

ئەوەی لە چەند ساڵی ڕابردوو دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەتایبەتیش زانستیەکان باسیان لێوە کرد[1]، دەرکەوتنی هەسارەیەکی زەبەلاحی بە قەبارەی خۆر بوو، بە گوێرەی ئەم سەرچاوە هەواڵگریانە، ئەم هەسارەیە لە ساڵی (٢٠١٢) لە زەوی نزیك دەبێتەوەو هەموو سیستەمێکی وەکو هێزی کێشکردنی زەوی و ڕاکێشانە فیزیاییەکان لەسەر ڕووی زەوی تێك دەدات و لە ٧٠٪ ی بوونەوەرانی سەر زەوی بۆ خۆی ڕادەکێشێت ئەمەش لەبەر ئەو هێزە موگناتیسیە بەرزەی کە هەیەتی[2].

یەکێك لە تەلەیسکۆبەکانی تایبەت بە ئاژانسی گەردووناسی ئەمریکا کە بە (ناسا) دەناسرێت، هەسارەیەکی نوێی ئاشکرا کرد، دەرکەوتووە قەبارەکەی نزیکە لە قەبارەی خۆرو ناویانناوە هەسارەی (Nibru نیبرۆ) ئەم هەسارەیە بۆ یەکەم جارە لە (٣٠)ی دیسەمبەری ساڵی (١٩٨٣) دەرکەوت، دوای ئەوەی ئاژانسی ناسای ئەمریکی هەستا بە ووردبوونەوەو لێکۆڵینەوە لەم هەسارە نەناسراوە، بۆیان دەرکەوت کە هێزێکی گەورەی موگناتیسی زۆر گەورەی هەیە، بە ڕاددەیەك کە یەکسانە بەو هێزە موگناتیسیەی کە خۆر هەیەتی لە ئەنجامدا بۆیان

---

(١) لە مانگی ٢/ی ساڵی ٢٠١٠، بابەتێکی زۆر بڵاوکرایەوە لە گۆڤارەکان و ڕۆژنامەکان، کە گوایە ساڵی ٢٠١٢ ڕۆژی دوایی بەرپا دەبێت.

(٢) تنبؤات نوسترا داموس، منصور عبدالحكيم، لا ٥٧ .

دەرکەوت کە ئەگەر لە ڕێڕەو یان خولگەی گۆی زەوی نزیك ببێتەوە، ئەوە کارەساتێکی زۆر گەورە بەسەر گۆی زەوی دێت.

بە پێی لێکۆڵینەوە زانستیەکانی ئاژانسی گەردووناسی (ناسا)ی ئەمریکا ئەو هێزە موگناتیسیە زۆرەی کە هەسارەی (نیبرۆ) هەڵیگرتووە کار دەکاتە سەر جەمسەرەکانی گۆی زەوی بە شێوەیەك کە جەمسەری موگناتیسی باکوور دەبێتە باشوور بە پێچەوانەشەوە ڕاستە، ئەمەش وا دەکات گۆی زەوی بە پێچەوانەی ئێستایەوە بسوڕێتەوە بە دەوری خۆیدا، ئەم دیاردە ناوازەیەش لە سوڕانەوەی زەوی بەردەوام دەبێت تا هەسارەی (نیبرۆ) یەك خول تەواو دەکات بە دەوری خۆر و (٤١٠٠) ساڵ دەخایەنێت، ئەمەش دوا جار ئەوەمان بۆ دەردەخات کە خۆر لە ڕۆژئاوا هەڵدێت و لە ڕۆژهەڵاتیش ئاوا دەبێت، بۆیە بەپێی بۆچوونی قورئان و فەرموودە یەکێکە لە نیشانەکانی کۆتایی هاتنی بونەوەر.

زانای ماتماتیکی بیرکاری (هایدۆ ئیتاکاوا) دەڵێت: هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر دەکەونە سەر یەك هێڵ لە دوای خۆر، کە ئەم دیاردەیەش زۆر بەکەمی ڕوودەدات بەڵام دەبێتە هۆی گۆڕانی ژینگە، بەشێوەیەك کە کۆتایی بە ژیان دێت لەسەر گۆی زەوی، ئەم دیاردەیەش لە مانگی دوانزەی ساڵی (٢٠١٢) دەبێت.

زاناکانی چینیش پێشبینیان کردبوو کە سەرەتای کۆتایی هاتنی دونیا لە (١٢)ی دیسەمبەری ساڵی (٢٠١٢) دەبێت.

لە کۆتاییدا ئاژانسی فەزایی ئەمریکی (ناسا) ئەو هەواڵانەی ڕەتکردەوە کە لەم ماوەیەدا سەبارەت بە کۆتایی هاتنی جیهانی بڵاوکراونەتەوە، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، بۆیە (ناسا) لەسەر پێگەی ئەلکترۆنی خۆی تەئکید دەکاتەوە، ئەو دەنگۆیانەی کە دەڵێن: جیهان کۆتایی پێ دێت هیچ بنەمایەکی ڕاست و دروستیان نیەو ئاژانسی ناساش هیچ بەیاننامەیەکی سەبارەت بەو بابەتە بڵاونەکردووەتەوە، بەڵکو هەندێك پێگەو سایتەکانی ئینتەرنێت و بڵاوکراوە بەناوی (ناسا)وە پێشبینی کۆتایی هاتنی جیهانیان کردوە گوایە مانگی (١٢)

ی ساڵی (٢٠١٢)، بەهۆی پێکدادانی گۆی زەوی بەهۆی گەردەلولی خۆری وێرانکەرەوە، گۆڕانکاری گەردوونی ڕوودەدات و لە توانایدایە جیهان بگەڕێنێتەوە بۆ دۆخی سەدەکانی ناوەڕاست[1].

دەستەی زانایانی جیهانی بۆ ئیعجازی قورئان لە بەیاننامەیەکدا بڵاویانکردەوە، کە بوونی هەسارەیەك بە ناوی (نیبرۆ) کە گوایە لە زەوی نزیك دەبێتەوە لە (٢٠٠٩/١٢/٢١) داو دەبێتە هۆی لەناوبردنی (سێ لەسەر چوار) ی دانیشتووانی گۆی زەوی، جگە لە پڕوپاگەندەو درۆ هیچی تر نیە، هەندێك لە فاڵچی و ئەستێرەناسەکان و دەجالەکان وەك پیشەی هەمیشەییان هەڵساون بە بڵاوکردنەوەی ڕوودانی ئەم کارەساتە، بۆ تێکدانی بارودەرروونی خەڵك و تەشویش خستنە ناو خەڵك، کە دواجار دەبێتە هۆی لادانی بیروباوەڕی ڕاستەقینەی خەڵك بەرانبەر بە قورئان.



---

(١) دیڤید مۆریسۆن گەورە گەردونناسی (ناسا) بۆ ڕاگەیاندنەکان دەڵێت : کۆتایی ژیان لە ساڵی (٢٠١٢) دا جگە لە فێڵێکی گەورە هیچی تر نیە، دوای پەرەسەندنی دڵە ڕاوکێی خەڵکی لەسەرتاسەری جیهاندا بەهۆی نزیك کەوتنەوەی هەسارەی (نیبرۆ) لە گۆی زەوی، گەردونناسەکانی ناسا چەندین لێدوانیاندا تا خەڵکی دڵنیا بکەنەوە لەوەی کە هیچ مەترسیەکی گەورە لەسەر ژیانی مرۆڤایەتی نیە.. پرۆفیسۆر (مۆریسون) ئەم دڵنیاییەی لە ڕێگەی کەناڵی (CNN)و سایتی (ناسا)وە دا بە گوێی جیهاندا گوتی: ڕۆژی (٢٠١٢/١٢/٢١) هەروەکو ڕۆژەکانی تری ساڵ وایە، ئەوەشی ڕوونکردەوە کە (ناسا) بە هیچ شێوەیەك ئەگەری ڕوودانی کارەساتێکی لەو جۆرە بە ڕاست نازانێت، بۆیە ئەوەی لە سایتەکان یاخود لە (پێشبینیەکانی شارستانیی کۆنی مایا) هاتووە سەبارەت بە کۆتایی ژیان لە (٢٠١٢/١٢/٢١) دا جگە لە فێڵێکی گەورە هیچی تر نیە، بەتایبەت ئەو کاتە ترس و دڵەڕاوکێی هاوڵاتییان گەیشتە لوتکە لەم بارەیەوە، کاتێك فیلمێك بەناوی کۆتایی ژیان لە ساڵی (٢٠١٢/١٢/٢١) دا کەوتە بازار، بەجۆرێك ئەم بابەتە لە سایتە ئەلیکترۆنیەکاندا ورووژا تا کار گەیشتە ئەوەی کە کاتژمێری نزیك بوونەوە لە سفر دابنێن بۆ ژماردنی کۆتایی خولەکانی ژیان تا ڕۆژی (٢٠١٢/١٢/٢١) .

## ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ سەبارەت به فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ)

هەندێ فەرموودە پێغەمبەر(ﷺ) هەیە، کە خەڵك کێشەی لەسەر دروست کردووەو خەڵك وا گومان دەبات کە ئەم فەرمودانە کاتی هاتنی ڕۆژی دواییان دیاریکردووە، ئەم فەرموودانەش هەندێکیان صەحیحن و هەندێکیشیان صەحیح نین، بەڵام نابنە بەڵگەی ڕاشکاو بۆ دیاریکردنی هاتنی ڕۆژی دوایی.

یەکێ لە فەرموودە هەڵبەستراوەکان کە پێچەوانەیە لەگەڵ دەقی قورئاندا، پێشەوا ئیبنو قەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی ئەم فەرموودەیە دەکات و دەفەرموێ: (وإنها سبعة الاف سنة، ونحن في الالف السابع)[1]. واتە: دونیا حەوت هەزارساڵەو ئێمەش لە هەزاری حەوتەمین.

پێشەوا ئیبنوقەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ:

ئەمە یەکێکە لە درۆیەکان کەوا خەڵك بۆ خۆی هەڵیبەستووە، بەڵگەی تەواوی ئەم فەرموودەیەش هەڵبەستراوو درۆیە.

بێگومان پێشەوا ئیبنو قەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە چەرخی هەشتی کۆچیدا ژیاوەو ئەم قسەیەی فەرموە، بێگومان ئەوا ئەمڕۆ زیاتر لە شەسەد ساڵ بەسەر فەرموودەکەی تێپەڕیوەو بونەوەریش کۆتایی نەهاتووە.

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت:

ئەوەی هاتووە لە پەرتوکەکانی ئیسرائیلی و خاوەن پەرتوکدا لە دیاری کردنی ڕۆژگاری ڕۆیشتوو بە هەزاران و سەدان ساڵ ئەوا زانایان یەك ڕان لەسەر

---

(١) أخرج ابن جرير في مقدمة (تاريخه)، وأخرج عن كعب الأحبار (الدنيا ستة آلاف سنة).. (الإذاعة لما كان وما يكون بين يدي الساعة،السيد محمد صديق حسن القنوجي ،لا ٢٠٤).

بەهەڵەدا چوونیان و هەڵەكردنیان هەروەك سەعیدی كوری موسەیەب دەڵێت: (إِنَّمَا الدُّنْيَا جُمُعَةٌ مِنْ جُمَعِ الْآخِرَةِ)[1].

كە فەرموودەیەكی نادروستە لە ڕووی سەنەدەوە ، بەهەمان شێوە هەر فەرموودەییٚ هاتبیٚ كە كاتی ڕۆژی دوایی دیاری بكات بە ڕوونی ئەوا سەنەدەكەی جێگیر نیە[2].

ئەو فەرموودە صەحیحانەی كە بەڵگە نین بۆ دیاری كردنی كاتی هاتنی ڕۆژی دوایی:

پێشەوا جابری كوڕی عەبدوڵلا (ﷺ) دەڵێت: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: (تَسْأَلُونِي عَنِ السَّاعَةِ؟، وَإِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْدَ اللهِ، وَأُقْسِمُ بِاللهِ مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ تَأْتِي عَلَيْهَا مِائَةُ سَنَةٍ)[3].

واتە: لە بارەی ڕۆژی دوایی لێم دەپرسن، كەچی زانستی هاتنی ڕۆژی دوایی لەلای خوایە، سوێند بە خوا دەخۆم هەر نەفسێكی ئەمڕۆ لەسەر دونیا، تا سەد ساڵی بە سەردا تێدەپەڕیٚ بە زیندویی نامێنێت.

پێشەوا عەبدوڵلای كوری عومەر (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە دوا دوایی تەمەنی شەوێك نوێژی عیشای پێكردین، كاتیٚ كە سەلامی دایەوە و ڕووی لە خەڵكەكە كردو فەرمووی:

(أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ؟ فَإِنَّ عَلَى رَأْسِ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَدٌ)[4].

---

(١) حلية الأولياء وطبقات الأصفياء (٤/ ٢٧٩).

(٢) النهاية في الفتن والملاحم (١/ ١٥).

(٣) صحيح مسلم، (٤/ ١٩٦٦) بَاب: قَوْلِهِ (ﷺ):لاَ تَأْتِي مِائَةُ سَنَةٍ، وَعَلَىَ الأَرْضِ نَفْسٌ مَنْفُوسَةٌ الْيَوْمَ، برقم: (٢٥٣٨).

(٤) صحيح مسلم، (٤/ ١٩٦٥) بَاب: قَوْلِهِ (ﷺ):لاَ تَأْتِي مِائَةُ سَنَةٍ، وَعَلَىَ الأَرْضِ نَفْسٌ مَنْفُوسَةٌ الْيَوْمَ، برقم: (٢٥٣٧).

واتە: لەم شەوەی خۆتان دیوە لەم شەوەوە تا سەد ساڵی دیکە، کەسێك نامێنێ لەوانەی ئێستا لەسەر پشتی زەویدان.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم دوو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) تێدەگەین لەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی هاتنی ڕۆژی دوایی نەبووە، بەڵکو مەبەستی بەسەر چوون و تێپەڕینی ئەو سەدەیە بووە، کە خۆی تێدا بوو، ئەو کاتەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی فەرمووە، ئیبنو عومەریش لەم واتایەی گەیشتبوو بۆیە لە خەڵکیشی دەگەیاند، جا ئەو کات بۆ چوونی جیا جیا دروست بوو لە تێگەیشتنی ئەم فەرموودانە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ﷺ) پاش ئەوەی ئەم فەرمودەی پێشوی پێغەمبەری (ﷺ) هێناوەتەوە دەفەرموێ: خەڵکی لە تاو ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاچڵەکین و بیریان دوور دەڕۆیشت، کە دەربارەی ئەم فەرمودانە دەدوان و باسی دەوروبەری سەد ساڵانیان دەکرد، بەڵام کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَحَدٌ)[1]. واتە: هیچ کەسێك نامێنێت لەوانەی کە ئێستا لەسەر پشتی زەویدان.

مەبەستی ئەم فەرمودەیە ئەوەیە کە ئەو سەدەیە بەسەر دەچێ و خەڵکەکەی لەناو دەچن و دەمرن.

خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: دەشتەکیەکان دەهاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی ڕۆژی دوایی پرسیاریان لێ دەکردو دەیانگوت: کەی دێت؟

پێغەمبەریش(ﷺ) سەیری بچوکترین مرۆڤی لەوان دەکردو دەیفەرموو: (إِنْ يَعِشْ هَذَا، لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ، قَامَتْ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ)[2]. واتە: ئەگەر ئەمە بژی پیر نابێ تا ڕۆژی دوایی دادێ.

---

(١) صحيح مسلم، (٤/ ١٩٦٥) بَاب: قَوْلِهِ (ﷺ):لاَ تَأْتِي مِائَةُ سَنَةٍ، وَعَلَى الْأَرْضِ نَفْسٌ مَنْفُوسَةٌ الْيَوْمَ، برقم: (٢٥٣٧).

(٢) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٦٩) باب: قرب الساعة، برقم: (٢٩٥٢).

پێشەوا هیشام (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) دەڵێ: مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە واتە: دەمرن، چونكە هەر كەسێك كە مرد ڕۆژی دوایی بەسەر دادێت، (مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ)[1].

خودای گەورە لە هەموو كەس زاناترە بە هاتنی ڕۆژی دوایی، هەروەكو دەفەرمویّ: [ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ ][2].

واتە: ئایا ئەوانە مەگەر چاوەڕێی هاتنی ڕۆژی دوایی ناكەن كەوا لە ناكاو دەرگایان لیّ بگرێت، بێگومان هەندێ لە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی هاتوونەتە پێش و دەركەوتون.

شاعیری بە ناوبانگ (ئەبو ئەسوەد) دەڵێت :

فإن كنت قد أزمعت بالصرم بيننا فقد جعلت أشراط أوله تبدو[3]

واتە: ئەگەر تۆ بڕیاری لێكدابڕانت لە نێوماندا داوە

ئەوا هەر لەسەرەتاوە نیشانەكانیت ئاشكرا كردوە

---

(١) حلية الأولياء، (٦/ ٢٦٧).

(٢) سورة محمد، الآية: (١٨).

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة، محمد بن رسول البرزنجي، لا ٣٢ .

# موعجیزەیەکی ژمارەیی قورئانی
# لە سورەتی (القیامة)

دەتوانین ئیعجازێکی ژمارەیی قورئانی بخەینە ڕوو لە ڕووداوی ڕۆژی دوایی، خوای پەروەرگار دەفەرموێ: [لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ][1].

ئیعجازی ژمارەیی قورئان لەبابەت ڕۆژی دوایی لەم ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێت، ئەو سورەتانەی بەناوی (قیامەت)ەوە ناونراون هەریەکەو موعجیزەیەکی تایبەتمەنتدی خۆی هەیە کە ئەمانەن:

• وشەی (القیامة) ناوی سورەتێکە لە سورەتەکانی قورئان، ئەو سورەتانەی کە ناوەکەیان یەکێکە لە ناوەکانی (قیامەت) پێنج سورەتن کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن (الواقعة: ٥٦)، (الحآقة: ٦٩)، (القیامة: ٧٥)، (الغاشیة: ٨٨)، (القارعة: ١٠١).

(القیامة) ناوە سەرەکیەکەیە، ئەوانی تر ناوی قیامەتن، سورەتی (القیامة) ناوەڕاستیانە لە ڕووی درێژی و ژمارەی ئایەتەوە مام ناوەندیترینیانە، ئەگەر لە سورەتی (الواقعة)وە بەرەو پێشەوەی قورئان (١٣) سورەت بژمێرین ئەوا دەگەین بە سورەتی (الحاقه): ( ٥٦ + ١٣ = ٦٩).

زنجیری سورەتی (الحآقة) لە (مصحف) دا.

بە هەمان شێوە لە سورەتی (القیامة)وە بەرەو پێشەوەی قورئان (١٣) سورەت بژمێرین ئەوا دەگەین بە سورەتی (الغاشیه): (٧٥ + ١٣ = ٨٨).

---

(١) سورة القیامة، الآیة: (١-١٠).

زنجیری سورەتی (الغاشیة) لە (مصحف) دا.

بە هەمان شێوە لە سورەتی (الغاشیه)وە بەرەو پێشەوە لە قورئاندا (١٣) سورەت بژمێرین ئەوا دەگەین بە سورەتی (القارعة): (٨٨ + ١٣ = ١٠١)[1].

زنجیری سورەتی (القارعة) لە (مصحف) دا.

ئەگەر لە سورەتی (القارعة)شەوە بەرەو پێشەوە لە قورئاندا (١٣) سورەت بژمێرین ئەوا دەگەین بە سورەتی (الناس) کە دوا سورەتە لە قورئاندا: (١٠١ + ١٣ = ١١٤).

زنجیرەی سورەتی کۆتایی کە سورەتی (الناس)ە، بە دەربڕینێکی تر ماوەی نێوان سورەتی (الواقعة) و سورەتی (الحآقة) (١٢) سورەتە، هەروەها ماوەی نێوان سورەتی (القیامة) و سورەتی (الغاشیه) (١٢) سورەتە، هەروەها ماوەی نێوان سورەتی (الغاشیه) و سورەتی (القارعة) (١٢) سورەتە، ماوەی نێوان سورەتی (القارعة) و سورەتی (الناس) (١٢) سورەتە.

• ئەگەر لە هەر پێنج سورەتەکە بکۆڵینەوە بۆ ئەوەی گشت ئەو ئایەتانە دەست نیشان بکەین کە ناوی سورەتێك یان زیاتر لەم پێنج سورەتەیان تێدا هاتووە، واتە: یەکێك یان زیاتر لەم وشانەیان تێدا هاتووە کە بریتین لە سورەتی (الواقعة)، (الحآقة)، (القیامة)، (الغاشیة)، (القارعة).

پاشان ڕەنوسی گشت ئەو ئایەتانەی کە دەست نیشانمان کردوون کۆبکەینەوە ئەوا سەرجەمیان دەکاتە (٤٠) هێندەی ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (القیامة).

• سورەتی (القیامة) (٤٠) ئایەتە هەندێك ڕووداو هەن پەیوەندیان بە قیامەتەوە هەیەو ماوەکەیان (٤٠)ە، وەك ماوەی نێوان هەردوو فووکردنەکە بە (صور) دا، بەڵگەشمان ئەم فەرموودەیەیە کە ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ قَالَ: أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالَ: أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالَ: أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْت)[2].

---

(١) تابلۆ ناوازەکان، نووسینی نوعمان مەلا مستەفا حەمە ڕەحیم سەر گەتی، چاپی یەکەم.

(٢) صحیح البخاري، (٦/ ١٦٥) کتاب: التفسیر، باب: یوم ینفخ في الصور، برقم: (٤٩٣٥).

واتە: ماوەی نێوان هەردوو فووکردنەکە بە صوردا (٤٠)ە، گوتیان: ئەی ئەبوهوریرە ئایا (٤٠) ڕۆژە؟ ئەبو هورەیرە فەرمووی: نامەوێت دەری بڕم، گوتیان: (٤) مانگی فەرمووە؟ فەرمووی: نامەوێت دەری بڕم، گوتیان: (٤٠) ساڵی فەرمووە؟ فەرمووی نامەوێت دەریبڕم.

لە ئایەتی (٤٠)ی سورەتی (القیامة) واتاکەی پەیوەندی بە زیندوو بوونەوە هەیە، کە خوای پەوەردگار دەفەرموێ: [أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ].

لەگەڵ تەواوبوونی سورەتی (القیامة) دا لە کۆتایی ئایەتی (٤٠)دا دەستەواژەی [أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ] دێت، کە واتای زیندوو کردنەوەی مردووان دەگەیەنێت (لەلای خوای پەروەردگارەوە)، لە ڕوویەکی ترەوە، دەبینیت کە بە گوێرەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەڵکی لە ڕۆژی دوایی دا (٤٠) ساڵ ڕادەوەستن، بەڵگەشمان ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە دەفەرموێ: (يَجْمَعُ اللَّهُ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ لِمِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ قِيَامًا أَرْبَعِينَ سَنَةً شَاخِصَةً أَبْصَارُهُمْ إِلَى السَّمَاءِ يَنْتَظِرُونَ فَصْلَ الْقَضَاءِ)[1].

واتە: خوای پەروەردگار هەرچی ئادەمیزاد هەیە لە پێشینەکان و پاشینەکان کۆیان دەکاتەوە لە شوێنێك (کە ڕۆژی مەحشەر)ە، لە ڕۆژێکی زانراودا بە پێوە ڕادەوەستن بۆ ماوەی (٤٠) ساڵ چاویان بڕیوەتە ئاسمان چاوەڕێی دادگایی و یەکلاکردنەوە دەکەن.

پیتی (م) لە وشەی (القیامة). پیتی (م) بە حیسابی جوممەل = ٠٤٠ م = ٤٠ =، ژمارەی میمەکانی سوورەتی (القیامة) = ٤٠ م ٠ ئەوەندەی ژمارەی ئایەتەکان[2].

---

(١) المعجم الكبير للطبراني (٩/ ٣٥٧) برقم: (٩٧٦٣).

(٢) تابلۆ ئاوازەکان، لا ٢١١، نووسینی نوعمان مەلا مستەفا حەمە ڕەحیم سەر گەتی، چاپی یەکەم.

# تێکچوونی هاوسەنگی ئاسمان

تێکچوونی هاوسەنگی ئاسمان بەڵگەیەکی ڕوونە سەبارەت بە نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر..

خوای گەورە دەفەرموێ: [إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ]. واتە: کاتێ ئاسمان کەرت بوو.

[قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ].

واتە: بڵێ: گەر بینیتان ئاوەکانتان نقوم بوون (وشك بوون) کێ ئاوەکی سازگارتان بۆ دێنێتەوە.

## موعجیزەیەکی زانستی نوێ لەم بارەیەوە:

مەسەلەی هاوسەنگی بونەوەرو پێکهاتەکانی و تێکچونی هاوسەنگی بونەوەر بە تایبەتی چینی هەواو پیس بونی ژینگە یەکێکە لە بابەتە گرنگە زانستیەکانی ئەمڕۆ کە بوەتە جێگای سەرەنج و بایەخ پێدانی زانایانی هاوچەرخ، جێگای ئاوەڕدانەوەیە قورئانی مەزن بەر لە زانستی ئەمڕۆ باسی دەکات، کە خودا بونەوەرو ژیانی بە هاوسەنگی و وردەکاریەکی دیاری کراو دروست کردوەو مرۆڤی وشیار کردۆتەوە کە وریابن نەکەن دەستی کاولکاری و تێکدانی تێدا بگێڕن و ئەو هاوسەنگیە زیان پێ بگەیەنن، چونکە قڕ لە ژیان دەخات و مەترسی بۆ سەر بونەوەر پەیدا دەکات، بەڵام بەداخەوە مرۆڤ گوێ بۆ ئەم پەیامە مەترسیدارە شل ناکات و ئەو هاوسەنگیە لە بەین دەبات[1].

پرۆ فیسۆر (فرانك ئالن/ سروشتناسی بیۆلۆجی) لە ئەمریکا دەڵێت: گونجانی زەوی بۆ ژیان زۆر شێوە وەردەگرێ، کە ناکرێ لەسەر بنەمای ڕێککەوت یان

---

(١) مبادیء علم البیئة، بریج کوبال، ان. بها دواج، ت.د.ریزان محمد صالح، السید بشیر علي بشیر نعمة، ١٩٩٠، جامعة صلاح الدین.

هەرەمەکی لێك بدرێتەوە، زەوی گۆیەکی هەڵواسراوە لە زەویداو بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بەوەش وەرزەکان بە شوێن یەکتریدا دێن کە بەدەوری خۆی ڕوبەری بەشی باش بۆ ژیانی دانیشتوان فرەوانتر دەکات لە هەسارەکەمانداو جۆری ڕووەکەکان زۆر لەوە زیاتر دەکات، کە لە زەویەکی وەستاودا بونایەو بەرگەکەی گازی بۆ ژیان دەوری زەویان داوەو بۆ بەرزایی (٥٠٠) میل پتر بەرزبۆتەوە، چڕی ئەو گازانە لە ئاستێ دایە، بوار نادات شوهبە کوشندەکان لە ڕۆژانە بە خێرایی (٣٠ میل/ چرکە) بەرەو ڕومان دێن.

(بریج کوبال و ان. بمار دواج) لەبارەی تێکچوونی هاوسەنگی هەواو پیس بوونی ژینگە دەنوسن: پیس بوون (التلوث Pollution) گۆڕانەکی نەویستراوی سیفاتی فیزیایی و کیمایی و بایەلۆجی هەوایی و ئاو و خاکە، کە زیان بە مرۆڤ و زیندەوران و توخمەکانی ژینگەی سروشتی مرۆڤ دەگەیەنێ، هەروەها بە هەموو مادده پیسکەرەکان دەگوترێ: پیسکەرەکان، پیس کردن بۆ مرۆڤ تازە نیە کردارەکانی شیبونەوە کە لە سروشتدا ڕوودەدەن هەندێ گازی زیانبەخش پەیدا دەکەن، هەندێ لە زیندەوەران ژەهر دروست دەکەن، دیسان تۆزو خۆڵ کە با دەیهێنێ و دەنکە هەڵاڵەکانی ناو هەوا زیان بە مرۆڤ دەگەیەنن، دیسان زۆر ماددەی بە کەڵك هەیە، گەر بە ڕاددەیەکی دەگمەن هەبن سود بەخش بن، بەڵام گەر بە بڕەکی زۆر هەبن زیان بەخش دەبن، هەروەها ئۆزۆن ڕۆڵەکی گرنگ دەبینێ لە پاراستنی ژیاندا لە چینی ستراتۆسفیردا لە تیشکی سەر بنەوشەیی، بەڵام بونی لە هەوادا گیاندارو ڕووەك لەناو دەبات، بەو ڕەنگە کاتێ پیس بوون ڕوودەدات کە کەرستەکان لە جێی خۆیان نین و لە ڕێژەی سروشتیدا نین[1].

زانای گەورەی ئەمریکی (کریسی مۆریسۆن) دەڵێ: چۆن ڕابردوو مانگ لە زەوی جیابۆتەوە، جارەکی تریش مانگ بۆ باوەشی زەوی دەگەڕێتەوە[2].

---

(١) مبادئ علم البيئة، بريج كوبال، ان. بها دواج، ت.د.ريزان محمد صالح، السيد بشير علي بشير نعمة، ١٩٩٠، جامعة صلاح الدين.

(٢) العلم يدعو للإيمان، لا : ٦٦.

## گرنگترین بابەتە ژینگەیەکان کە بەڵگەن لەسەر تێکچوونی بوونەوەر زیادبوونی ئۆکسجین

دەبێت ڕۆژێك بێت زەوی بەجێ بهێڵین و گەردوون کۆتایی بێت.. چونکە زیادکردنی ئۆکسجین بە ڕێژەی ١,٠، بە شێوەیەکی زۆر هێواش ڕوویدات، ئێمە نەتوانین بەئاسانی هەستی پێ بکەین، بەڵام هەر زوو تێبینی ئەوە دەکەین کە ڕووداوە سروشتیەکانی سووتان بەڕێژەی لە سەدا هەفتا زیاد دەبن، وە ئۆکسجین توخمێکی سەرەکییە لە زۆربەی کارلێکە کیمیاییەکانی تایبەتن بە کرداری سووتان..

ئەگەر ئۆکسجین زیاد بێت، ئەوا ژمارەی گەردەکانی ئۆکسجینیش لە چینی ئۆزۆن زیاتر دەبێت، بۆیە چینی ئۆزۆن ئەستورتر دەبێت و ناهێڵێت تیشکێکی زۆر لە تیشکی سەرو وەنەوشەیی بگاتە سەر ڕووی زەوی و بەم شێوەیەش ژمارەی تووشبووان بە نەخۆشی شێرپەنجەی پێست بەرەو کەمی دەچن.

ڕێکخراوی گیرنیسی چالاك لە بواری داکۆکی کردن لە ژینگە، داوا لە هەموو کەسێ دەکات فشار بخەنە سەر حکومەتەکانیان تا دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کەم بکەنەوە تا سیناریۆی ئەو کارەساتانە لە ڕاپۆرتەکاندا هاتوون نەبێتە ڕاستی.

وە بەردەوامبوونی سەرچاوە سروشتییەکان و سیستەمی ژینگەییەکان مایەی بەردەوامبوونی ژیانە، لەلایەکی دیکەوە هەر پێویستە بزانین کە کاریگەری کۆبونەوەی دوانۆکسیدی کاربۆن و قەتیس بوونی گەرمی و ترشە باران.. هتد، هەموویان هەڕەشەن لەسەر بەردەوامبوونی سەرچاوە سروشتییەکان، وە گەر تاودانی زەوی زیاتر بکرێت لە ئەنجامی زیادبوونی هێزی تاودان، کێشی هەر شتێك لەسەر ڕووی زەوی زیاد دەبێت، بەڵام لە هەمان کاتدا زیانی خەیاڵیش پەیدا دەبێت، زیادبوونی هێزی تاودانی زەوی بەڕێژەیی لەسەدا یەك بریتییە لە کۆتایی هێنانی ژیان لەسەر ڕووی زەوی.

بەشی یەکەم

## کونبوونی چینی ئۆزۆن :

چینی ئۆزۆن یەکێکە لەو چینانەی کە دەوری گۆی زەوی داوە بۆ پاراستنی کاریگەری تیشکی خۆر، کاتێك تیشکی خۆر لە زەوی دەدات، ئەو چینە بەشێك لە تیشکی خۆر دەمژێت، چونکە گەیشتنی تیشکی خۆر بۆ سەر زەوی بەرێژەیەکی زۆر کاریگەری لەسەر پێستی مرۆڤ دەبێ و دووچاری شێرپەنجەی دەکات.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ][1]. واتە: کاتێ ئاسمان کەرت بوو.

لە ئایەتێکی تردا باس لە کونبوونی چینی ئۆزۆن و پیسبوونی ژینگەو ڕوودانی کارەساتی گەورەو کۆتایی ژیانی سەر زەوی دەکات و دەفەرموێ: [فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ ][2].

زاناکان لەو باوەڕەدان کە سەردەمی کۆن خڕۆکەی زەوی گەرمبووە، ئاو لەسەر ڕووەکەی نەبووە بەڵکو هەڵمی ئاو لە ئاسمانەکەی زۆر بووە، تیشکی سەرووی بنەوشەیی گەردیلەکانی هەڵمەکەی لە یەکتر ترازاندووەو کردوونی بە هایدرۆجین و ئۆکسجین هایدرۆجینەکە سووکە چونکە هەورازە، بەڵام ئۆکسجینەکە هاتۆتە سەر زەوی و ئاسمانەکەی، سەرەنجام ژیان لەسەر زەوی پەیدابووە، ئێستا بەهۆی کونبوونی چینی ئۆزۆن کە بەرەبەرە لەبەر پیسبوونی ژینگە زیاد دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی هاتنی هەمان تیشك لە ڕێژەی زۆر بۆ سەر زەوی، ئەمەش وا دەکات بەخێرایەکی زۆر ئاو لەسەر زەوی ببێتە هەڵم و باران نەبارێ[3].

---

(١) سورة الإنشقاق، الآية: (١).

(٢) سورة الرحمن، الآية: (٣٧).

(٣) گۆڤاری خاك، باپیرمان چۆن پێی گرتوە، ژ (٥٠)/ ٢٠٠١ ل٤١-٤٣، ئاوات ع.

بەرگی یەکەم

مەترسی کونبوونی ئەو چینە چەند وڵاتێکی گەیاندە ئەو باوەڕەی کە ڕێککەوتننامەیەك بۆ ڕێگەگرتن لە کونبوونی ئەو چینە مۆر بکەن، بۆیە ڕێککەوتنامەی (مۆنتریال) دامەزراوەو (١٩٣) وڵات تێیدا ئەندامن.

بەپێی ئەو ڕێککەوتنامە جیهانیە هەموو ئەو ماددانەی کە دەبنە هۆی کونبوونی چینی ئۆزۆن دەستنیشان کراون، هەروەها ئەو کارگە پیشەسازییانەش دەسنیشانکراون کە دەبنە هۆی دروست بوونی ئەو مادده کونکەرانە، لە هەمان کات بەپێی ڕێککەوتنامەکە هاوکاری دارایی و هونەری ئەو وڵاتانە دەکرێ، کە ئەندامی ڕێککەوتنامەکەن.

ئەو ماددانەی کە زیانیان هەیە بۆ چینی ئۆزۆن بریتین لە گروپی (CFCs.. HCFCs.. CCl) گازەکانی ساردکەرەوە، گروپی فۆم، گروپی ئارۆسۆلات، گروپی مەسیل برۆماید، گروپی هالونات.

ئێمە ئەو ئۆکسجینەی هەڵی دەمژین لە دوو گەردی ئۆکسجینی پێك دێ، گازێکی بێ تام و ڕەنگ و بۆنە، کاتێ پریشکی کارەبایی لە هەوادا ڕوودەدات، هەندێ گەردی ئۆکسجینی بۆ جۆرە ئۆکسجینەکی تر هاندەدات لە هەوادا ڕوودەدات، هەندێ گەری ئۆکسجینی بۆ جۆرە ئۆکسجینەکی تر هاندەدات کە زۆر چالاکترە بە ناوی ئۆزۆن، بۆنەکی تیژی هەیەو لە کاتی هەورە تریشقەدا بۆنی دێت[1].

گازی ئۆزۆن ڕێژەی لە ٪٩٠ لە چینی (ستراتۆسفێر)دایە کە (١٢-٥٠) کم لە ڕووی زەوییەوە بەرزەو لە ٪١٠ ی دەکەوێتە چینی (ترۆپۆسفێر) کە نزیکەی (١٢-١٠)کم لە ڕووی زەوییەوە بەرزە.

ئۆزۆن فۆرمێکی تایبەتە لە ئۆکسجین، هەر (مۆریکیولێکی) ئۆزۆن لە سێ ئەتۆم ئۆکسجینی بە یەکەوە بەستراو پێکهاتووە.

کاری گازی ئۆزۆن مژین و نەهێشتنی پەڕینەوە یان گەیشتنی تیشکەکانی (ئولتراڤیولیتی) سەرووی وەنەوشەیی تیشکی خۆر، کە درێژی شەپۆڵەکانیان

---

(١) کنوز العلم، ولیم فرجارا، ت. د.السید رمضان هدارة، لا ٢٦٢.

لە نێو (٢٨٠-٣٢٠) نانو مەترەو وزەیەکی زۆری تێدایە بۆ سەر زەوی، ئەو تیشکانەش ئەبنە هۆی فەوتان و شێوانی (مۆلیکیولە) بایۆلۆجیەکان وەکو خانە بۆ ماوەکان و پرۆتین و ئەگەری تووشبوونی پێست بەنەخۆشی شێرپەنجەی پێست و لاوازکردنی سیستەمی بەرگری و کۆمەڵێ نەخۆشی تر، جگە لەوەی زیانەکانی ئەم تیشکە جیهانی ڕووەك و ئاژەڵیش دەگرێتەوە.

لەگەڵ تەنکبوونەوەی چینی ئۆزۆن لە (ئەتمۆسفێر)دا دەرفەتی تێپەڕبوونی تیشکی سەرووی وەنەوشەیی بۆ سەر زەوی زیاتر دەبێت و بەمەش هەڕەشەی زیانەکانی بۆ بوونەوەر ئاکامی خراپتری لێدەکەوێتەوە.

لە کاتێکدا گازی ئۆزۆن ژیانی زیندەوەر لەسەر گۆی زەوی دەڕەخسێنێ بە بوونی وەك فلتەرێك بۆ پاڵاوتەکردنی تیشکی خۆرو مژینی تیشکی سەرووی وەنەوشەیی پێش گەیشتنی بەسەر ڕووی زەوی، لەهەمان کاتدا بوونی بە ڕێژەی (٤٠) مللگرام بۆ مەتر سێجا هەست بە بوونی دەکرێت و لە (٤٠٠) مللگرام بۆ مەتر سێجا لەسەر ڕووی زەوی کاریگەری بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ هەیەو مرۆڤ توشی کێشەکانی کۆئەندامی هەناسەدان دەکات، وەکو هەناسە تەنگی و کۆکەی وشك و سووتانی دیواری ناوەوەی کۆئەندامی هەناسەدان و فەوتانی دارستان و کەمبوونەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی، بۆیە گازی ئۆزۆن ناڕاستەوخۆ بەشدارە لە گەرمبوونی گلۆبالی گۆی زەوی و گۆڕانی کەش و هەوا[١].

گەورەبوونی جەمسەری ئۆزۆن کە چینێکی زەوی دەپارێزێ لە لەناوچوون نزیکە، زانایان دەڵێن:

کونێکی زۆر گەورە دروست بووە لە چینی ئۆزۆن کە خەریکە دونیا بەرەو کۆتایی ببات.

ئۆزۆن (ozone) گازێکی ژەهراوی و ڕەنگ ئاوییەو بەرەو شین دەڕوانێت، هەر گەردێکی ئۆزۆن لە سێ گەردیلەی ئۆکسجین O3 پێك دێت، ئۆزۆن لە

---

(١) کنوز العلم، ولیم فرجارا، ت. د.السید رمضان هدارة، لا ٢٦٣.

هەردوو چینی هەوای خوارو و ترۆپۆسفیر (Troposphere) و چینی هەوای سەرو ستراتۆسفێر (Stratosphere) هەیە.

چینی ئۆزۆن ئەرکی پاراستنی زەوییە لە تیشکە زیانبەخشەکانی ڕۆژ وەك تیشکی سەرو و بنەوشەیی، کاتێك چڕی ئۆزۆن لەو چینە کەم دەبێتەوە، توانای مژینی ئەم تیشکەی کەم دەبێتەوەو هەندێکی بەرەو زەوی تێدەپەڕێت، ئەمەش پێی دەوترێت (تونێلەکانی ئۆزۆن).

زیانەکانی داخورانی چینی ئۆزۆن یان بوونی تونێلێك لەچینی ئۆزۆن، دەکرێ بەم شێوەیە پوختی بکەینەوە :

١- بڵاوبوونەوەی شێرپەنجەی پێست: داخورانی چینی ئۆزۆن دەبێتە هۆی زیادبوونی بڕی تیشکی سەرو وەنەوشەیی گەیشتوو بەزەوی، بەمەش تێکڕای توشبوون بەشێرپەنجەی پێست زیاد دەکات.

٢- کاریگەرییە بۆماوەییەکان: لەکارکەوتنێك لە ترشەلۆکی (D.N.A) ئەگەر تیشکی سەرو وەنەوشەیی بەر پێست بکەوێت، کار لەو چینە دەکات کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر پێستی دەرەوە کە پێی دەڵێن: (Epidermal) و دەبێتە هۆی لەکارکەوتنی ترشەلۆکی ناووکی (D.N.A)، ئەمەش دەبێتە هۆی دابەشبوونی خانەکان و دروستبوونی ئاوسان[1].

٣- ڕوودانی ئاوی سپی لەچاودا دزەکردنی تیشکی سەرو وەنەوشەیی بەرەو ڕووی زەوی دەبێتە هۆی تاریکاییەك لە چاو کە بە ئاوی سپی ناسراوە.

٤- کاریگەریی لەسەر بەرهەمە کشتوکاڵییەکان: تیشکی سەرو وەنەوشەیی زیانی زۆر بە بەرهەمە کشتوکاڵیەکان دەگەیەنێت و وادەکات بەرهەمە کشتوکاڵییەکان کەم بێتەوە.

---

(١) کنوز العلم، ولیم فرجارا، ت. د.السید رمضان هدارة، لا ٢٦٤.

٥- كاریگەریی لەسەر كەش و هەوا: بوونی تونێلی ئۆزۆن هاوسەنگیی بەرگی هەوایی تێكدەدات و دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرماو دواتریش قەتیسبوونی گەرمی.

٦- ڕوودانی چەندین نەخۆشی دیكەی وەك : پیری زوو، ژەهراوی بوونی خوێن، داهێزرانی دەمار، پێست زۆر زوو چرچ و لۆچی لیٚ پەیدا دەبێت[1].

زانایان دەڵێن: جەمسەری ئۆزۆن ئەوەندە گەورە بووە، كە بە پانتایی گۆڕەپانی ئەمریكای شیمالی دەپێوریٚ ئەمەش كاریگەریەكی زۆری هەیە لەسەر دەروونی مرۆڤایەتی وەكو نەخۆشی شێرپەنجە ... هتد.

بـــەرگەكانی ئـــۆزۆن:

بەرگەكانی ئۆزۆن دەكەوێتە ناو چینی ستراتۆسفیرەوە (١٠-٤٠)كم و بەر پرسە لە بەرگرتن لە شەپۆلە بەرزە یان بەخشتەكانی تیشكی سەرو وەنەوشەیی و ڕێگرتن لە ئاراستە بونیان بۆ ناوەوە، دۆزینەوەی چۆنێتی لەناو چوون و زیان لێكەوتنی ئەم چینە دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو زانای كیمیایی ئەمریكی (شیرود رونالد Sherwood Rowland) و (ماریۆ مولینا Mario Molina) كە پێشینەیەكی زانستیان هەبوو، لە ساڵی (١٩٧٤) دا دەربارەی دیاردەی ونبوون (لە ناوچوون) ی چینی ئۆزۆن بۆ یەكەم جار ئاگاداریاندا لە مەترسی ئۆزۆن لەسەرتاسەری جیهان لەسەرەتای هەشتاكاندا كە ٧٠٪ ی لەناوچوو بوو لەسەر جەمسەری باشور و ٣٠٪ لەناوچوون بۆ لەسەر جەمسەری باكور، لە ساڵی ١٩٩٥ خەڵاتی نۆبڵیان پیٚ بەخشی لە كیمیادا، لە ئەنجامی لێكۆڵینەوە بەرز و جوانەكانیان لە بواری كیمیایی ئاوو هەوادا.

هەر چەندە ئەو كونەی كە لە توێژی ئۆزۆندایە بچووك بۆتەوە، بە بەراورد لەگەڵ ساڵی (٢٠٠٦) دا كە نزیكەی (٢) ملیۆن كم چوار گۆشە بووە، بەڵام ڕووبەری ئێستای هێشتا نزیكەی ڕووبەری ئەمریكای باكور دەبێت[2].

---

(١) كنوز العلم، ولیم فرجارا، ت. د.السید رمضان هدارة، لا ٢٦٦.

(٢) رادیۆیی بی بی سی ٢٠/١٠/٢٠٠٧.

تێکڕا ئەستوری توێژی ئۆزۆن مەزەندە دەکرێ بە ٣٠٠ دۆبسن (١ دۆبسن = ٣ ملم)، و هەر ڕوبەرێك خەستی ئۆزۆن تیایدا کەمتر بێت لە (٢٢٠) دۆبسن ئەوا ئەو ڕوبەرە دادەنرێت بە بەشێك لە دەلاقەکە.

شایەنی باسە کە ڕێکەوتننامەی (مۆنتریاڵ) بۆ پاراستنی بەرگی ئۆزۆن ڕێگری دەکات لەبەرهەم هێنان و بەکارهێنانی ئەو کەرەستانەی کە زیان بە ئۆزۆن دەگەیەنن، کە یارمەتی دەرن بۆ پاراستنی ئۆزۆن و کەمکردنەوەی گەرمبوونی گۆی زەوی.

بەڕێزم.. بزانە کە زانایانی بوارەکانی ژینگە، پاش گفتوگۆکردنێکی چەندین ساڵانە گەیشتنە ئەوەی کە بە ڕاشکاوی جاڕ بدەن کە ئێمەی مرۆڤ بە دەستی خۆمان هەسارەکەمان گەرم دەکەین، خۆمان و منداڵمان و هەسارەکەمان خستۆتە ژێر مەترسیەوە.

# زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و ڕاستیە ترسناکەکان

زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی زەوی بەڵگەیەکی گرنکە بۆ نزیکبوونەوەی لەناوچوونی مرۆڤایەتی.

لە دوا ئامارە رەسمیەکانی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی پسپۆڕان و شارەزایان لە بوارەکانی ڕێکخستنی کاروباری خێزان دەڵێن: لە ماوەی (٣٠)ساڵی داهاتوودا ژمارەی دانیشتوان بە شێوەیەکی مەترسیدار ڕوو لە زیادبوون دەکات.. شارەزایان دەڵێن: برسێتی و گرانی و قات و قڕی باڵ دەکێشێ بەسەر وڵاتە هەژارەکاندا.

پسپۆڕە ئەمریکیەکان لە پەیمانگای لێکۆڵینەوە مرۆییەکان دەڵێن: زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان لە (٨٠٪)ی لە وڵاتە هەژارەکان و جیهانی سێهەمەوە دەبێت کە بەشێوەیەکی نارێك و نادروست و خێرا لە دایکبوونیان تیا بڵاوە.. لەلایەکی ترەوە (واڵتەر فۆرنۆس) سەرۆکی پەیمانگای ئامادە کارییەکان بۆ لێکۆڵینەوەو گەڕان بە دوای زانستەکانی ئاماری دانیشتوان دەڵێ: لە ماوەی (٢٥) ساڵی داهاتوو (٣) ملیار ئامادەیە و (٢) ملیار منداڵیش لە دایك دەبن، بە تایبەتی لەو وڵاتە بێ دەرامەتانەی موچەی تاکی ڕۆژانە یەك دۆلار تێناپەڕێ، بە گشتی ڕێژەی زیادبوون لە ساڵێکدا دەگاتە (٢٣٠) ملیۆن کەس و ئەمەو ئامارە رەسمیەکانی ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی پێیان وایە پاش ساڵ و نیوێك ژمارەی دانیشتوانی سەرگێتی دەگاتە (٦) ملیار کەس، هێشتا وڵاتانی ئەفەریقیا لە پێشەوەی وڵاتانی تری جیهانن بۆ زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان.. هەروەها لێکۆڵینەوەو توێژەرەکانی ئامار وایان نیشان دەدا کە وڵاتانی (نێجریا و ئێران و عێراق و سلفادۆر و نیکاراگوا و سوریا) لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا بە ڕێژەیەکی خێرا ژمارەی دانیشتوانیان زیاد دەکات[1].

---

(١) ئایندەی هەسارەکەمان، شەماڵ عبدالرحمن موفتی پیر خدری، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

بەرگی یەکەم

(تۆماس مالوس) لە ساڵی ١٧٩٨ هەواڵی ڕوودانی ئەم سیناریۆیەی دابوو لەو کاتەی کە گوتی: ڕۆژێك لە ڕۆژان زیادبوونی دانیشتوان زیاتر دەبێت لە توانای زەوی بۆ دەستەبەر کردنی خۆراك، ئەمەش نارەحەتی گەورە بۆ مرۆڤایەتی دروست دەکات.

دەرەنجامە ترسناکەکانی زۆربوونی دانیشتوان :

١- زیادبوونی پێویستی بە خۆراکی زیاتر.

٢- زیادبوونی فشار لەسەر سەرچاوە سروشتیەکان بۆ دابین کردنی زیادبوونی پێداویستی مرۆیی لە سوتەمەنی و بەرد.

٣- بەرزبوونەوەی بەردەوامی پلەی گەرمی ئاو و هەوا، کە دەبێتە هۆی زیادبوونی خێرایی توانەوەی چین و بارستە بەفرییەکان لە هەردوو جەمسەری زەوی. زیادبوونی ڕێژەی گازە گەرمکەرەوەکان، بە تایبەتی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بوەتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای هەوای دەوری زەوی لەسەدەی ڕابردوودا بە ڕێژەی ٠,٤ پلەی سەدی وە ئەم برە بووە هۆی گۆڕانی گەورە لە ئاو و هەوا، وە ڕوودانی گۆڕانەکانی ئاوو هەوا ئاماژەی مەترسیە وەکو:

أ- زیادبوونی شەپۆلی گەرما لە جیهاندا.

ب- بەرزبونەوەی ئاستی ئاوی دەریاکان.

ج- دابەزینی ئەستووری چینە سەهۆڵەکانی هەردوو جەمسەرەکە.

د- زیادبوونی حاڵەتەکانی گەردەلول بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو.

٤- خراپ بەکارهێنانی زەوی، بە گۆڕینی دارستانەکان بۆ زەوی کشتوکاڵی و بەرفرەوانبوونی ئاوەدانی.

٥- زیادبوونی پیشەسازی بۆ دابین کردنی پێداویستیە لە بن نەهاتووەکانی مرۆڤ و پیسبوونی هەوا لە ئەنجامی ئەمەدا.

٦- زیادبوونی داواکاریی لەسەر ئاو و خواردنەوەو ئاودێر[1].

٧- زیادبوونی زۆری پاشماوەی پێداویستیە بەکارهاتووەکانی تاکە کەس لەسەر ئاستی جیهانی.

٨- زیادبوونی جیاوازی دەوڵەمەندو هەژار لەسەر ئاستی گەل و وڵاتان، و نەتوانینی وڵاتانی جیهانی سێیەم بە دابینکردنی چاودێری تەندروستی و کۆمەڵایەتی و فێرکردن بۆ ئەو ژمارە زۆرەی دانیشتوانەکانیان، کە دەبێتە هۆی زیادبوونی بێکاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری، سەرەڕای ئەمانەش زیادبوونی کێشە کۆمەڵایەتیەکان وەك تاوانکردن و دزیکردن.

٩- زیادبوونی ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان، نزیکەی (٨٣٠) ملیۆن ئۆتۆمبێل لە جیهاندا لەکاردان.

١٠- بڕینی دارستانەکان و بەبیابانبوونیان.

١١- کێشەی سوێربوونی خاك و شەپۆڵەکانی هەڵکشانی دەریایی (تسۆنامی).

١٢- کێشەی ترش بوونی خاك و ترشە بارانەکان.

١٣- زۆربوونی لە ڕادەبەدەری پاشەڕۆی ناو ماڵی تاك لەسەر ئاستی جیهان.

بەمشێوەیە دەگەینە ڕاستیەکی لۆژیکی، کە هەریەك لە: (زیادبونی دانیشتوان) و (زیادبوونی بەکاربردن) وە داواکاری تاك لە سەرچاوە سروشتیەکان، ژینگە بەرەو کارەساتێکی ڕاستی دەبات.

- هەر پانزە ساڵ جارێك (١) ملیار کەس بۆ دانیشتوانی جیهان زیاد دەبێت.

- ڕۆژانە (٥٩٥) هەزار منداڵ لە دایك دەبن، واتە: (٢٧٤) منداڵ لە خولەکێکدا.

- پێویستە لە بیرمان نەچێت کە ڕۆژانە (١٨) هەزار منداڵ بەهۆی برسێتی و کەم خۆراکییەوە دەمرن[2].

---

(١) ئایندەی هەسارەکەمان، شەماڵ عبدالرحمن موفتی پیر خدری، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.
(٢) ئایندەی هەسارەکەمان، شەماڵ عبدالرحمن موفتی پیر خدری، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

بەرگی یەکەم

پاشان ئاو داخوازییەکی زۆری لەسەر دەبێت، هەتا لەسەر ئاستی تاکە کەسی، وە چاوەڕوان دەکرێت کە لەساڵی (٢٠٢٥) دانیشتوانی (٤٨) وڵات توشی کەم ئاوییەکی توند دەبن، وە دانیشتوانی ئەم وڵاتانە بە (٣) بلیۆن کەس دەژمێردرێن.

هەروەها زیادبوونی دانیشتوان دیاردەیەکی تا ئێستا بێ چارەسەرە، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبونی چڕی گازەکانی دیاردەی قەتیس بوونی گەرما (الإحتباس الحراري)، هەر بۆیە شوێنەوارە خراپەکانی گۆڕانکارییە مەناخییەکان لەسەر ژینگەو کەرتە ئابوری و کۆمەڵایەتییەکان بەردەوام دەبێت، لەو کاتەی کە ڕووبەری زەویەکان جێگیرن، وە زۆربوونی دانیشتوان دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ڕووبەری زەوی کشتوکاڵی بۆ هەرکەسێك.

بەپێی ڕاپۆرتی (سندوقی دانیشتوان) ی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان (UNFPA) ناوچە شارنشینەکان لە ساڵی ٢٠١٥ دا دوو هێندەی ژمارەی ئێستایان لە خۆ دەگرن.

لە کیشوەری ئەفەریقیا ژمارەی دانیشتوان دوو هێندە بووە، لە نێوان ساڵەکانی (١٩٧٥ بۆ ٢٠٠٥) واتە لە ٣٥٥ ملیۆنەوە بووە بە ٧٥١ ملیۆن کەس، وە پێشبینی دەکرێت کە ژمارەی دانیشتوانی کیشوەرەکە لە ساڵی (٢٠٢٥) بگاتە نزیکەی بلیۆنێك و (١٠٠) ملیۆن کەس[١].

یەکێ لە مەترسیەکانی گۆی زەوی بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردن و بڵاوبونەوەی هەژاری.. هتد، زانایان دەڵێن: تا ساڵی (٢٠٣٠) ڕێژەی مردن بەهۆی گۆڕانکاریەکانی کەش و هەواو برسێتی و نەخۆشی و کارەساتە سروشتیەکانەوە دەگاتە نیو ملیۆن کەس لە ساڵێکدا.

بەپێی ڕاپۆرتێکی نوێ کە بە پشتیوانی (مونتەدای مرۆیی) جیهانی ئەنجامدراوە، گۆڕانکاریەکانی کەش و هەوا مەترسی زۆری بۆ سەر ژیانی

---

(١) ئایندەی هەسارەکەمان، شەماڵ عبدالرحمن موفتی پیر خدری، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

مرۆڤایەتی دروستکردووەو پێشبینی ئەوەی کردووە، کە ساڵانە (٣١٥) هەزار کەس بەهۆی ئەو دیاردەیەوە گیان لەدەست بدەن، ڕوونیشی کردۆتەوە کە تێکرا بەهۆی برسێتی و کارەساتی سروشتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەوە، لەوانەیە ڕێژەی مردنی ساڵانە تا ساڵی (٢٠٣٠) بگاتە نیو ملیۆن کەس.

ڕۆژانە لە میدیا جیاجیاکانی جیهانەوە لێرەو لەوێ ڕوودانی کارەساتە سروشتیەکان، کە دەبنە هۆی فەوتی هەزارەها مرۆڤ و وێرانبوونی شارو لادێکان، دەبینین و دەبیستین، گەردەلولەکانی دورگەکانی (تایلەندو ئەندوەنوسیا) و هەندێك لە شارەکانی ئەمەریکا و زەمین لەرزەکانی پاکستان و چەندین کارەساتی تر بونەتە بەشێك لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی.

ئەم کارەساتانە بۆ مرۆڤی هۆشیاو زیرەك دەبێتە پەندو ئامۆژگاری، دەبێت ببنە ئاگادارکردنەوەیەك بۆ ئێمە، کە مردن لێمان نزیکەو لەهەر ساتێکدا بەبچوکترین ڕووداو دونیا بەجێ بهێڵین و بەرەو لای خوای گەورە بگەڕێینەوە.

سەرەرای ئەم کارەساتە سروشتیانەش زەنگێکی ترە بۆ هەموو مرۆڤایەتی و پێیان دەڵێت: کە تەکنەلۆجیاو دونیای ماددی پێشکەوتوتان لە ئاستی بەرەنگاری توانای خوای گەورە هیچ نیەو لەیەك چرکەدا دەتوانێت هەموو دونیا ژێرەو ژوور بکات، زۆر جار دەبیستین کە دەڵێن زلهێزەکان خاوەنی چەکی بەهێزن، خاوەنی دەسەڵاتی پێشکەوتوون، ئامێری سەرسورهێنەریان هەیە، لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا زۆرێك لەوانەی کە بڕوایان بە دەسەڵاتی خوای گەورە لاوازە بە گومانەوە دەڕواننە بەرەنگاربوونەوەی موسڵمانان کە خاوەنی هیچ تەکنەلۆجیایی جەنگی نین چۆن دەتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن، بەڵام لێرەوە دەڵێم ببینن و بیربکەنەوە کە بە لەرزەیەکی زەمین پەروەردگار دەتانهێنێتە سەرچۆك و پیشانی هەموومان دەدات کە جوندیەکانی خوای گەورە زۆرن، لە چرکەیەکدا هەموو هاوکێشەکانی پێچەوانە دەکاتەوەو زەوی لە ژێر پێی کافرەکاندا دەلەرزێنێت و ژێرەو ژووریان دەکات.

لە مێژووشدا هەمیشە کوفر هەر زلهێز بووەو هێزەکەشی سەر شۆڕبووە، مەگەر بە (فیل) نەهاتن و بە (طير الأبابيل) شکستیان نەخوارد؟

یان لە بەدردا خوای پەروەردگار هێزی لاوازی موسڵمانانی بەهێز نەکرد بە فریشتەکان و سەر زلەکانی مەککە نەکەوتنە ژێر پێی موسڵمانان؟

دڵنیابن مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوەو خوای پەروەردگاریش دینەکەی خۆی دەپارێزێت، جا با ئەوان چەکی کۆکوژو تەکنەلۆجیای پێشکەوتوشیان هەبێت بەڵام لەبەردەم دەسەڵاتی خوای پەروەردگار هیچ نین.

(وۆنج) وەزیری کاروباری کەش و هەوای ئوستورالیا، لە ڕاپۆرتێکیدا لە ژێر ناونیشانی (مەترسیەکانی گۆڕانی کەش و هەوا لەسەر کەناراوەکانی ئوستورالیا) ئاماژە بەوە دەکەن:

کە مەترسی ژێر ئاوکەوتنی (٢٤٧) هەزار یەکەی نیشتەجێبوون دەکات، ئەگەر ڕێگە چارەیەك بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی دەریاکان نەدۆزرێتەوە.

(وۆنج) لە ڕاپۆرتەکەیدا ڕوونیشیکردەوە، کە بە وتەی زانایانی ئەو بوارە، گۆڕانەکانی کەش و هەوا لە ئاستی پێشبینی کراو خێراترن و بەم پێیەش کاریگەریەکانی ئەو گۆڕانانە گەورەتر دەبن و ڕووداوە سروشتیەکانیش بەردەوام لە زیادبووندا دەبن.

بە گوێرەی ڕاپۆرتەکە هۆکارەکانی گۆڕانی کەش و هەواو بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای گۆی زەوی، پیس بوونی ماددەی کاربۆنە، هەر بۆیە (وۆنج) پێداگری دەکات لەسەر چەسپاندنی یاسایەك بۆ کەمکردنەوەی پیس بوونی ماددەی کاربۆن.

# کەمبوونەوەی ئاوی ڕووبارەکان

ئەگەر بەراورد بکەین لەگەڵ پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، ئاستی ئاوی زۆربەی ڕووبارەکانی جیهان بەشێوەیەکی بەرچاو دابەزیوە، زانایان پێیان وایە، بە لەبەر چاوگرتنی نەمانی سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوەو زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی جیهان ئەو بابەتە هەڕەشەیەکی جددی بۆ سەر ژیانی خەڵك دروست دەکات.

توێژەرە ئەمریکییەکان وای بۆ دەچن، کە کەمبوونەوەی ئاوی ڕووبارەکان بۆ گۆڕانکاری کەش و هەواو دیاردەی پەنگخواردنەوەی گەرمای دەگەڕێتەوە، ئەو بابەتەش دەرەنجامی زۆر خراپی لێ دەکەوێتەوە، تەنیا شوێنی جیهان کە ئاوی ڕووبارەکانی لە جاران زیاتر بوویێت، ناوچەکانی نزیك جەمسەری باکوورە، ڕووبارەکانی دەوروپشتی زنجیرە چیای (هیمالایا)یە، کە هۆکارەکەی بۆ توانەوەی بەستەڵەکەکانی جەمسەری باکورو بەفری چیاکانی (هیمالایا) دەگەڕێتەوە، کە ڕەنگە بەنەمانی بەفری چیاکان ئاوی ڕووبارەکانیش وشك ببن[١].

بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی تۆڕی (بی بی سی) زانا ئەمریکیەکان ڕایانگەیاند کە سەرەکیترین سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی دانیشتوانی زەوی ڕووبارەکانە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە ڕووباری زەردی چینەوە بگرە هەتا دەگاتە ڕووباری کولۆرادۆی ئەمریکا، ئاستی هەر هەمووی ڕووی لە دابەزینەو ئەو بابەتە (٩٠٠) ڕووباری گەورەی جیهان دەگرێتەوە، جگە لە گەرمبوونی گۆی زەوی و کەمی باران بارین و گۆڕانی کەش و هەوا، وە گۆڕینی ڕێڕەوی ڕووبارەکان و لێدانی بەنداوەکان و جموجۆڵە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکانی مرۆڤیش دەستی لە کەمبوونەوەی ئاستی ئاوی ڕووبارەکاندا هەبووە.

---

(١) ئەو بابەتە لە گۆڤاری ئاوو هەواوی کۆمەڵی جیۆلۆجیانی ئەمریکادا هاتووە.

هەندێ جاریش لە ڕێگەی نقوم بوونی بارهەڵگرە نەوتیەکانەوە پیس دەبێت، یەکێك لەوانە دەریای ناوەڕاستە، دەریای ناوەڕاست بەیەکێك لە دەریا ناوخۆییەکان دادەنرێت، کە لە ڕێگەی گەرووی (جبل طارق) ەوە بە زەریای ئەتڵەسیەوە دەبەسترێتەوە، کە سەرچاوەی سەرەکی گەیشتنی ئاوە بەم دەریایە، لەم سەردەمەشدا گرنگی دەریای ناوەڕاست ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبێت، کە بەناوچەیەکی گرنگ دادەنرێت لە ڕووی ئابووری و کاریگەریەکانی ژینگەیی، لە ڕووی ژینگەییەوە دەریای ناوەڕاست کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر کەش و هەوا، لەبەر ئەوە هەر گۆڕانکاریەك لە ئاو و پیسبوونی ئاوی ئەم دەریایە ڕوویدات، ئەوە بەشێوەیەکی نێگەتیڤ بەسەر جیهاندا دەشکێتەوە.

**دەریای ناوەڕاست ڕووبەڕووی چەند مەترسیەکی ژینگەیی بووەتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن :**

• گەرمبوونی ئاوی دەریای ناوەڕاست، گەرمبوونی گۆی زەوی کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر ئاوی دەریای ناوەڕاست، بەشێوەیەکی گشتی ڕێژەی ئەو ئاوەی کە دەبێت بەهەڵم، سێ هێندەی ئەو ئاوەیە کە تێدەڕژێت، بەمشێوەیە ئەگەر زەریای ئەتڵەسی نەبوایە دەریای ناوەڕاست لە ماوەی (٤٠٠) ساڵدا وشکی دەکرد، هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکان سەلماندوویانە کە نزیکەی (٥٦) جۆر لە ماسی ناوچە یەکسانییەکان لە ڕێگەی کەنداوی سوێس پەڕیونەتەوە بۆ ناو دەریای ناوەڕاست کە ئەمەش بەیەکێك لە نیشانەکانی گەرمبوونی ئاوی دەریای ناوەڕاست دادەنرێت.

• پیسبوون بەهۆی فڕێدانی پاشەڕۆ بۆناو دەریای ناوەڕاست بەیەکێك لە گەورەترین ئەو مەترسیانە دادەنرێت، کە توشی دەریای ناوەڕاست بووە، ئەمجۆرە پیسبوونەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار[1]:

---

(١) ئەو بابەتە لە گۆڤاری ئاوو هەوای کۆمەڵی جیۆلۆجیانی ئەمریکادا هاتووە.

**یەکەم: زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکانی دەریای ناوەڕاست:**

کە ژمارەیان لەساڵی (٢٠٠٠) گەیشتە (٤٢٧) ملیۆن کەس، بۆیە چاوەڕوان دەکرێ لە ساڵی (٢٠٢٥) بگاتە نزیکەی (٥٢٣) ملیۆن کەس، ئەمەش سەرەرای زیادبوونی ژمارەی گەشتیاران، کە ڕوودەکەنە ناوچەکە لە ساڵی (٢٠٠٠) گەیشتە نزیکەی (٢٢٨) ملیۆن گەشتیار، واش چاوەڕوان دەکرێت کە ژمارەکە بەرز ببێتەوە بۆ (٣٠٠) ملیۆن گەشتیار لە ساڵی (٢٠٢٥)، زۆربەی لێکۆڵەرەوانیش سەلماندوویانە کە زیاتر لە ٨٠٪ ی ئەو پاشەڕۆیانە پاکناکرێتەوە پێش ئەوەی بکرێتە ناو دەریای ناوەڕاست.

**دووەم: زیادبوونی گرنگی ڕێڕەوی بازرگانی دەریای ناوەڕاستە:**

کە زیاتر لە ٣٠٪ بازرگانی جیهان بەم دەریایەدا گوزەر دەکات و ٢٥٪ نەوتی جیهانیش بەم دەریایەدا تێپەڕ دەبن، ئەم گەشتیارانەش زۆربەی پاشەڕۆکانیان دەکەنە ئەم دەریایەوە.

• گۆڕانی ئاو و هەوا: یەکێکیترە لەو مەترسیانەی کە توشی دەریای ناوەڕاست بووە، کە لە (١٥) ساڵی ڕابردوودا تێبینی گۆڕانێکی بەرچاومان کرد، لە بڕی بارانی ئەو وڵاتانەی کە دەکەونە سەر ئەم دەریایە کە سەر بە سیستەمی ئاوو هەوای دەریای ناوەڕاست ناسراون، لەبەر ئەوە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی هەواو کەمبوونەوەی بڕی باران دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە ڕووەکی سروشتی و ناوچەکانی دەریای ناوەڕاست و زیادبوونی ڕێژەی بەهەڵمبوون و بەرزبوونەوەی ڕێژەی خوێ تیایدا[1].

(١) ئەو بابەتە لە گۆڤاری ئاوو هەواوی کۆمەڵی جیۆلۆجیانی ئەمریکادا هاتووە.

# بە ڕەنگاربوونەوەی یاسا ژینگەییەکان بە هەڕەشە

هاوسەنگی بونەوەرو پێکهاتەکانی و تێکچوونی هاوسەنگی بونەوەر بە تایبەتی چینی هەواو پیسبوونی ژینگە یەکێکە لە بابەتە هەرە گرنگە زانستیەکانی ئەمڕۆ، کە بۆتە جێگای بایەخ پێدانی زانایانی هاوچەرخ، جێگای ئاوەڕدانەوەیە قورئانی مەزن بەر لە زانستی ئەمڕۆ باسی دەکات، کە خودا بونەوەرو ژیانی بە هاوسەنگی و وردەکاری و ڕێژەیەکی دیاری کراو دروست کردوەو مرۆڤی هۆشیار کردۆتەوە کە وریابن نەکەن دەستی کاولکاری و تێکدانی تێدا بگێڕن، ئەو هاوسەنگیە زیان پێ بگەیەنن چونکە قڕ لە ژیان دەخات و مەترسی بۆ سەر بونەوەر پەیدا دەکات، پاشان پێشبینی دەکات کە مرۆڤ لە ئایندەدا گوێ بۆ ئەم پەیامە مەترسی دارە شل ناکات و ئەو هاوسەنگیە لە بەین دەبات، پرۆفیسۆر (فرانك ئالن) سروشت ناسی بیۆلۆجی لە ئەمریکا دەڵێت: گونجانی زەوی بۆ ژیان زۆر شێوە وەردەگرێ، کە ناکرێ لەسەر بنەمای ڕێکەوت یان هەڕەمەکی لێکبدرێتەوە، زەوی گۆیەکی هەڵواسراوە لە ئاسماناداو بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بەوەش وەرزەکان بە شوێن یەکتردا دێن، کە بەدەوری خۆی ڕووبەری بەشی باش بۆ ژیانی دانیشتوان فرەوانتر دەکات لە هەسارەکەمانداو، جۆری ڕووەکەکان زۆر لەوە زیاتر دەکات کە لە زەویەکی وەستاودا بوایە، چڕی ئەو گازانە لە ئاستێك دایە بوار نادات نەیزەکە کوشندەکان بە خێرایی (٣٠ میل، چرکە) بەرەو ڕومان بێت و بگات بە ئێمە.

دوای گەشەسەندنی هۆشیاری جیهانی ژینگە پارێزی و سەرنجدانی دەوڵەتەکان بۆ کێشەی ژینگە، نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٩٠) دا کۆمیسیۆنێکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە مەترسیەکانی پیسبوونی ژینگە لە پێناو دانانی چوارچێوەیەکی یاسایی نێو دەوڵەتی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی کێشەی

ژینگە پێك هێنا، کە ڕێککەوتنامەی (ڕیۆدۆژانیرۆ)ی لێ کەوتەوە، دوای پێنج ساڵ دانوستاندنی چڕوپڕ، نوێنەرانی زۆرینەی وڵاتانی جیهان لەسەر پرنسیپە گشتیەکانی چوارچێوەی پەیماننامەی گۆڕانی کەشو هەوای (١٩٩٧) ی (کیۆتۆ) ڕێککەوتن، ئامانجی سەرەکی پرۆتۆکۆڵی کیۆتۆ بەشداریکردنی (٣٨) دەوڵەتی پیشە سازی بوو، بۆ ئەوەی لە کۆششێکی دەستە جەمعی دا ڕێگە لە زیاتر بوونی دیاردەی پەنگخواردنەوەی گەرما بگرن، بە بەراورد لەگەڵ ساڵی (١٩٩٠) لە ساڵی (٢٠١٠)دا ٥,٢٪ی پەنگ خواردنەوەی گەرمایی زەوی کەم بکەنەوە، دەست بەجێ ئەمەریکا بە بیانووی تێچوونە ئابووریەکانەوە ڕێککەوتنامەکەی مۆر نەکردو دەوڵەتانی ئەندام لە (OPES) لەسەر ناوەڕۆك و خشتە زەمەنیەکانی ڕێککەوتنامەکە ناڕەزایی خۆیان دەربڕی .

هەروەها دژایەتی کردنی ئەمەریکا بە واتای شکستی پەیماننامەکە دەهات و هەر بۆیەش لە پێناو ڕزگارکردنی (پرۆتۆکۆلی کیۆتۆ) دا لە نۆڤەمبەری ساڵی (٢٠٠٠) و لە شاری لاهای نوێنەرانی (١٨٠) دەوڵەت کۆبوونەوە بەڵام لوتکەی جیهانی کەش و هەوا لە (لاهای)یش بە هۆی ناکۆکی نێوان ئەمریکاو ئەوروپا نەگەیشتە هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆ کە پێبەندی زلهێزەکانی بە پرۆتۆکۆلی کیۆتۆی لێ بەرهەم بێت، دوای شکستی ئەو کۆبونەوەیەش وەزیرو نوێنەرانی (١٨٠) دەوڵەت لە جولای (٢٠٠١) لە شاری (بۆن) ی ئەڵمانی دا کۆبونەوەو سەرەڕای ڕێککەوتنی نێوان دەوڵەتە هەژارەکان و یەکێتی ئەوروپا بۆ هاویشتنی هەنگاوی پراکتیکی بە ئاراستەی پەیماننامەی کیۆتۆ، بەشی سەرەکی پیسبوونی ژینگە بەر ئەمەریکاو چین و هیندستان و وڵاتە نەوتیەکان دەکەوت.

چالاکی ژینگەییەکان لە جیهان لە دوای بڵاوبوونەوەی نەخۆشی بوو، دوای ئەوەی زانیان کە هۆکاری بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئەو پێشکەوتنەی پیشەسازی لە ئەورووپاوە پێشکەوتنی ئەوروپا بەخۆیەوە بینی، چەندین جۆری نەخۆشی ترسناك بڵاوبویەوە لەوانە نەخۆشی شێرپەنجەیی، هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشیانەش تێکچونی ژینگەیە، ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیاری دروستکردنی دامودەزگا ژینگەیەکانی دا لە کۆنگرەی (ستۆکهۆڵم) لە ساڵی

١٩٧٢ بەهۆی تێکچوونی ژینگەوە نەخۆشی زۆر بڵاوبۆوە، گرنگی بواری ژینگە لەوەدایە کە راستەوخۆ پەیوەندی بەژیانی مرۆڤەوە هەیە، ئەگەر بێتوو ژینگە تێکچوو نەخۆشیەکی زۆر بڵاودەبێتەوە، بۆیە ئەو نەخۆشیانەی لە وڵاتی ئێمەن بۆ نمونە: کولێرە بە هۆی تێکچوونی ئاوی پیسبوی سەرچاوەی ئاو وەکو پێویست، لە نەخۆشی شێرپەنجەیی یە کە هەن بەزۆری بە تێکچوونی هەواوە دەبێت، هەندێکیان بەهۆی کێشانی جگەرەوەو تێکەڵ بوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بەکەسانی نزیك و دەوروبەریان، هەندێکیان بەهۆی زیابوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، بۆیە ئەوشوێنانەی دانیشتوانەکەی زۆرترە شارەکان چڕوپڕی خەڵکی تیادەژی ژینگەکەیان پیسترەو زۆرتر نەخۆشی تیابڵاودەبێتەوە، خۆشتان باشتر دەزانن کە یەکێك لە کێشە گەورەکان ڕووبەڕووی جیهان بۆتەوە ئێمە بەشێکین لە دیاردەیەی گۆڕانی کەش وهەوا، بەهۆی زیادبوونی ئۆکسیدی کاربۆن و قەتیس بوونی پلەی گەرما ئەمەش گەڕانەوەی ئەو ڕێژە گەرمیەی کە پێویستە چەند دێتە سەر زەوی ئەوەندە بگەرێتەوە ڕێگەی نیە بگەرێتەوە، دیاردەی گۆڕانی کەش و هەوا ڕوویداوە کە مەترسیەکی زۆر گەورەی لەسەر ژیانی مرۆڤ هەیە، ئەمانە هەمووی بەهۆی تێکچوونی ژینگەوەیە، هەموو ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی تێکدانی ژینگە بە ئاو هەواو خاك و ڕەگەزەکانی تریشەوە بە یاسا ڕێك بخرێ، لە زەویش مەترسی پیس بوونی ژینگە گەلێ گەورەیە، کە هەڕەشە لە ژینگە دەکات، لەوانەش پیس بوونی دەریاکان و خاك بە هۆی تیشکی ئەتۆمی و پاشماوەکانی مرۆڤ و پەیینی کیمیایی.

ئێستا پەیتا پەیتا ئاگادارمان دەکەنەوە کە پیسبوونی ژینگە کارەسات لەسەر ڕووی زەوی دروست دەکات، لەبەر ئەوە داوا لە دەوڵەتە زلهێزەکان دەکەن کە کارگە گەورەکان کەمبکەنەوەو وزەی پاك بەکاربهێنن، ئەگینا پلەی گەرمی سەر ڕووی زەوی زیاد دەکات و باران کەم دەبارێت و دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی گرانی و نەخۆشی ترسناك و توانەوەی بەستەڵەکەکان و زیادبوونی کاربۆن و پیسبوونی ژینگە و دادڕنی چینی ئۆزۆن و هاتنە ژوورەوەی تیشکی سەروو بنەوشەیی، سەرەنجام ڕوودانی کارەساتی گەورە.

# توانەوەی چیا سەهۆڵیەکانی جەمسەری باکوور

شاخی بەفرین بریتیە لە بەستەڵەکێك یان ڕووبارێکی بەفراوی، کاتێك ڕوبارە بەفراویەکان دەکەونە ڕێ، بەشێکیان جیا دەبنەوەو لە ڕێگەی شیوەکانەوە دەگەنە ڕووبارەکان و لەوێدا ڕووبارە بەفرەکە هەڵدەوەشێت و سەهۆڵە شاخێك دروست دەکات.

چی ڕوودەدات ئەگەر گۆڕانی کەشوهەوا گەیشتە ئاستی کارەساتێکی ژینگەیی گەورە؟

بەچاوی خۆمان گۆڕانی کەش و هەوا دەبینین، کە کاریگەرییەکانی لەسەرخۆو لەسەر کەڵەکە دەبن، ئەگەر بەم شێوەیەی ئێستای بەدەوام بێت دەگاتە خاڵێك کە گەڕانەوەی بۆ نیە، ئەو خاڵەی مرۆڤ ئیدی ناتوانێت گۆڕانەکە ڕابگرێ، بە گەیشتنمان بەم خاڵە، زنجیرەیەکی دۆزەخ ئاسای کارەساتە ژینگەییەکان دەست پێدەکات، کە تەنیا یەك کارەساتیان بەسە بۆ لەناوبردنی ژیان لە زۆربەی شوێنەکانی جیهاندا، ئەگەر هەر هەموو زەوی نەگرێتەوە.

توانەوەی سەهۆڵبەندی کیشوەری باشور دەبێتە هۆی ڕوودانی بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی دەریاکان لە ماوەی چەند سەد ساڵێکدا بۆ بەرزی پێنج مەتر، بەتوانەوەی سەهۆڵبەندی خۆرهەڵاتیش هەر لە کیشوەری باشوور، ئەوەندەی ئاو لە خۆ گرتووە کە ئاستی دەریاکان بۆ پەنجا مەتر بەرز دەکاتەوە، هەروەها توانەوەی لوتکەی گریلاندی سەهۆڵبەندیش ئاوی دەریاو ئۆقیانووسەکان بەناوچە مرۆڤ نشینەکانەوە دادەپۆشێت، ئەگەر بڵاوکردنەوەی گازی کاربۆن لەگەڵ میسانی هەڵگیراوی ناو زەوی بەردەوام بێت، ئەوا کارەساتی پەنگخواردنەوەی گەرمی وادەکات سەهۆڵ لە هیچ شوێنێکی زەویدا نەمێنێت[1].

---

(١) www.syriapath.com.

لێکۆڵینەوەیەکی زانکۆی (بریستولی) بەریتانی ئاماژە بەوە دەکات، کە بڕی کاربۆنی دەرچوو لە ماوەی ئەم دەیانەی دواییدا لەبەرزبونەوەدایە، بەڵام زەوی لە توانای دایە بڕی گەورەتر هەڵبمژێت .

پرۆفیسۆر (پیتێر وادهێمز) لە زانکۆی (کەمبریج)ی بەریتانیا دەڵێ: توێژەرانی زانکۆ لە لێکۆڵینەوەکانی ئەو دواییەی خۆیان لە جەمسەری باکوور بەو ئەنجامە گەیشتوون کە ئەستووری سەهۆڵ لە ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوور، زۆر تەنکەو بەئاسانی دەشکێت و ئەوەیش واتە: زووتر توانەوەی سەهۆڵەکان، پرۆفیسۆر (پیتێر وادهێمز) پێیوایە کە سەهۆڵ تایبەتمەندیەکی هەمیشەیی گۆی زەوی بووە، بەڵام ڕەنگە لەو زووانە ئەو تایبەتمەندییە لە دەست بدات و جەمسەری باکوور لە (١٠) ساڵی دیکەدا ببێتە دەریایەکی ئاسایی کە کەشتیەکان بە ئاسانی هاتووچۆی تیایدا بکەن.

نوێترین لێکۆڵینەوەی زانکۆی (کەمبریج) لە ژێر ناوی (کاتیلن)ەو لەسەرەتای ئەمساڵ دەستی پێکردووە و ڕووبەرێکی (٤٣٥) کیلۆمەتری چوارگۆشەی جەمسەری باکووری زەوی لە خۆوە گرتووە.

پرۆ فیسۆر (پیتێر وادهێمز) کە نزیکەی (٥٠) ساڵە لێکۆڵینەوە لەسەر جەمسەری باکوور دەکات لە ڕێوڕەسمی کردنەوەی (کاتلین) و لە وتەیەکدا نەیشاردەوە، کە لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەردەخەن کە هەتا بیست ساڵی دیکە جەمسەری باکوور تەنیا لە زستاناندا سەهۆڵی دەبێت، هەر چەندە یەکێك لەلایەنە باشەکانی توانەوەی سەهۆڵەکانی جەمسەری باکوور یارمەتیدانی مرۆڤە بۆ ئەوەی دەست بەسەر سامانە ژێر زەمینیەکانی وەك نەوت و گازدا بگرێت، بەڵام لە درێژخایەندا گەرمتربوونی زەوی لێدەکەوێتەوە، چونکە سەهۆڵەکانی جەمسەری باکوور ڕێژەیەکی زۆری گەرمای خۆریان بۆ دەرەوەی بەرگەهەوای زەوی دەگەڕاندەوە[1].

هەندێك لە ڕووبارە بەفراویەکان ناگەنە دەریاکان، بەڵکو لە شیوێکی قوڵدا دەوەستن کە پێی دەگوترێت «ڕووبارە کوڵان»، هەندێك جاریش بەشێکی شاخە

---

(١) www.syriapath.com.

بەشی یەکەم

بەفراویەکان بەهۆی شەپۆڵەکانەوە دەتوێنەوە، کە بەشێکی زۆر لە بەفر دروست دەکەن لە ژێر ئاوداو ئەو بەشە زۆرە بەفرەش شیتەڵ دەبێت و بەشێکی دەکەوێتە سەر ئاو لە شێوەی شاخێکی بەفراویدا.

ئێستا ئەم چاخە بەفرینە دەستی پێکردووەو دروست بووە، ئەمەش هۆیەکی مەترسیداری لەسەر زەوی هەیە، چونکە ئێستا لە ئەمریکای باکوردا بەفرێکی زۆر دروست بووە پێی وتراوە (شاخی بەفرینی کیشوەری) لەوانەیە ئەستوریەکەی لە ناوەڕاستیەوە گەیشتبێتە (٤٥٠٠)مەتر، دەشێت لە ماوەی چاخی بەفرینیش دا چوار جار توابێتەوە، ئەو چاخە بەفرینانەی کە لە شوێنەکانی تری دونیادا ڕویداوە تا ئێستا هەڵێکی بۆ نەڕەخساوە بتوێتەوە، نمونەی ئەوەش دورگەی گرینلاندی بەربڵاو کە تا ئێستاش بە شاخێکی بەفرینی کیشوەری داپۆشراوە، لە ناوەوە بەرزی شاخە بەفرینەکە لە زۆر شوێندا لە (٣٠٠)مەتر زیاترە، کیشوەری (ئەنتارکتیا) کە کیشوەرێکی چۆلە، دەکەوێتە دەوروبەری جەمسەری باشوورەوە، بەشاخە بەفرێکی کیشوەری داپۆشراوە، لە هەندێك شوێندا بەرزیەکەی دەگاتە (٤٠٠٠)مەتر، لەبەر ئەو هۆیەیە بونی شاخە بەفر لە چەند ناوچەیەکی جیهاندا، هەلی توانەوەی بۆ نەڕەخساوەو ساڵی ئاینده هێندەی تری بەفری بەسەردا باریوە بەڵام زۆربەی ئەو شاخە بەفرینانەی ئێستا هەن، لە سەردەمێکی تازەدا دروست بونە، شاخە بەفرینەکانی ئێستا بریتین لە شیوێکی پانی قوڵ لە پلیکانەی گەورە دەچێت، بەفر بەسەری دا دەبارێت و بەمجۆرە قورس دەبێت و بارستاییەکانی سەر شیوەکە دەخلیسکێنێ، بارستاییەکانیش بریتین لە قەبارەیەکی گەورە لە بەفرو بەندان، ئەو بەفرە لە ماوەی وەرزی هاوینیش دا ناتوێتەوە بەڵکو ساڵ لە دوای ساڵ قوڵتر دەبێتەوە، ئەمەش لە ئەنجامی پاڵەپەستۆی زۆر لەسەرەوە بۆ خوارەوە، سەرەرای توانەوەو بەستنی سەر لە نوێ[1].

هەندێ لە زانایانی تر ڕایانگەیاندوە کە ژینگەی جەمسەری باکوور زۆر خێراترە لەوەی کە بیری لێدەکرایەوە، بە پێی هەواڵی ئاژانسی (فارنس نیو)

---

(١) www.syriapath.com.

ئەو لێکۆڵینەوەیە لە ئەنجامی کاری هاوبەشی (٣٧٠) زانا لە (٢٧) وڵاتی جیهانی بووە، کە لەماوەی (١٥) مانگدا و لەناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٧) لەناو کەشتیەکی زانستی لە جەمسەری باکوور بۆ یەکەم جار دەستی پێ کرد.

(دیڤید بایێر) دەڵێت: پێشتر وامەزندە کرابوو کە جەمسەری باکوور لە ساڵی (٢١٠٠)دا بەبێ سەهۆڵ دەمێنێتەوە، بەڵام خێرایی گۆڕانی کەش و هەوا بەڕادەیەکە کە ئەو شتە لە نێوان ساڵی (٢٠١٣ تا ٢٠٣٠) ڕوودەدات، جا زانایان توانەوەی سەهۆڵەکان بۆ گەرمبوونی گۆی زەوی دەگەڕێننەوەو جەمسەری باکوور بۆ زانایان هەردەم سیمبوڵی دەرکەوتنی کاریگەرییەکانی گەرمبوونی زەوییەوە بووە، بۆیە لەناوچوونی سەهۆڵەکانی جەمسەری باکوور دەبێتە هۆی تێکچوونی ژینگەی سروشتی گیاندارەکانی ناوچەکەو نەمانی هێزی زاوزێیان، هەروەها دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ڕەشەبای زۆر بەهێز لەسەرانسەری جەمسەری باکوور کە زیاتر سەهۆڵەکان دەتوێنێتەوە.

کەمبوونەوەی ئەستووری سەهۆڵبەندانی جەمسەری بەستەڵەکی باکور و باشوور لەم ساڵانەی دواییدا، ئەو داتایانەی کە مانگە دەستکردەکان تۆماریان کردووە، دەریانخستووە، کە چینە سەهۆڵەکان بەڕێژەی ١٤٪ کەمی کردووە، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٨-١٩٩٨، بەڵام ئەو داتایانەی ژێر دەرياییەکان تۆماریان کردووە دەڵێن: ئەستووری چینەکانی سەهۆڵ بەڕێژەی ٤٠٪ کەمییان کردووە لەم ٤٠ ساڵەی دواییدا کە ئەمەش مەترسیەکانی لە ئێستادا دەردەکەوێت لەسەر ڕووی زەوی و ناوچەکانی جیهاندا بەو هەموو لافاو و ڕەشەبا و گرفتە[1].

تێبینی کراوە کە ئەو بەفرو سەهۆڵەی دورگەی گرینلاندی داپۆشیووە، لەم ساڵانەی دواییدا لە نزمایییەکاندا زیاتر لە بەرزاییەکان تواوەتەوە، کە هەروا ماوەتەوە بەمەش پەنجا بلیۆن تەن ئاوی زەریاکان لەهەموو ساڵێك دا زیادی کردووە.

---

(١) www.syriapath.com.

یەکەم بەرگی

لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە، کە وەرزی توانەوەی چینە سەهۆڵەکان لە ساڵێکدا درێژترە، بەڵام کات و وەرزی بەستنیان لە ساڵێکدا کورتترە، ئەمەش مانای وایە کە پلەی گەرمی گۆی زەوی هەموو سەدەیەك ١,٢ پلی سیلیزی بەرز دەبێتەوە، ئەم مەترسیانە وایان کرد کە زانایانی کەش و هەوا و ژینگە پارێزی لەسەر ئاستی هەموو جیهان بیر لەمەترسی پیسبوونی ژینگە بکەنەوەو بڕیاری پێویست لەبارەیەوە بدەن ئەویش بە بەکارهێنانی وزەی پاك وزەی خۆر و وزەی با و کەمبوونەوەی پیسبوونی هەوا کە بەهۆی چالاکییەکانی مرۆڤەوە ڕوویداوە.

زانایان بۆیان دەرکەوتووە کە کەش و هەوا چەند ملیۆن ساڵ بەر لە ئێستاو لە ماوەی نێوان سەردەمی سەهۆڵ بەندەکاندا لە چەند گەڕێکدا خولابێتەوە، ئەوەش لە پاشماوەکانی ئاژەڵ و بەردەلاکەکانی قوڵایی زەریاکان زۆر بە ڕوونی دیارە، بەشی ناوەڕاستی سەهۆڵەکانیش هەمان شت[1].

بەفرو سەهۆڵەکانی جەمسەری باشوور زانیاریمان پێ دەدەن، کە چۆن پلەی گەرماکان جیاواز بوونە، ناوەوەی ئەو سەهۆڵانە تۆماری بەفری کۆنی تێدایە، کە ئەوەش ئاسانکاری بۆ زانایان دەکات، کە پلەی گەرما هەزاران ساڵی بەر لە ئێستا چەند بووە[2].

---

(١) واتە: گۆڕانکاری لە ڕێژەو جۆرو جیاوازەکانی گەردیلەیی توخمە کیمیاییەکان (ئایسۆتۆپەکانی) سەردەمانی کۆن پیشان دەدەن .

(٢) www.syriapath.com.

# پەیدابوونی کونی ڕەش

زاناکان بۆیان ڕوون بۆتەوە کە لە ئاسماندا ئەستێرەیەکی زۆری تاریك هەیە کە ملیارەها ساڵە کوژاونەتەوەو ماونەتەوەو نابینرێن، بەڵام چۆن زانراوە کە ئەم ئەستێرانە هەن، ئەم زانیاریانەش بەهۆی شەپۆلی رادیۆمی زانراوە کەبەر ئەو ئەستێرە کوژاوانە دەکەوێ و دەگەڕێتەوە.

بێجگە لەمانەش ملیارەها شوێنی تاریك لە ئاسمانەکان هەیە کە هیچ زانیاری لەسەریان نیە، چونکە شەپۆلی رادیۆمی قووت دەدەن، سەیر لەوەدایە کە ئەم کونە تاریکانە ئەستێرەیەکی زۆریان لە دەور هەیە هەمووی چاوەڕوانی قوتدانن.

زاناکان دەڵێن: ئەم شوێنانە گۆڕستانی ئەستێرەکانن (مقبرة النجوم) هەریەکە ئەستێرەی لێ نزیك دەبێتەوەو یەکسەر قوتی دەدات، شوێنێك لەناو ڕێگای کاکێشان هەیە، زاناکان دەڵێن: ماددە لەناو ناچێت، بەڵام لە شکلەوە دەگۆڕێ بۆ شکلێکی تر، لەسەر ئەو بۆچوونە دەڵێن: ئەو ئەستێرانەی دەکەونە ناو تاریکی نافەوتێن بەڵکو لەلایەکی تر دێنەوە دەرو گۆڕانیان بەسەردا دێ، بەڕاستی ئەم شوێنانە زۆر ترسناکن[١]، خوای گەورە لە قورئاندا ئیشارەتی پێکردووەو دەفەرموێ: [ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ ][٢].

ئەگەر قەبارەی ئەستێرەیەك لە سێ ئەوەندەی خۆر گەورەتر بێت و بەرەو مردنیش بڕوات ئەوە لە پلەی ئەستێرەی نیوترۆندا نەوەك هەر خۆی ناگرێتەوە، بەڵکو دەبێت بە کونێکی ڕەش.

---

(١) الكون العميق، لا ١٤٠-١٤١.

(٢) سورة البقرة، الآية: (١٩).

ڕەنگبێت ئەو دیارنەمانە سەیرو نەزانراوەی کە ڕوو دەدات، لە هەندێك ئەستێرە لە هەموو پەناو چمکێکی گەردونەوە بەبێ ئەوەی شوێنەوارێکی لێ بەجێ بمێنێت کە بەڵگەبن بۆ بوونی کونە ڕەشەکان.

باوەڕیش وایە کە هەندێ لەم کونە ڕەشانەش دوانەئەستێرەیان لەگەڵ ئەستێرە بینراوەکاندا پێکهاتبێت.. کونە ڕەشەکەو ئەستێرەکەی هاوەڵی بە دەوری یەکتردا دەسوڕێنەوە، ئەستێرە بینراوەکەش بە شێوەی لولپێچێك بەرەو کونە ڕەشەکە دەڕواو بەرە بەرە لە چاو ون دەبێت.

لەگەڵ ئەم کرداری ونبونەدا پلەی گەرمی ئەستێرەکە بەرز دەبێتەوە، بە توندی تیشکی ئێکسی لێوە دەردەچێت، کەواتە دەشێت ئەم تیشکانە بەڵگەی بوونی کونە ڕەشەکان بن.

ئەم ڕووداوەش بەهێزی کێش کردنی مەزن و زۆر گەورەی کونی ڕەش ڕوون دەکرێتەوە.. هێزی کێشکردنیشی نزیکە لە ناکۆتاییەوە.. بەو هێزە بەرزە لە سنوری تیرەیەکی دیاری کراودا کونی ڕەش هەموو شتێك قوت دەداو هەڵ دەلوشێ وەکو گەرمی و دەنگ و ڕۆشنایی و هەموو جۆرە تیشکێك و هیچ ناهێڵێتەوە.

کونی ڕەش نە بەش بەش دەبێ و نە بچووکیش دەبێتەوە، بەڵکو هەتا بێ گەورەتر دەبێ.. جا کونە ڕەشێك کەوا هەر لە مڵ و موش و قووت دان و نۆش و گۆش دابێت.. دەبێ هەروا لە گەشە کردن و گەورەبووندا بێت!!

هەر چەند گەورەتربێت، هێزی کێشکردنیشی گەورەترو بە دەسەڵات تر دەبێت و سنووری هێزی کێش کردنی زۆرتر دەبێ و خێراتر گەشە دەکات[1].

بەو پێیە ڕاددەی گەورەبوونی خێرایی گەشەکردنی تا بێت زیاتر دەبێت، وای لێ دێت کونە ڕەشێك ئەو گەلەئەستێرەیە قوت دەدا کە خۆی لەناوی دایە.

زانایانی ئەمڕۆ بەڕاستی بیریان بۆ ئەوە دەچێ کە کونێکی ڕەش لەوانەیە سەراپای گەردوون قوت بداو گەردوون ببێتە کونە ڕەشێك و بەس... بەڵام!!

---

(١) الكون العميق، ل١٤١.

بەرگی یەکەم

مادده.. دەنگ.. ڕۆشنایی.. لە کونە ڕەشدا ون بوون بۆ کوێ چوون؟ ئایا چوون بۆ نەبوون؟ بۆ نەمان؟

یان جارێکی ترو لە شوێنێکی تری گەردوونەوەو لە کاتێکی تردا دیسان هەڵدەقوڵێنەوەو دەردەچنەوە؟

گەردوونناسان و لێکۆڵەران لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا ئەگەرچی کە پرسیارەکان لە سنووری مادده گەری دان کۆڵەوارو دەستەوسانن.

بەڵێ... ئەم گەردوونە کۆتایی پێ دێت و لەناو دەچێت، تەنها هەر کۆڕە ئاینیەکان نیە کە ئەم جۆرە بابەتانەیان تێدا باس دەکرێ، بەڵکو بۆتە خولیای مێشکی زانایانی بەرزترین مەڵبەندەستێرە گەری و زانستگەریەکان.

ئەوەی جیهانی زانستی ئەمڕۆی هەژاندووە، ئەوەیە کە کونی ڕەش کات دەوەستێنێ..!

بەڵێ.. کاتیش وەکو دەنگ و ڕۆشنایی دەربازبوونی نیە لە هێزی کێش کردنی ئەمانە.

بەڵێ... کات لە کونی ڕەشدا دەوەستێ، چونکە هێزی کێشکردنی کونە ڕەشەکان نزیکە لە ناکۆتاییەوە، بۆیە چونە ناو کونە ڕەشێکەوە وەکو چوونە ناو جیهانی مانی هەتا هەتایی وایە[١].

هەموو ئەستێرەیەك لە بوونەوەردا کۆتاییەکی هەیە، بەڵام ئەم ئایەتە تایبەت نیە بەیەك ئەستێرەوە، بەڵکو هەموو ئەستێرەکانی ناو گەردوون دەگرێتەوە.

لێرەدا گرنگترین سیفاتی کونە ڕەشەکانمان بۆ دەردەکەوێت کە نابینرێن و بە خێراییەکی زۆر دەڕۆن و هەر شتێك بێتە سەر ڕێیان قوتی دەدەن، بۆیە قورئانی پیرۆز ڕاستیەکان دەپێکێت، ئەو وشانەی کە قورئان لەم بابەتەدا بەکاری هێناون ڕوونترو ئاشکراترە لەوانەی کە زانایانی ڕۆژئاوا بەکاری دەهێنن، ئەوان بە کونە

---

(١) الکون العمیق، لا ١٤٢.

ڕەشەکان ناوی دەبەن، ئەم ناونانە لەسەر زمانی یەکێك لە زانایان هاتوە، کە گومانی برد لە ئاسماندا کون هەیە واتە (شوێنی بۆش) بۆیە ناوی نا (کونی ڕەش) بەڵام دوایی دەرکەوت کە کێشی ئەو تونێلانە زۆر زۆرە بە ئەندازەیەك کە بلیۆن بلیۆن بلیۆن تەن دەکات، ئەم کێشە زۆرە لە بازنەیەکی تەسکدا کۆدەبێتەوە، کە بە تونێلی ڕەش ناسراوە، بەڵام قورئان بە تونێلی ڕەش ناوی نەبردووە، چونکە کون واتە: بۆشایی بە پێچەوانەوە ئەم تەنانە بۆشایی تێدا نیە، بەڵکو کێشی زۆرو هێزی کێش کردنیان لە لوتکەدایە زۆر بەهێزە[1].

ئەم ئەستێرەیەش ناونرا بە ئەستێرەی ڕەش، بەڵام ئەو ناونانە هەڵەیە، چونکە هیچ کام لەم تونێلانە نابینرێن کە گەورە زانایانی بواری گەردونزانی باسی دەکەن، ئایا تونێلی ڕەش بەڕاستی ڕەشە لە ئەنجامی توێژینەوەی زانایان ئەوە دەرکەوت کە ئەم کونانە هیچ ڕەنگێکیان نیە چونکە نابینرێن.

خوای گەورە بوارێکی گەورەی کێشکردنی داوە بەم ئەستێرانە، بەڵام سنوور دارە چونکە پشتێنەیەك بە دەوریدا دێت و توانای ئەو لە سنوری ئەو پشتێنەیە دایە، لە دەرەوەی ئەم بوارە ناتوانێ هیچ بکات، بەڵام هەر تەنێك بچێتە ناو ئەو بوارەوە نامێنێت و دەبێتە ڕووناکی و جارێکی تر نابینرێتەوە، بۆیە ئەگەر ئەو پشتێنەیە نەبوایە هەموو شتێکی لە بونەوەر قوت دەدا!

هەندێك بەهەڵە وا تێگەیشتبوون کە کون یان درز لە گەردوون یان لە (ئاسمان) هەبێت، بەڵام با ڕاستی ئەم بابەتە بزانین کامەیەو قورئان چۆن باسی دەکات؟

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾][2].

---

(١) لێرەدا هەست بە بەزەیی خوا دەکەین لە بێتوانایی ئەم تونێلانە لەسەر تەنە دوورەکان، چونکە ئەگەر وا نەبوایە لەمێژ بوو زەوی لووش درابوو، چونکە گەلە ئەستێرەکەمان ملیۆنان تونێلی ڕەشی تێدایە! زانایان دەڵێن: ئەم تونیلانە گۆڕستانی گەردوونین، چونکە قۆناغی مردنی ئەستێرەکانن.

(٢) سورة ق، الآية: (٦).

**لەم ئایەتە پیرۆزەدا سێ ڕاستی زانستی گەورە هەیە کە ئەمانەن:**

١- کە دەفەرموێت: [ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا ] ئەوە دەگەیەنێت کە گەردوون (ئاسمان) بونیات نراوە کە ئەوەش زانستی نوێ جەختی لێ دەکاتەوەو زاناکان لە توێژینەوەکانیان ئاماژە بەو ڕاستیە دەکەن و دەری دەخەن کە ئەندازەیەکی گەردوونی زۆر جوان دەستی بەسەر گەردووندا گرتووەو کۆنتڕۆڵی دەکات، تەنانەت هەسارەو ئەستێرەکان و مەجەرەکان و گەلە مەجەرەکان بە هەموویان بونیادی قەشەنگ و جوانی گەردوون پێکدەهێنن، خۆ ئەگەر بە چاوێکی ووردبوونەوە سەیری ئەم گەردوونە بکەین، ئەوا دەبینین کە گەردوون دونیایەکی بێ سنوورە لە جوڵەو چالاکی گەردوون پڕە لە مەجەرەو ئەستێرەو هەسارەو هەسارۆکەو تەنی ئاسمانی دیکەو تۆزی گەردوونی و دوکەڵ و وزەو تیشکی گەردوونی، بۆیە بیناکردنی گەردوون زۆر زۆر موحکەمە[1].

٢- کە خوای گەورە دەفەرموێ [وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ] ئەوە باس لە جوانی ئاسمان دەکات، کە چۆن ڕازێنراوەتەوە بە ئەستێرەو مەجەرەکان، کە ئەوەش بێ هیچ مشت و مڕێك بۆ زاناکان ساغ بۆتەوە، کە هێشوە مەجەرەی وا هەیە کە ئاسمانیان بە ڕەنگە دڵڕفێنەکان ڕازاندۆتەوەو ئەو مەجەرانە هەروەك دەنکەی تەسبیح و مرواری هۆنراوەتەوە.

٣- کاتێك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ ][2].

هەندێك وا تێگەیشتن کە لە ئاسماندا کون یان بۆشایی و درز هەن کە ئەوەش بۆچونێکی هەڵەیە کە پێویستی بەڕاست کردنەوە دەبێت، چونکە هەندێك جار لە نێو زاراوەکانی زاناکاندا زاراوەی هەڵەش دەبێت، کە پاش ماوەیەك ڕاست دەکرێتەوە، بەڵام زاراوەکە هەر دەمێنێت.

---

(١) الکون العميق، لا ١٤٧.

(٢) سورة ق، الآية: (٦).

ئەوە ئەو گەردوونەیە کە ئەمڕۆ زانا گەردوونیەکان بە گشتی پێی قایلن کە (٧٤٪)ی وزەی ڕەشەو (٢٢٪)ی ماددەی ڕەشەو تەنها لە (٤٪) ی گەردوون بریتیە لە گەردیلەکانی ماددەی ئەسایی کە ئێمەی مرۆڤ دەتوانین ببینین، واتە: قەوارەی زانیاریەکانی ئێمەی مرۆڤ لەم گەردوونەدا لە (٤٪) ی تێپەڕ ناکات[1]!!

بۆیە لە کۆتاییدا دەگەینە ئەوەی، کە گەردوون بە تەواوی پڕە لە ماددەو وزەو بە هیچ جۆرێك کون یان درز یان بۆشایی تێدا نیە، بەڵکو گەردوون بینایەکی مەحکەمی جوان و ڕازاوەیەو لە چەندین شوێنی قورئانی پیرۆزدا سەرنجمان بۆ ئەو ڕاستیە ڕادەکێشرێت، بۆیە پێویستە ئێمەش بەچاوی لێوردبونەوەو بیرکردنەوە سەیری ئایەتەکانی بکەین وەك فەرموویەتی: [أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ۝٦].

---

(١) الكون العميق، لا ١٤٨.

## ڕاپۆرتێکی ئەمریکی چاودێری دیاردەیەکی ترسناک دەکات

چەند برگەیەك و پارچەیەکی بچوك کە گۆڤاری ئۆبزێرڤەری بەریتانی لەم دواییانە بڵاوی کردۆتەوە، ئەمەشیان ڕاپۆرتێکی نهێنی بووە بۆ پنتاگۆن کە ترسێکی گەورەی پەیدا کردووە لە وڵاتانی ئەوروپاو ویلایەتە یەکگرتووەکان.. ئەم هەواڵە پاڵی بە زۆرێك لە خەڵکی وڵاتە ئەوروپییەکان ناوە بۆ ئەوەی داوا بکەن لە (واشنطن) کە دەقی ڕاپۆرتەکە بڵاوبکاتەوە کە بووەتە هۆی تەنگژەو دەنگە دەنگ لەناو ملیۆنان ئەمەریکی و ئەوروپییەکان، هەر چەندە ناکۆکیەکی زۆر هەیە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا لەسەر ئەو ڕاپۆرتەی کە بڵاوبۆتەوە، تا ئێستا ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕەتی ئەوەی کردۆتەوە کە ڕاپۆرتەکە بڵاوبکەنەوە.

ئەم ڕاپۆرتەش کە جێگەی قسەیە لە جیهاندا لە کۆتایی ساڵەکانی ڕابردوو دەرچووەو پێشبینی ئەوە دەکات کە ئەم بونەوەرەی تیایدا دەژین پاش (٥٠) ساڵ لەناو دەچێت و نامێنێت.

ئەو گۆڕانکاریانەی کە پەیوەندی بە کەش و هەواوە هەیە سەر دەکێشێت بۆ لەناو چوونی چەند وڵاتێك و بە دەرکەوتنی چەند وڵاتێکی تر، مرۆڤایەتی دەگەڕێتەوە سەردەمەکانی پەیدابوونی مرۆڤ و ژیانی سەرەتایی، ئەم زانیاریانە بە هۆی گۆڕانکاری کەش و هەواو هەسارەکانی تر بە دەرکەوتووە.

لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە کە وزەیەکی تاریك دەستی بە جولان کردووە لە ساڵی (٢٠٠٣)، هەر چەندە پێشتر ملیۆنان ساڵە کە تا ئێستا ئەو هێزەی نەبووەو ئەو وزەیەی لێ پەیدا نەبووە[1].

---

(١) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٠٠٧/٠٦/٢٤, ١١:٠٠ PM.٧ .١ تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.

ئەو ڕاپۆرتەی کە جێگەی تێڕوانینە زۆر پرسیار پەیدا دەکات دەربارەی ژیانی مرۆڤ لە سەر ڕووی زەوی، کە پێشبینی دەکرێت بە هۆی ئەو (ئیحتباسی حەراری)[1]یەی هەیە زەوی بچێتە قۆناغێکی نوێ، چونکە مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ ئەو کەش و هەوایەدا بژیت.

ڕاپۆرتەکە وا دەبینێت کە ناوچەی (شرق الأوسط) کە ناوچەی وڵاتە موسڵمانەکانە، زۆر بومەلەرزەو گۆڕانکاری تیایدا ڕوویدات، بەڵام لە هەموو جێگایەك باشتر دەبێت لەسەر ڕووی زەوی بەرامبەر ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەسەر زەوی دا ڕوودەدات.

ئەوەی جێگای سەرنجە پێش ئەوەی بچینە ناو ئەو وردەکاریانە، ئەو ڕاپۆرتە لایەنی سەربازی ئامادەی نەکردووە لە پنتاگۆن، بەڵکو گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە لە ماوەی پوختەی چەند لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەك کە (١٢) ساڵی تەواو بەردەوام بووە، ئەمەشیان پرۆژەیەکی نوێ بووە کە پنتاگۆن پشتگیری کردووە لە ساڵی (١٩٩٢)، ئەو توێژینەوەیەش نزیکەی (١٢) ساڵی تەواو خەریك بوون چاودێریکردنی کەش و هەوا کە ڕوو لە زەوی دەکات لە ڕێگەی هەسارەکانی تر گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە، هەروەها زەویش توشی ئەو گۆڕانکاریانە دەبێت، بە تایبەتی لە مانگ و مەریخ لە ڕێگەی چەند کەشتیەکی ئاسمانی کە ئەمریکا بە نهێنی ڕەوانی کردووە، بۆ ئەوەی ئاسمانی زەوی ببەزێنێت و بچێت بۆ چەند هەسارەیەك[2].

---

(١) بەرزبوونەوەی پلەی گەرما.. بەڵێ.. پلەی گەرما زۆر بەرز دەبێتەوە، چەند ساڵێك لەمەوبەر واتە: لە ساڵی ٢٠٠٩ لە مانگی شەش ڕاپۆرتێك خوێندرایەوە کە خۆم گوێم لێ بوو باسی لە بەرز بوونەوەی پلەی گەرما ئەکرد لە یەکێ لە کەناڵەکانی ئاسمانی دەیگوت: لەساڵی ٢٠٠٩ هەتا ساڵی.. ٢٠١٥، ساڵانە نزیکەی (٣٠٠٠٠) هەزار کەس دەمرێت بە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەسەر ئاستی جیهان، چونکە گەرمیەکە ئەوەندە زۆر دەبێ لە سنووری خۆی دەردەچێت.

(٢) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٠٠٧/٠٦/٢٤, ١١:٠٠ PM.ل ٢. تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.

هەروەها ناوچەی (موعتەمە) کە جێگەیەکی تاریکەو ڕووناکی نایگاتێ، ئەوانەی بەو کەشتیە ئاسمانیانە دەچنە بۆشایی ئاسمان چەندەها ئامێری فەنی وردو تەکنەلۆجیای نوێ بە کەشتیە ئاسمانیەکانەوە بەستراوە، کە پێشتر بە ئاشکرا نهێنیەکانیان نەدرکاندبوو ئەمەشیان لە سەنتەرێکی ویلایەتی (فلۆریدا) ئەنجام دابوو، ئەم سەنتەرە نزیکەی (١٥٠٠) زانای تایبەتمەندی لە خۆ گرتبوو، کە پسپۆڕ بوون لەو بوارەدا ئەم زانایانەش پوختەی عەقڵی بەشەری بوون، بۆیە زۆربەی زۆری زاناکان (ئەمریکی و ئەوروپی و ئەفەریقی و ئاسیایی) بوون، ئەم پڕۆژەیەش (١٧) ملیۆن دۆلاری تێدا سەرف کراوە، جگە لەو زانایانەی کە سەر پەرشتی ئەو پڕۆژەیان کردووە، بە بەشی هونەری کە سەرپەرشتی دەکەن بە گرتنی وێنەکانی مانگی دەستکردو ئەو کەشتیانەی ڕەوانە کراون، ئەو سەرپەرشتی کارانەی کە کاریان لەسەر کردووە (٣) لە گەورەترین زانایانی سروشتین لە (واشنطن) کە ئەمانەن (دایث تاریال.. سولانا مروزی.. فتمولون ماشینز)، هەروەها هەموو توانایەکیشیان خستبۆوە بەر دەستی ئەم زانایانە، بۆ ئەوەی کۆتایی بەم ڕاپۆرتە بهێنن.

یەکێ لەو سەنتەرانەی کە بۆ ئەم ڕاپۆرتە دانرابوو لە نهۆمی (١٦)م بوو، کە یەکێك بوو لەو تاوەرانەی تەقێنرایەوە لە (١١)ی سێبتەمبەری ساڵی (٢٠٠١) ئەم تاوەرەش ناوەندێك بوو لێکۆڵینەوەی ڕاپۆرتەکەی تیادا ئەنجام دەدرا، جگە لەوەش ئەو بەشە هونەریەی کە سەرپەشتیان دەکرد پەیوەندیان هەبوو لەگەڵ زانایانی سروشتی و زانایانی (فضاء) لە (بەریتانیاو فەرەنساو ئیتاڵیاو یۆنان و هۆڵەنداو ئەڵمانیاو مالطا.. هتد) لەم پڕۆژەیەدا (٣) زانای شارەزای ئیسرائیلیشیان لەگەڵ بوو، ئەو گرووپەش پشتگیری کرابوو بە دوو لە زانایانی لاهوتی ئایینی، بۆ زانین و تێڕوانینی ئایین و شەرع بۆ ئەوەی بزانن ئایا لە ئاینەکانیاندا شتی وا باس دەکات[1].

---

(١) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٤/٠٦/٢٠٠٧, ١١:٠٠ PM.ل ٣. تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.

وە داوایان لە هەندێ لە زانایانی موسڵمانیان کرد بۆ ئەوەی بەشداری بکەن لە ڕاپۆرتەکەدا بەڵام موسڵمانەکان ڕەتیان کردەوە بەشداری تێدا بکەن، بەڵام توانیان زانایەکی بیرکاری موسڵمانی ئەمەریکی بهێنن کە لە بنچینەدا باوك و باپیرانی خەڵکی ئاسیا بوون، شارەزایی لە زانستی قورئان و مانای قورئان هەبوو، ڕاپۆرتەکە نهێنی بوو، بەڵام با بزانین چی لێ هات؟

هەر چەندە پنتاگۆن توانی بۆ ماوەی (١٠) ساڵ پرۆژەی ئەم نهێنیە ڕانەگەیەنێت، بەڵام لەم ساڵانەی ڕابردوو چەند زانیاریەکی جیاجیا بڵاودەبویەوە دەربارەی ئەو پرۆژەی کە پێشتر نەزانرابوو.

وە ئامانجی پنتاگۆن لەم ڕاپۆرتەدا دەست گرتن بوو بەسەر دەسەڵات لە زانستەکانی (فضاء)، چونکە زانستی (فضاء) یەکێکە لە بنەماو پێشکەوتنی زانستی لە ماوەی داهاتوو، بەڵام دەرکەوت کە ئەنجامەکە ڕاست نیە لەوەی کە پێی گەیشت، چونکە ڕاپۆرتە نهێنیەکە چەند ئەنجامێکی لێ پەیدا بوو، ئەو ئەنجامەش پەیوەندی بە سەیطرەکردنی نیە لەسەر (فضاء).

بۆیە لە یەکەم دێڕی ڕاپۆرتەکە دەنوسن (نهاية العالم تبدوا قريبة) واتە: کۆتایی جیهان بە دەردەکەوێت کە نزیك بوو بێت.

لە ڕاپۆرتەکەدا دەڵێ: چەند گۆڕانکاریەکی زۆر بەهێز هەیە، کە سەر دەکێشێت بۆ وەرگێڕانی هاوسەنگی لەسەر ڕووی زەوی، وە زۆرێك وەردەگێڕدرێت لە دیاردەکانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی زانستی، ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆجیایەی کە ئێستا هەیە لە ژێر هەڕەشەی لەناو چوون و تێکچوونە لە چەند ساڵی داهاتوودا[1].

وە چاودێری کراوە کە بە ملیۆنان نەیزەك بەردی گەورەو بچوك بە خێرایی بەرەو ڕووی هەسارەی زەوی دێن و بە یەکتر کەوتوونە، بۆیە هەندێك لە دیاردەی

---

(١) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٠٠٧/٠٦/٢٤, ١١:٠٠ PM. ٤ ٦. تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.

ئەو لەناو چوونە کە لەسەر زەوی هەستی پێناکرێت ڕوویداوە، بەڵام چاودێری خوای پەروەردگارە کە لە ئەنجامی ئەو پێکدادانەی نەیزەکەکانی پاراستووە لە زەوی، بەڵام وا بەدیار دەکەوێت ملیۆنان تەنی کەونی دیکە چاوەڕێ دەکەن کە بەرەو ڕووی زەوی بێن، ئەو تەنانەش کاتێ کە دێن جوڵەی زەوی ڕاناگرێت و لە ڕۆیشتنندا زۆر بەهێزە، تا وای لێدێت هیچ هەسارەیەك هیچ نەیزەکێکی تر خۆی لەبەر ڕاناگرێ.

بە پێی ئەو هەڵێنجانە زانستیەی کە هەیە ئەم تەنانە لە زەوی دەدات لە (٢٥) ساڵی داهاتوو، چونکە ملیۆنان کیلۆمەتر دەڕوا، بۆیە هەرچەند لە زەوی نزیك بێتەوە گۆڕانکاری زیاتر لە کەش و هەوا ڕوو دەدات، هەندێك گۆڕانکاری ڕووی داوە ئەم گۆڕانکاریانەش تیژترو بە هێزتر دەبن لە (١٠) ساڵی داهاتوو، ئەمەش بە پێی ئەو گۆڕانکاریانەی کە ڕوودەدات لە سەر زەوی.

چەند ناوچەیەك هەیە کە زەریاکان و دەریاکان کاری لێکردوونە، ئینجا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە دەریاچەی ئەتەڵەسی یەکێکە لە ترسێنەرە گەورەکان لە داهاتوو، بە پێی هەڵسەنگاندنی زانستی ئاوی زەریاو دەریاکان بەرز دەبێتەوە چەند ئەوەندەی کە ئێستا لەسەرە، ئەو زیادبوونەش سەردەکێشێت بۆ ئاستی ئاوەکە، ئاوی دەریاکان ئەوەندە بەرز دەبێتەوە مەزەندە دەکرێ (٢٠) هێندەی ئێستا بەرزتربێت .

ئەوەی کە لە هەمووی ترسناکترە ئەو ئاوانەیە کە نزیکن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەندێکیشیان دەڵێن: پێشبینی دەکرێت کە (٤٠) هێندەی ئێستا ئاوی دەریاو زەریاکان بەرزتر بێت و لە ٨٠٪ ی زەوی دەکەوێتە بارێکی ترسناك، وە لافاوێکی زۆر گەورە وەکو شۆڕشێك دێت هەروەکو لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە.

هەروەها کەش و هەواو گۆڕانکاری بارانەکە ئەوەندە زۆر دەبێت کە مەترسی دەبێت بۆ هەموو ئەو وڵاتانەی نزیکن لە ئەوروپاو ئەمریکا، بە تایبەتی (الانهمار المطري) واتە: بەردەوامبوونی باران کە بە تایبەتی لە بەشی ئەوروپاو ئەمریکاو بەشێك لە ئاسیا کە وڵاتی (چین)ە، ڕووبەڕووی ئەو کارەساتە دەبنەوە.

پاڵنەری سەرەکی بۆ ئەو دیاردەیەی کە گوتمان (الانهمار المطري) ڕاپۆرتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە گۆڕانکاریەکی زۆر توندو بەهێز لە هەسارە نزیکەکانی دەوروبەری زەوی ڕوودەدات، ئەمەش کە ڕوویدا زەوی بە جوڵە دەکەوێ بە پێی ئەو ئەستێرانەی دەوروبەری، بەڵام ئەگەر گۆڕانکاری ڕوویدا ئەوا کاریگەری لە زەویش دەکات.

لێرەدا بە دەردەکەوێت کە ئاستی ئاو لەو چوار چێوەیە نامێنێتەوە کە پشك پشك ببارێت لە ئاسمان و بکەوێتە سەر زەوی وەکو ئێستا، بەڵکو وای لێدێت باران وەکو تاڤگە لە ئاسمان دێتە خوارەوە، ئەمەش ئاوا قوڵ دەبێت لە ئەمریکاو ئەوروپا هەتا وای لێدێت دێتە ئاستی زەوی، چونکە ئاستی دەریاکان و زەریاکان زیاتر لە ٥ و٦ ئەوەندەی لێدێت کە ئێستا هەیە، ئەو تاڤگانە وەها کۆدەبێتەوە لەسەر بەشێکی جیا جیا لە ئاستی بوونەوەر لە سەرەوەی ئاسمان کە لە زەویەوە دوورە.

بە پێی ئەو زانیاریانەی کە دەرکەوتووە ئەو ئامێرە هونەریانەو وردەکاریانە دووپاتیان کردۆتەوە، کە کەشتیە ئاسمانیە ئەمەریکیەکان ئامێری وردیان پێوەلکێندراوە، ئەم کەشتیە ئاسمانیانە ڕەوانە کراون بۆ دەرەوەی زەوی و چونەتە ناو بۆشایی ئاسمان[1].

لە کاتی ناردنی ئەم کەشتیە ئاسمانیانە دەرکەوتووە، کە لە بۆشایی ئاسماندا چەند پارچە هەورێك کۆبووەتەوە، زانایانیش ناویان لەم پارچە هەورە ناوە (سحب) بۆ ئەوەی ئێمە لە ڕووی زانستی وردبین، کە هیچ سەرچاوەیەکی ئاوی نیە زیاد بکات لە بۆشایی ئاسماندا، ڕاپۆرتەکە دەڵێت: ئەمە(٤) ساڵە ئەم پەلە هەورانە کۆدەبێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەو دیاردە ترسناکەی کە گوتمان: (الانهمار المطري) بەڵام ڕاپۆرتەکە دووپاتی دەکاتەوە کەوا بەشێك لەو دیاردەیە پێش زیاتر لە ملیۆنێك ساڵ ڕوویدابوو، لەگەڵ ئەوەش ئەو گۆڕانکاریانەی کە ڕوویداوە پێشتر بەو هێزو توانایە نەبووە کە لە داهاتوو ڕوودەدات، بەڵام چەند

---

(١) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٠٠٧/٠٦/٢٤, ١١:٠٠ PM.لا ٦. تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.

شارستانیەتێك هەبوون لەناو چوون، بۆیە زۆرێك لە زەوی کەوتە ناو دەریاکان و زەریاکان.

هەروەها ئەو گازو هەوایەی کە پارسەنگی خۆی دەپارێزێ بۆ مرۆڤ خەلەلێکی زۆر گەورەی تێدەکەوێت، چونکە تێکچوونی کەش و هەوا لە بەرژەوەندی مرۆڤدا نیە، وە زۆرێك لە گاز و هەوای زەرەرمەند بڵاودەبێتەوە، مەترسی بۆ مرۆڤ هەیە بە شێوازێکی وا جێگای گازە سودبەخشەکان دەگرێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی زۆرێك لە بڕی ئۆکسجین کەم بێتەوە، کەوابوو ناتوانێ بەرگری بکا لەو کەش و هەوایە نوێیە، تەنها ئەوەی کە لاشەی زۆر زۆر بە هێز نەبێت، هەر نەخۆشیەکیش تووشی مرۆڤ بێت بێ توانا دەبێ لە ژیان، وە بڵاوبوونەوەی کەمی ئۆکسجین دەبێتە یەکێك لەو نەخۆشیانەی کە سەردەکێشێت بۆ دەیان هەزار کەس کە ناتوانن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەو کەش و هەوایە نوێیە، ئەوانەی زیندوشن پێویستە بژین لەگەڵ ئەو کەمە ئۆکسجینەی کە هەیە، بە پێی ئەو ڕاپۆرتە کەمبوونی ئۆکسجین تەنها لە ئەمریکا کەم نابێت، بەڵکو لەسەرتاسەری جیهان کەم دەبێت..

وە یەکێك لە کێشە گەورەکان ئەوەیە هەر کاتێ ئۆکسجین کەمی کرد ئەوا نەخۆشیەکی نوێ پەیدا دەبێت کە پێشتر نەبووە، ئەم نەخۆشیەش زۆر کار لەسەر فیکری مرۆڤ و سیەکانی دەکات، وە ئەو منداڵانەی کە تازە لە دایك دەبن توشی ئەو نەخۆشیانە دەبن، ئەمەش وا پێویست دەکات کە زاناکان ماندووبوونێکی زۆر سەرف بکەن، بۆ دۆزینەوەی چەند ڕێگە چارەیەك و کوتانێك یان دەرمانی نوێ، جا بە پێی پێوەری زانستی ئەو نەخۆشیە نوێیانە دەبێتە هۆکاری ئەوەی خێرا ئەو مرۆڤە بمرێت، یان پاش ماوەیەکی کەم بمرێت[1].

ئەوەی کە لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ئەو نەخۆشیە نوێیانە زۆر زۆر ترسناکترن لەو نەخۆشیانەی کە لەو سەردەمەدا زۆر بڵاون وەك ئایدز، بە پێی

---

(١) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٤/٠٦/٢٠٠٧, ١١:٠٠ PM.لا ٧. تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.

ئەو نەخۆشیە نوێیانەی کە بڵاودەبێتەوە لە جیهان، بۆیە ئەوانەی کە توشی نەخۆشی ئایدز بووینە زیاتر ئەمەلی چاك بوونەوەیان هەیە، نەك ئەوانەی توشی ئەو نەخۆشیە نوێیانە دەبن.

هەروەها بەرز بوونەوەی پلەی گەرما لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کەش و هەواو بە پێی ئەو دیاردەیە ئەمە سەردەکێشێت بۆ جۆرەها نەخۆشی، کەوابوو بارینی ئەو بارانە تەنها مەترسی بۆ ئەوروپاو ئەمریکا پەیدا ناکات، بەڵکو بۆ هەموو جیهانە، چونکە چەند بایەکی نوێ دێت ئەو بارانە دەگوازێتەوە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر لەسەر زەوی، بەڵام چ دیاردەیەك وا دەکات کە جیهان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر زەوی بکەن، ئەو ڕاپۆرتە دەڵێ: پەیوەندیەکی ئاڵو گۆڕ هەیە لەسەر ئاسۆیەکی کەونی بونەوەر کە دەسەڵاتی مرۆڤی تێدا نیە ئەم پەیوەندیەش لەگەڵ ئەوەی کە هەیە لەسەر زەوی.

هەروەها (طاقەی معتمة) کە زەوی دەپارێزێ، ئەمەش وەکو دیوارێکی ئەمین وایە بۆ زەوی، بۆیە ئەو (طاقەی معتمة) ئاوا بە دەردەکەوێت کە زۆر زۆر بێ سنورە.

ڕاپۆرتەکە دەڵێت: بە هەر حاڵەتێك بێت چەند زانست بەرەو پێش بچێت ناتوانێت ئەو (طاقة معتمة) لەناو ببات، هەروەها ڕاپۆرتەکە گەیشتە ئەو ئەنجامە زانستیەی کە ئەو (طاقة معتمة) هەسارەی زەوی دەپارێزێ لە لاچوون و مەداری جێگای خۆی کە دەسوڕێتەوە.

وە هەموو گەردیلەکانی ناو ئەو (طاقة معتمة) وزەیەکی بێجوڵەیە، بۆیە ئەو کپی و بێ جوڵەیی ئەو گەردیلانەی ناو (طاقة معتمة) وا دەکات کە زەوی بە جوانترین شێوە بسوڕێتەوە لە مەداری خۆی و لانەدات، چونکە ئەگەر لە مەداری خۆی لایدا ئەوە سەر دەکێشێت بۆ لەناوچوونی، ئەگەر خواریش بێت ئەوا شەو و ڕۆژ درێژ دەبێت، یان هەندێك جار ئەو لادانە لە مەداری خۆی سەر دەکێشێت بۆ ئەوەی لایەك بیبەستێت و لایەکیش گەرم بێت، بەڵام ئەو (طاقة معتمة)و ئەو گەردیلانە لێ ناگەڕێت.

بەرگی یەکەم

بە پێی ئەو ڕاپۆرتە جوڵەی زەوی جێگیرەو ناگۆڕێت کە لا بدات، ڕاستە بناغەکەی ئەگەر بگەڕێتەوە سەر گەردیلەی ئەو (طاقة معتمة) کە جولە ناکەن، بەڵام لە دوای ئەویش هێزێکی زۆر زۆر بەهێز هەیە کە ئەو هاوسەنگیەی ڕاگرتووە، ئەم هێزە گەورەش تەنها خوای بەدەسەڵاتە.

تێبینی ئەوە کراوە کە لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٣) بە ئاسۆیەکی زۆر زۆر بەهێز و نوێ لاچووە، ڕاستە ئەو بەشانەی دەوروبەری زەوی بە کەمی دیارە، بەڵام ئەگەر حیسابی زەوی بکەین چەند هەزار کیلۆمەتر دەکات، بەڵام بە حیسابی کەونی لەوانەیە لەچاو هێزی خۆی کەم بێت.

هەروەها پەیدابوونی ئەو دیاردە نوێیەی کە (انحسار جزئي) پێ دەگوترێت، بە پێی ئەنجام و زانستی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو گەردیلانەی ناجولێن دەستیان بە جولان کردووە، دەبێ ئەمەش ئەنجامی جولان بێت، جا بە جوڵە کەوتنی ئەو گەردیلانە بەدیلەکەی تەنها زیانە بە هەسارەی زەوی، کەوابێ (معارض)ە بۆ ئەوەی کەوا زۆر بە توندی بهەژێتەوە لە ئەنجامی پێکدادانێکی زۆر بە هێز لە نێوان بەشێکی ئەو (طاقة معتمة)یەو هەسارەی زەوی[1].

تێبینی ئەوەش کراوە کە بە جوڵە کەوتنی (طاقة معتمة) لە گۆشەی زەوی بەشی ئەمریکاو ئەوروپایە، بەڵام زانایان دووپاتیان نەکردۆتەوە ئایا پێکدادانی زەوی هەموو دەهەژێتەوە یان بەشێکی؟

هەندێك دەڵێن: بەشێکی بەهێز کاری لێ دەکات لە چوار چێوەی گۆشەی وڵاتە ئەوروپییەکان، بەڵام ئەو ڕاپۆرتە ئاماژە بۆ چەند جێگایەکی گرنگ دەکات کە زیاتر ئەو ئاویەی لێ ڕوودەدات و (٤) هێندەی خۆی زیاد دەبێت، بۆیە ئەم ئاوەش ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتە ئەوروپییەکان و ڕۆژئاواییەکان ژێر ئاو دەکات، جا ئەندازەی ئاوەکە ئەوەندە بەرز دەبێتەوە تا وای لێدێت خەڵکی ناوچەکە بە ناچاری ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵن و بڕۆن، وە چاوەڕێی ئەوەش دەکرێت کە

---

(١) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٤/٠٦/٢٠٠٧, ١١:٠٠ PM.٧ ٨. تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.

دەریای ناوەڕاست توشی ئەم هەڵقولانی ئاوە بێت و ئاوێکی زۆری لێ بکەوێت و زیاد بکات.

ڕاپۆرتەکە دەڵێت: جیهان ئێستا بارگەیەکی زۆری هەیە لە چەکی نەوەوی و هەڵیگرتووە، جگە لەوەی هەر چەندە ئەو چەکانە بەکار نەهاتووە، ئەگەر پێشبینی ئەوە بکەی کە شەڕێکی چەکی ئەتۆمی ڕوویدات و ئەو وڵاتانەی کە چەکی ئەتۆمیان هەیە، لەو کاتەدا ئیشەکە زۆر زۆر ترسناکتر دەبێت، بۆیە چەند حاڵەتێکی نوێمان بۆ بە دەردەکەوێت لە ترسناکی جیهانی.

بە پێی ڕاپۆرتەکە ئەو گۆڕانکاریە توندەی کەش و هەوا کە ڕوودەدات وا دەکات ئەو چەکانەی کە هەڵگیراوە هەمووی تێکبدات، چونکە ئەو ئاوە ئەگەر زۆر بوو دەچێتە ناو چەکەکان و تێکی دەدات، ئەوەش وادەکات کە وڵاتانی جیهان خۆیان دەرباز بکەن لەو چەکە نەوەویانە جا بەهەر هۆیەك بێت، هەتا وای لێدێت چەکی ئەتۆمی لەکار دەکەوێت و تیشکەکانی بڵاودەبێتەوە ئینجا خەڵکی توشی جۆرەها نەهامەتی و نەخۆشی دەبێت[1].

ڕاپۆرتەکە دەڵێت: چەند نەخۆشیەکی نوێ ئەو گۆڕانکاریانە پەیدا دەکات، لە پێش هەمووشیان نەخۆشی ئینفەلەونزایە کە پەسیوێکی زۆر ترسناکە[2]،

---

(١) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٠٠٧/٠٦/٢٤, ١١:٠٠ PM.لا ٩. تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.

(٢) ئینفەلەونزا نەخۆشیەکی بڵاوەو هۆیەکانیشی چەندین جۆری جیاوازە لە ڤایرۆس، نەخۆشیەکی درمیەو زۆر بەخێرایی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوازرێتەوە، کاتێك خەڵکێکی زۆر لەناوچەیەك توشی دەبن پێی دەڵێن: پەتای ئینفلەونزا.
ئایا دەزانن هۆیەکانی ئینفلەونزا چیە ؟
سێ جۆر ڤایرۆس دەبنە هۆی ئینفلەونزا کە بەسەر گرووپەکانی (أ. ب. ج) دا پۆلین کراون، لەمانەشەوە هەندێگ گرووپی تری لاوەکی دروست دەبن، ڤایرۆسی ئەنفلەونزا لە گرووپی (أ) هەموو دووبارە بوونەوەیەکی لە دوو ساڵ بۆ سێ ساڵە، بەڵام ڤایرۆسی گرووپی (ب) لە چوار بۆ پێنج ساڵە.
ئینفلەونزا لە هەموو تەمەنێکدا توشی مرۆڤ دەبێت، بەزۆری لە زستاندا بڵاودەبێتەوە، بە هۆی کۆکین و پژمەوە لە کەسێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر، جا ڤایرۆسی ئەم

هەروەها بڵاوبوونەوەی برسیەتێکی زۆر لەسەرتاسەری جیهان، ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەی زۆرێك لە ویلایەتەکانی ئەمریکا توشی (الانهمار المطري) دەبێت و زۆر لە شارە ئەوروپیەکان نوقمی ژێر ئاو دەبن، بۆیە برسیەتی ئەمریکا دەبێتە شتێکی جێگر، هەتا دەگاتە سنورێکی وا ئەو خواردنەی کە لە جیهان هەیە بەشی سێیەکی خەڵکی سەر ڕووی زەوی ناکات و دوو لەسەر سێی خەڵکی سەر زەوی خواردنیان بەش ناکات و نامێنێتەوە.

ئەمەشیان چەند دەرهاوێشتەیی نەتەوەیی لێ پەیدا دەبێت و شارستانیەتی مرۆڤ لەناو دەبات و جیهان توشی وشکایەتی دەکات، ئەم هۆکارەش یەکێکە لە ئەنجامەکانی بڵاوبوونەوەی برسیەتی، ئەو وشکاتیەو وشکەساڵیەش توشی بەشێکی زۆری سەر ڕووی زەوی دێت.

کەوابوو ئەو وڵاتانەی کە چەکی نەوەویان هەیە، دەتوانن چاودێری خۆیان بکەن و ناکۆکیەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان کۆتایی پێ بهێنن.

وە ئەو گۆڕانکاریانە وا دەکەن چەند وڵاتێکی نوێ پەیدابن و چەند وڵاتێکی تریش لەناو بچن، یان ئەو وڵاتانەی ئێستا هەیە فرەوان تر بێت و چەند وڵاتێکی تر داگیر بکرێت و فرەوانی بکات، یان لە ئەنجامی کۆتایی ئەو کێشانە ئەو

---

نەخۆشیەش لە لوت و قورگدا جێگیر دەبێت کە دەبێتە هۆی بژمین و کۆکین و ئاوسانی قورگ، هەروەها لەرزو تاش دروست دەکات لەگەڵ سەر ئێشەو هەست کردن بە ئازاری لاشەو بێ هێزی، تەمەنی درێژی ئەم نەخۆشیە لە سێ بۆ حەوت ڕۆژە، بە دەگمەن نەبێت نابێتە هۆی مردن، ئەوانەش لە ئەنجامی ئەم نەخۆشیەدا دەمرن، هۆیەکەی نەخۆشی ترە، بۆیە هەندێك لە جۆرەکانی ئینفلەوەنزا زۆر سوکەو هەندێکیشی کوشندەیە، پەتای (ئینفلەوەنزای ئسپانی) کە دوای جەنگی جیهانی بڵاوبویەوە، ژمارەی ئەو نەخۆشیانەی لەوانە زیاتر بوون لە جەنگدا کوژران، بۆیە چارەسەرێکی دیاری کراو نیە بۆ ئینفلەوەنزا، دوای چەند ڕۆژێك خۆی سووك دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەرمانی وەکو ئیسپرین بەکار دەهێنرێت، بۆ کەم کردنەوەی کاریگەرەیە ناخۆشەکانی و ئەو پەتایەی کە لەگەڵیدایە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئینفلەوەنزا جۆری زۆرە بۆیە ئەستەمە چارەسەری هەموو جۆرەکان ئامادە بکرێت، بەڵام ئەگەر مەترسی ئەوە کرا پەتاکە بڵاوببێتەوە، ئەوا دەتوانرێت دەرزیەك دژی ئەو جۆرە ئینفلەوەنزایە ئامادە بکرێت کە بڵاودەبێتەوە.

گۆڕانکاریانەی کە تووشی خەڵکی دەبن و ئەو جوڵە نوێیانەی کە توشی زەوی دەبێت یان پێك دادان لەگەڵ هەسارەکانی تر، هەروەها لە ئەنجامی جوڵانی (طاقة معتمة) کە توشی زەوی دەبێت لە چەند بەشێکی سەرەکی[1].



---

(١) موقع سبلة عمان w3.s-oman.net ٢٠٠٧/٠٦/٢٤, ١١:٠٠ PM. لا ١٠. تقرير سري للبنتجون حول تغيرات المناخ.. گۆڤاری ئۆبزێرڤەری بەریتانی، لە سایتی ئینتەرنێتی (الملتقى السوري) وەرگیراوە.. وەرگێردراوە بە دەستکاریەوە..

# وزە هۆکارێکی بنەڕەتی ژیانە

وزە هۆکارێکی بنەڕەتی ژیانە لەسەر ڕووی ئەم هەسارەیەی ئێمە، چونکە مرۆڤ و هەموو ژیانلەبەرانی تر و ڕووەکەکانیش ناتوانن کرداره زیندەگیەکان بە ئەنجام بگەیەنن، تەنانەت ئاڵوگۆڕی وزە لە نێوان تەنە گەردوونیەکاندا بنەمایەکی سەرەکی بەردەوام بوونی ئەم گەردوونە دۆزرایەوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە سەرەتای دروستکردنی گەردوون یەکێك لە پێکهاتە بنەڕەتیەکان کە باسی لێوە دەکرێت وزەیەو بە پلەی یەکەمیش باسکردنە لەو پلە گەرمیە بەرزەی کە گەردوون هەیبووەو پاشان وردە وردە بە تێپەڕبوونی کات گەرمیەکە کەمتربوەتەوە.

بە دروست بوونی ئەستێرەو گەلە ئەستێرەو تەنە گەردوونیەکانی تر ئاڵوگۆڕی وزە بەردەوام بووەو مرۆڤیش ئەمڕۆ لە دوو توێی یاسای دووەمی دینامیکای گەرمیدا باس لە چارەنووسی گەردوون دەکات.

پێش نزیکەی پێنج هەزار ملیۆن ساڵ کاتێك کۆمەڵەی خۆر دروست کراوە، چەقی ئەو هەورە ساردە گەردوونیە لە ئەنجامی سووڕانەوە پلەی گەرمیەکەی بەرزبۆتەوەو بە بەردەوامبوونی ئەو سوڕانەوەیە چەند پارچەیەکی جیابۆتەوەو بەهۆی هێزی کێشکردنەوە لەگەڵ ئەو چەقەدا بەدووری جیاواز لەنگەریان گرت و لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ بە دەوریدا دەسوڕێنەوەو ئەو چەقە بووە ئەو خۆرەی کە هەموومان دەیبینین و پارچەیەکیش لەو پارچانە هەسارەکەی خۆمانە کە زەویە.

پەروەردگاریش ئەو چەقەی کردە سەرچاوەی وزە بۆ هەموو هەسارەکان بە هەسارەکەی خۆشمانەوە، وزەو ژیان لەسەر زەویدا پێکەوە گرێدران و بەڵگە نەویستە کە بەبێ سەرچاوەی وزە پێکهاتەکانی ئەم هەسارەیە ناتوانن بەردەوام ببن[1].

---

(١) گۆڤاری هەیڤ، گۆڤارێکی زانستی وەرزیە، ژمارە (٤) .

کاتێك دەریاو ئۆقیانووسەکان لە هەسارەی خۆماندا دروست بوون و دوای ئەوانیش ڕوەکە سەوزەکان، هەموو ئەمانە بەردەوام بوونیان بەندبوو بە سەرچاوەی وزەیەکەوە کە خۆرەو، ئەگەر ئەو سەرچاوەیە نەبوایە دەریا دەیبەست و کرداری بە هەڵم بوون و خەست بوونەوەو ڕۆشنە پێکهاتن هیچ واتایەکی نەدەبوو، کەواتە وزە پێوست بوو بۆیە پەروەردگار بۆ زەویەکەمانی مسۆگەر کرد.

لەمەوە ئەو ڕاستیە ئاشکرا دەبێت کە خاوەنی ئەم زەویە خۆری ڕەخساندووە بۆ ژیانی بەندەکانی خۆی کە دەفەرمووێ:

[ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ ][1].

واتە: وە هەروەها ڕامی هێناوە بۆتان ڕۆژو مانگ بە هەمیشەیی وە شەوو ڕۆژیشی بۆ ڕام هێناون، وە لە هەموو ئەو شتانە کە داواتان کردووە پێی بەخشیون خۆ ئەگەر بەهرەو نیعمەتەکانی خوا بژمێرن بۆتان ناژمێردرێن بەڕاستی ئادەمی زۆر ستەم کارو سپڵەیە.

مرۆڤ ئەمڕۆ لەسەردەمی زانست و تەکنەلۆژیادا دەژی و سەر گەرمی گەڕانە بەشوێن سەرچاوەیەکی وزەی نەبڕاوە، چونکە خەڵوزو نەوت و گاز تەنانەت وزەی ئەتۆمیش جێگای متمانە نین بۆ داهاتوو، لەبەر ئەوەی ڕۆژێك دێت دوور نیە لەچەند ساڵێك تێپەڕ نەکات ئەو سەرچاوانە بنەبڕببن و ئەو کاتەش مرۆڤ بەبێ وزە ژیانی مەحاڵ دەبێت[2].

---

(١) سورة إبراهيم، الآية : (٣٣-٣٤) .

(٢) گۆڤاری هەیڤ، گۆڤارێکی زانستی وەرزیە، ژمارە (٤) .

# لە کوێوە هاتوین و بۆ کوێ دەچین؟

زۆر کەس ئەم پرسیارە دەکات و دەڵێت: من بۆچی لەم جیهانە هەم، ئەمە واتای چیە و بۆچی هاتوومەتە دونیا؟

لەچی و لە کوێ سەرچاوەم گرتووە.. ئەوانە پرسیاری سەرقاڵکردنی زانایانی (فەلسفە) بووە لەسەردەمە جیاجیاکاندا کە زۆربەی (فەیلەسوف) و زانایانی جگە لە زانایانی ئیسلامی دەستەوسان کردووە.

ئایا بەرەو کوێ دەڕۆم؟

دیارە ئەو پرسیارە گرنگە کە ئێمە بۆچی هاتووین و بۆ کوێ دەچین؟ هەتا ئێستا کەسانێکی زۆری سەرسام کردووە، کۆمەڵە ڕاو بۆچوونێکی جیاجیا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە باسیان لێوە کراوەو پێشکەوتنی زانستی ئەمڕۆش هۆکارێکی باشە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو ڕاو بۆچوونە جیاوازانە، بەڵام بێگومان ڕاست و ویستی خۆلانەدان لە ڕاستیەکان لە کاتی دەرکەوتنیاندا هۆکاری سەرەکین بۆ گەیشتن بە وەڵام و تێگەیشتن لە بوونەوەر.

بە ڕووکەش سەیرکردنی خۆمان و چوار دەورمان زیاتر بۆ چوونی نارێك و پێك لە خۆوە پەیدا بوون دەدات بە دەستەوە، بۆچوونی ئەزەلیەتی بوونەوەریش هەر لەو سەیرکردنە ڕووکەشەوە سەری هەڵداوە، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی دەرکەوتنی هەندێك لە ڕاستیەکان هەر زوو پێچەوانەی ئەومیان سەلماند بۆ نموونە: ئەگەر بوونەوەر ئەزەلی بوایە واتە: هەر هەبوویێت و سەرەتای نەبێت، ئەوا دەبوایە پلەی گەرمای هەموو بوونەوەر ئێستا یەکسان بووایەو خۆرو زەوی هەمان پلەی گەرمایان هەبوایە بە هۆی گواستنەوەی بەردەوامی وزەی گەرمی لە خۆرەوە بۆ چوار دەورەکەی، یان بە واتایەکی تر بڵێین: ماوەیەکی دیاری کراوە کە گەردوون پەیدابووەو ئەزەلی نیەو لە لایەکی تریشەوە بۆ چوونی

ئەزەلیەتی گەردوون پرسیارێکی فەلسەفی گرنك دەوروژێنێت، کە بۆچی ئەم ڕووداوانەی ئێستا ڕوو دەدەن، پێشتر ڕوویان نەداوە؟

چونکە هەر گۆڕانێك کە ڕوو دەدات، دەبوایە پێشتر ڕووی بدایە لە گەردوونێکی سەرەتاو بێ ئەزەلیدا، بە واتایەکی تر هەموو جوولەو گۆڕانێك کە چرکە بە چرکەو خولەك بە خولەك ڕوو دەدات، دەیسەلمێنێت کە سەرەتایەك هەیە بۆ گەردون و پێش ئەو سەرەتایە گەردوون بوونی نەبووە.

لە ڕاستیدا ئەقڵ بیر دروست دەکات هەرچی بیر بکاتەوە پیرۆزە، ئەقڵیش لە ئەزەلەوە هاتووەو ئەزەلیش سەرچاوەکەی لای پەروەردگارە.. کەوابوو (بیر) تاکە ڕاستی و بەردەوامیە.. بە بیرکردنەوە گەردوون دەبینین.

ئەگەر بە بەردەوام بیر بکەینەوە زۆر شتمان بۆ ڕوون دەبێتەوەو ئەقڵ و بیرمان بەردەوامە هەتا هەتایەو مردن لە ناوی نابات، گەردوونیش بە ئەقڵ و بیر دامەزراوەو سەرچاوەکەی لای پەروەردگارە... کەوابوو بەبێ ئەقڵ گەردوون نیە.

بوونمان مانای ئەوە ناگەیەنێ ئەو ماوە کەمەی لە نێوان لە دایك بوونمان و مردنمان دایە، بەڵکو ئێمە ئەقڵ و بیرمان هەیەو ئەمانە هەرگیز نافەوتێن و بەردەوامن لە بووندا.

هەروەها بیرمان بەردەوام دەمێنێ و هەست بەو هەموو ڕووداوانە دەکەین کە لە دەوروبەرمان ڕوو دەدات، بەڵام ئەو شتانەی لەم ماوە کەمەی ژیان لەسەر زەوی هەستی پێ دەکەین دەگۆڕێن کاتێ لەشی فیزیاویمان جیا دەبێتەوە لە لەشی ئەسیریمان ئەم گۆڕانکاریەش کار دەکاتە سەر بیرو هۆشمان.

زاناکان دەڵێن: لە جیهانی ئەسیریدا گۆڕانێکی تریش هەیە، لەو بەرزترەو لەوانەیە چەند گۆڕانێکی تریش هەبێت، بە لەرینەوەی جیاواز واتە: لە جیهانی بەرزەخەوە بۆ زیندووبوونەوەی یەکجاری بە گوێرەی ئایینی ئیسلام لەوێشەوە بۆ حەشرو لەوێوە بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ[1].

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ].

---

(١) علم الفلك، د.فياض النجم و د.حميد مجول، (لا ٤٠٨).

واتە: (جارێکی تر) فوو دەکرێ بە شەیپوردا، ئینجا ئەوان کت و پڕ لە گۆڕەکان دێنە دەرەوەو بە پەلە دەڕۆن بۆ لای پەروەردگاریان.

زانایانی ڕۆحی و زانستی دەڵێن: بونمان لە جیهانی ئەثیریدا دەگۆڕێ بۆ چەند جیهانێکی تر، بەڵام نازانین وەکو ئاینی ئیسلام و قورئان ڕوونی بکەینەوە.

وە کاتێك دێت جیهانە ئەسیریەکان بە دەوری زەویدا هەر حەوتیان نامێنن و دەچنە پلەیەکی نوێ کە لەرینەوەکانی زۆر زۆر خێراترەو کۆتایی بە زەوی و جیهانە ئەسیرەکان دەهێنێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: [فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴿١٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ﴿١٦﴾ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ﴿١٧﴾ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ][1].

واتە: کاتێك فوو کرا بە کەڕەنادا بە تاقە فووکردنێك، وە زەوی و شاخەکان هەڵگیران، بە جارێك دران بە یەکداو تەخت کران، ئەو ڕۆژە ڕووداوی گەورە ڕوو دەدات، وە ئاسمان لەت دەبێ و ئەو لەو ڕۆژەدا سست و بێ کەڵکە، وە فریشتەکان لە کەناری ئاسماندان، وە لەو ڕۆژەدا هەشت فریشتە تەختی پەروەردگاری تۆ هەڵدەگرێ لە ژوور هەموو فریشتەکانی ترەوە.

عەرش لەسەر هەشت ئاسمانی ئەسیری وەستاوە لەو ڕۆژەدا واتە: لە ڕۆژی دوایی ئاسمانە ئەسیریەکان دەبن بە هەشت ئاسمانی ئەسیری بە زەویەوە.

زاناکان دەڵێن: ئەم گەردوونە گەورەو فرەوانە هەمووی لە لەرینەوەکان پێك هاتووە کە لە ژمارە نایەن، نازانین ئەم لەرینەوانە لە کوێوە دێن و لە کوێ کۆتاییان دێت... وە گومانی تێدا نیە هەموو لەرینەوەکان لە دەسەڵات و توانای پەروەردگارەوەیە[2].

---

(١) سورة الحاقة، الآية: (١٣- ١٧).

(٢) علم الفلك، د.فياض النجم و د.حميد مجول، (٤٠٩-٤١٠).

## لە هەر چرکەیەک بێت
## گەردوون وێران دەبێت !

لە هەر چرکەیەك بێت گەردوون وێران دەبێت و ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە دێتە پێشەوە، ئەم ڕۆژگارەی سەرەتای سەدەی بیست و یەك، زانایان و توێژەران زۆر مەبەستیانە لە چۆنیەتی درووستبوونی گەردوون بکۆڵنەوە..

پاش دەیان ساڵ لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو تێبینی کردنی گەردوون، زانایان دەڵێن: سەرەتای گەردوون لە گازو ماددەی تاریك دروست بووە کە ئەو ماددە تاریکانە زۆر سیفەتیان تا ئەمڕۆ نەزانراوە لەبەر ئەوەی نابینرێن، ئەمەش دەکەنە تەوەری سەرەکی بەرنامەی کۆمپیوتەرەکانیان.

لە پاڵ ئەم بەرنامە کۆمپیوتەرانەدا زانایان لە هەوڵدان کە بە شێوەیەکی پراکتیکی کەشێکی ئەو تۆ بڕەخسێنن کە هەندێ زانیاری سەبارەت بە سەرەتاکانی درووستبوونی گەردوونی لێوە بکەوێتەوە، ئەوەبوو چەند ساڵێك پێش ئێستا یەکەم هەنگاوی ئەم تاقیکردنەوە گرنگە دەستی پێکرد لە تاوەری ناوکە ئەتۆمی ئەوروپی، لەم تاوەرانەدا تەنۆلکەکان بە هۆی بواری کارەبایی و موگناتیسیەوە تاو دەدرێن و پیا کێشان لە نێوانیاندا ڕوو دەدات و وزەی بەرزیش دەتوانرێ تا ڕادەیەك بەو هۆیەوە مسۆگەر بکرێ.

بۆیە دروست بوونی کەشێکی لەم جۆرە دەکرێ هەندێ زانیاری باشمان بداتێ دەربارەی بونەوەر بەڵام ئەم هەنگاوە هێشتا سەرەتایەو ساڵانێکی دوورو درێژی دەوێت بۆ ئاشکرابوونی زۆرێك لە نهێنیەکان، لەوانە ڕەفتاری تەنۆلکەکان لە سەرەتاکانی بونەوەردا و چۆنیەتی بەدیهێنانی ماددەکان و لەوێشەوە ئەستێرەو گەلە ئەستێرەو تەنە گەردوونیەکانی تر کە ئەمڕۆ هەن[1].

---

(١) علم الفلك، د.فياض النجم و د.حميد مجول، (٤٥٤).

زاناکان دەڵێن: تێکچوونی گەردوون کاتی دیاری کراوی نیە، لە ناکاو وێران بوون و تێکچوونی گەردوون لە هەر چرکەیەك دابێت کاتی هات ڕوو دەدات و هەموو بونەوەر وێران دەبێت.

هەروەها بارگەی کارەبایی لە گەردووندا یەکسانە بە (٠) سفر، چونکە ژمارەی ئەلکترۆنەکانی هەموو گەردوون یەکسانە بە هەمان ژمارەی هەموو پرۆتۆنەکانی بونەوەر.

ئەگەر ئەم ڕێژەو یەکسانیە بە شێوەیەکی زۆر زۆر کەم تێك بچێت تەنانەت بە ڕێژەی (١) تەنها یەك لە ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن واتە: ژمارەیەك بکرێت بە یەك بەش لە (١٠) دەتوان (٣٦)، تەنها یەك بەش چەند کەمە ئەوەندە تێکچون دروست ببێت یەکسەر هەموو گەردوون تێکدەچێت و ڕۆژی دوایی زیندووبوونەوەی یەکجاری و لێ پرسینەوە دێتە پێشەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموی:

[ٱلْقَارِعَةُ ۝١ مَا ٱلْقَارِعَةُ ۝٢ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ۝٣ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ۝٤ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ۝٥ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٦ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ۝٧ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٨ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ۝٩ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ۝١٠ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ][١].

واتە: ڕۆژی داچڵەکێنەر، ئاخۆ چۆن بێ ئەو ڕۆژە، تۆ چووزانیت ئەم ڕۆژە چیە؟ ڕۆژێکە خەڵکی وەك پەپولەی پەراگەندە بڵاودەبنەوە، وە شاخەکان وەك خوری شیکراویان لێ دێت، ئینجا ئەوەی کێشی چاکەکانی قورس و گران بێ، ئەوە ئەو کەسە لە گوزەرانێکی پەسەند دا دەبێ، وە ئەوەی کێشی چاکەکانی سوك بێ، ئەوە جێگای (هاویە)یە، تۆ چووزانیت هاویە چیە؟ ئاگرێکی هەڵگیرساوە[٢].

---

(١) سورة القارعة، الآية: (١ ـ ١١).

(٢) علم الفلك، د.فیاض النجم و د.حمید مجول، (لا ٤١٠).

خاڵی ئیعجازی لەم ئایەتەدا:

زاناکان دەڵێن: هێزی ڕاکێشان گەلە ئەستێرەکان ڕادەکێشی و کۆیاندەکاتەوە، بەڵام فرەوانبوونی دووریان دەخاتەوە بەم جۆرە هەروەك و (+ و =) زۆرانبازیە لە نێوان فرەوان بوون و هێزی ڕاکێشان، دەبێ لە ئەنجامدا کامیان سەرکەون چونکە گەردوون دروست کراوە تاکو ئێستا ئەم زۆرانبازیە بەردەوامەو هێزیان بەرامبەرە وەکو یەك بەهێزن.

بەڵام لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: ئەگەر فرەوانبوونی گەردوون سەرکەوت بەسەر هێزی ڕاکێشاندا چی ڕوو دەدات؟

وەڵام: ئەگەر فرەوانبوون زۆر بوو سەردەکەوێ بەسەر هێزی ڕاکێشانداو تەنە گەردوونیەکان دوور دەکەونەوە لە یەکترو گەردوون زۆر زۆر فرەوان دەبێت، ئەمەش پێی دەڵێن: گەردوونی کراوە.

بۆیە خێرایی ڕزگاربوونی زەوی لە هێزی ڕاکێشان واتە: فرەوانبوونی گەردوونی زەوی (١١/٢٣) کم پانیە بەڵام ئەگەر لە زۆرانبازیەکدا فرەوانبوونی گەردوونی کەمی کردو هێزی ڕاکێشان زیاتر بوو، فرەوانبوون کەم دەبێتەوەو گەلە ئەستێرەکان وردە وردە دەگەڕێنەوە بۆ لای یەکتر بۆ ئەوەی لە یەك شوێندا کۆببنەوە هەروەکو سەرەتای دروستبوونی گەردوون، ئەمەش پێی دەڵێن: گەردوونی داخراو[1].

گەرمایی گەردوون کاری لەسەر لەناوچوونی بونەوەر هەیە؟

ئەگەر سەیری ئەم بونەوەرە بکەین دەبینین فرەوانبوونی گەردوون هەتا هەتایە بەردەوام نابێت، بەڵکو ڕۆژێك دێت کە گەردوون لە فرەوانبوون دەوەستێت و گەشتی پێچەوانەی دەست پێ بکات و بارستاییەکەی بچووك ببێتەوە، تا دەگاتە ئەو خاڵەی کە گەشتەکەی لەوێوە دەست پێکرد، ئەمەش دەرەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەیە کە ئەمڕۆ سەبارەت بە ئایندەی گەردوون ئەنجام دراون و

---

(١) علم الفلك، د.فياض النجم و د.حميد مجول، (لا ٤٠٦).

دەرکەوتووە ئێستا گەردوون لەو خولەدایە کە یەکەم جار لە بارستاییەکی تا بڵێی قورسەوە دەستی پێکردووە، کاتێ تەقینەوەی مەزن ڕووی داوەو، سەرجەمی ئەو شتانەی پێکهێناوە کە ئەمڕۆ لە گەردووندا دەیانبینین لە هەسارەو ئەستێرەو گەلەئەستێرەو تیشك و گازەکان و شتانی تری ناو گەردوون، ئینجا هەر ئەم بەشانەی گەردوون جارێکی تر خۆیان بەسەر یەکدا دەپێچنەوەو لەیەکتر نزیك دەبنەوە، هەتا سەر لە نوێ یەك دانە بارستایی پێك دەهێننەوە!

لە کۆتایی سەدەی بیستەم زانایان تێبینی ماددەیەکی تاریکیان کرد، کە بەناو هەموو گەردوون و گەلەئەستێرەکان بە بڕێکی یەکجار گەورەو زۆر بڵاودەبێتەوە، بۆیە زانایان قەبارەی ئەم ماددە تاریکەیان زۆر زیاتر لە قەبارەی گەردوونی بینراو خەمڵاندووە، کەواتە ئەو ماددەیەی قەبارەکەی نابینرێ زۆر گەورەترە لەو ماددەیەی کە دەبینین، ئەم ماددە تاریکە هێزێکی کێشی چەندین ئەوەندەی هێزی کێشی گەردوونی بینراوی هەیە، جا لەسایەی ئەم ماددەیەدا بەشەکانی گەردوون ـ کە ئێستا لە فرەوانبوون دان ـ ناتوانن پەرتەوازە ببن و دووریکەونەوە، هەروەك فرەوانبوونی گەردونیش هەتا ئەبەد بەردەوام نابێت، بەڵکو لە کاتێکی دیاریکراودا دەوەستێت و گەلەئەستێرەکان بەخێرایی و بە ئاڕاستەی پێچەوانەی جووڵەی ئێستایان بەرەو دواوە دەگەڕێنەوە هەتا دەگەنە ئەو خاڵەی لەوێوە دەستیان بە جوڵەی فرەوانبوونیان کردووە[1].

زانایانی گەردووnناسی بە یەك دەنگ دەڵێن: ڕاستە هێڵ لە گەردووندا نیەو هەموو شتێك لارو چەماوەیە، سەرجەم بەشەکانی گەردوون لە هەسارەو ئەستێرەو

---

(١) بە واتای ئەم گەردوونە دوورە بەرفرەوانە، ئەم بینایە پتەوە بیناکراوە لە تریلیۆنەها تریلیۆنەها لە ئەستێرەکان کۆتایی دێت بە کرداری پێچەوانە بۆ خاڵی یەکەم کە هەموو وێنەیەکی ماددەو شوێن و کاتی تێ دەبینرێت و بەمەش بە تەواوی لەو ئەستێرە سەرەتاییە دەچێت کە گەردوون دەستی پێکرد، دەسا مەزنی و پاکی هەر بۆ خوای پەروەردگار! چەندە بە وردی لە کۆتایی گەردوون دەدوێ! خوێنەری بەڕێز: سەیری وردی زاراوە زانستیەکە بکە لەلایەن قورئانەوە، چونکە لە ڕاستیدا کرداری پێچانەوەی بەشەکانی گەردوون هەمان دەرەنجامە کە دواهەمین توێژینەوە زانستیەکانی ئێستای لەمەڕ گەردوونیش بە دەستەوەی دەدەن!

بەشی یەکەم

گەلەئەستێرەو نەیزەك و کلکدارەکان و تیشکەکان و کونە ڕەشەکان لە چەند سوڕگەیەکی لارو چەماوەدا دەسووڕێنەوە، کەواتە کارێکی تا بڵێی مەنتیقیە کە کۆتایی گەردونیش لارو چەماوە بێت بە وێنەی پێچانەوەی کاغەزێك.

جێی خۆیەتی مرۆڤ پرسیار لە بارەی وردی ئەم وەسفەی ئایندەی گەردوون بکات کە لە قورئاندا هاتووە.. ئایا ئەگەر ئەم وەسفە لە لایان خوای زانای پەنهاکانەوە نەکرابێت کە هەر خۆی چی بەسەر گەردووندا دەهێنێت بەهەمان شێوە وەسفیشی دەکات، هەرگیز لە توانای هیچ مرۆڤێکدا هەیە وەسفێکی ئاوا وردو زانستی پاشە ڕۆژی گەردوون بکات؟

کەواتە ئایەتی: [يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾][1]

ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە دەتوانرێ سەرەتای گەردوون بە کاغەزێك بشوبهێنرێ لە تانوپۆی گەردووندا کە یەکەم جار بەسەر یەکدا پێچرابووەوە، پاشان خوای گەورە کردیەوەو بەشەکانی لە یەکتر دوور خستەوەو تا ئێستاش هەر لە کردنەوەو بڵاوبوونەوەدایە، هەتا ئەو ڕۆژەی دێتە پێش کە سەر لە نوێ دەپێچێتەوە.. لێرەدا زانایانی گەردوون و فیزیایی بانگەشەی کرداری چونەوەیەکە بەهێزەکە دەکەن جیاوازن لە بۆچووندا، هەیانە وای بۆ دەچێت کۆتایی هەبوونەو هیچی لە دوا نایەت، هەیانە وای بۆ دەچێت کردارێکی بە لەرەلەرەی بەردەوامە، هەموو ئەمانە بە شێوەی گومان هێنراوەتەوە لە قوڵایی غەیبی ڕەهادا و نایروژێنێت، تەنها بە وتەی ڕاستەقینەی خوای پەروەردگار نەبێت کە دەفەرمووی:

[يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴿٤٨﴾][2].

---

(١) سورة الأنبياء، الآية: (١٠٤).

(٢) سورة إبراهيم، الآية: (٤٨).

واتە: لە ڕۆژێکدا ئەم زەویە دەگۆڕێت بۆ زەویەکی تر، هەروەها ئاسمانەکانیش دەگۆڕێن بە شێوەو شێوازێکی تر، هەموو ئەو خەڵکە دەردەکەون و ئامادەن لە بەردەم دادگای خوای تاك و تەنهاو بە دەسەڵات و خەشمگیر لە کافران.

با بزانین کرداری پەرەسەندنی گەردوون ئایندە سەری بە چی ئەگات؟

پرسیارێکی سەرسوڕهێنەرە، ڕاستیەکانی ئێستا ئەوە دەردەخەن کە گەردوون دەکشێت بەڵام ئایا دەوام دەکات لەم کشانەدا؟

گەر بەهۆی تیۆری تەقینەوە گەورەکە لێکدانەوە بۆ دروست بوونی گەردوون بکەین، ئەو کاتە لە دایك بوونی گەردوون دەتوانین بزانین بەڵام ئایا دەتوانین کۆتاییەکەی بزانین؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لەم کاتەدا زۆر دژوارە، چونکە ئەگەر بڵێین: گەردوون کراوەیەو بێ سنوورە، مسۆگەر تا سەر دەکشێت، گەر داخراو بێ وەکو گۆیەك ئەو کاتە چەند ئەگەرێك دێتە پێشەوە، کە ئەمانەن:

تا سەر لە کشان ناوەستێ بەڵام ڕاددەی کشانەکە پەیتا پەیتا بە پێی ڕۆژگار نامێنێ، بە هۆی هێزی کێشکردنەوە کە بەربەستی بۆ پەیدا دەکات، بڕی کێشکردن (الجاذبية) لەسەر چڕی گەردوون دەوەستێت، ئەگەر چڕی گەردوون زۆر بەرز بێ، هێزی کێشکردنەکە دەتوانێ ئەم هێزەی کشانە بوەستێنێ، بەم شێوەیە گەردوون دێتەوە ناویەك نەك بکشێت، وەك چۆن بەردێ فڕێ دەدەیتە ئاسمان دوای ئەوەی دەگاتە بەرزترین بڵندایی بە هۆی هێزی کێشکردنی زەوی دەگەڕێتەوە قۆناغی یەکەمی[1].

زۆر لە زانایان بڕوایان وایە گەردوون کراوەیەو سنووری نیە، واتە: گەردوون لە کشان ناوەستێ تا دەگاتە دوا قۆناغ کە مردنی خۆیەتی، واتە: تیشکەکان وزە لە دەست دەدەن، ئەمەش لە کاتی کرداری بەرەو سوور چوون (الزحزحة نحو الأحمر) دا، گشت ماددەی گەردوون لەناو ئەستێرەکانی دوا قۆناغدا کۆدەبنەوە

---

(١) علم الفلك، د.فياض النجم و د.حميد مجول، (لا ٣٤٤).

بەرگی یەکەم

وەکو ئەستێرە ڕەشەکان (النجوم السوداء)، ئەو کاتە گەردوون گەرمی ناگەیەنێ و تا سەر خامۆش دەبێت[1].

د. زەغلول نەجاڕ لە پەرتوکی (آيات الإعجاز في القرآن الكريم) دەڵێت: گەردوون هەر لە یەکەم زەبرە گەورەکەیەوە دەکشێت بەڵام لێرەدا هیچ بەڵگەیەك نیە کە تا سەر بکشێت بەڵکو بڕوایان وایە کە وردە وردە کشانی هێواش دەبێتەوەو دوای دەوەستێت و بەرەو دوا دەکشێتەوە.

ئەم زەویەی ئێستا ئێمە لەسەری دەژین چەند ملیۆن ساڵە دروست کراوە، تاکو ئێستاش لە فرەوانبوون دایە، ئەمەش سەرەڕای هەبوونی شوێنگە گەلی ئەوتۆ، کە تەن گەلێکی توند بە یەکەوە بەستراو بە هۆی قورسایی کێشکردنەوە دەگرنە خۆیانەوە وەکو نمونەی ئاپۆڕەی ژمارەیەك کەشکەشانەوە.

زانایانی گەردونناسی سەریان سورماوە نازانن کە ئایا گەردوون لە داهاتوودا دادەخرێت؟ واتە: لە کشان دەوەستێت و دەست بە وێکهاتنەوە دەکات، یان دەکرێتەوە واتە: بۆ هەتا هەتایە لە کشاندایەو بەردەوام گەورە دەبێت.

لە لایەکی ترەوە دیاردەیەکی وەك فرەوانبوونی گەردوون (توسع الكون) کە زانستی ئەمڕۆ سەلماندوویەتی و شتێکە ئەگەر بە زانستی پێشکەوتووی ئەمڕۆ نەبوایە هەرگیز مرۆڤ هەستی پێ نەدەکرد، بە پێی ئەم دیاردەیەش گەلە ئەستێرەکان لە بۆشاییدا بەردەوام لە یەکتر دوور دەکەونەوە، ئەمەش بە هۆی هەمان هێزی تەقینەوەی یەکەم جاری گەردوونەوە کەوا لە پارچەکانی تەقینەوەکە (گەلە ئەستێرەکان) دەکات بەردەوام دوور بکەونەوە تا کاتێکی دیاریکراو پاشان دوو سیناریۆ ئەگەری ڕوودانیان دەبێت وەکو کۆتاییەك بۆ ئەو هێزی پاڵنەری تەقینەوەیە:

یەکەمیان: گەلە ئەستێرەکان بە ڕادەیەك لە یەکتر دوور دەکەونەوە کە هێزی ڕاکێشانی نێوانیان نامێنێت و هەتا هەتایە لە بۆشاییدا لەسەر دوورکەوتنەوەیان لە یەکتر بەردەوام دەبن.

---

(١) علم الفلك، د.فياض النجم و د.حميد مجول، (٤٠٩-٤١٠).

بەرگی یەکەم

دووەمیان: هێزی پاڵنەری تەقینەوەکە لە ئاستێکدا کۆتایی پێ دێت و هێزی ڕاکێشانی نێوان گەلە ئەستێرەکان زاڵ دەبێت بەسەری داو کەمتر لە چرکەیەکدا هەموو گەردوون دەیداتەوە بە یەکداو بە خێراییەکی لە ڕادەبەدەر بەرەو چەقەکەی ڕادەکێشرێتەوەو کۆتایی بە شێوەی ئێستای گەردوون دێت.

دیارە باسکردنی هەموو ئەم دیاردانە بەم شێوە وردە لە قورئان و یەکگرتنەوەی بە تەواوی لەگەڵ زانستی ئەمڕۆدا، هەموو بەڵگەی ڕاست و دروستی قورئانن و بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە قورئان لە لایەن بەدیهێنەری بوونەوەر هاتووە.

خوای پەروەردگار لە بارەی فرەوان بوونی گەردوونەوە دەفەرموێ: [وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾][1].

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێ: (يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا المَلِكُ أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ)[2].

واتە: لە ڕۆژی دوایی خوا زەوی دەگرێ، ئاسمان بەلای ڕاستیەوە دەپێچێتەوە لە پاشان دەفەرموێ: من پادشام کوا پادشاکانی زەوی.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٧﴾][3].

ئەوانە وەکو پێویست خوایان نەناسی و ڕێزیان لێنەگرت، ئەگینا چۆن هاوەڵیان بۆ دادەنا؟ جا لە ڕۆژی دوایی زەوی هەموو لەناو دەستی ئەو دایەو ئاسمانەکانیش پێچراونەتەوەو بە دەستی ڕاستیەوەن، جا خودا پاکو بڵندە لەو شتانەی ئەوان دەیکەنە هاوبەشی.

---

(١) سورة الذاريات، الآية: (٤٧).

(٢) صحيح البخاري (٩/ ١١٦) باب: يقبض الله الأرض يوم القيامة، برقم: (٦٥١٩).

(٣) سورة الزمر، الآية: (٦٧).

وشەی (الیمین) لای قەتادە تەفسیر نەکراوە، سوفیانی کوڕی عویەینە (ﷺ) دەفەرموێ: لە هەر ئایەتێکدا خوا وەسفی خۆی کردبێ خوێندنەوەی تەفسیرەکەیەتی و بێدەنگی لێدەکرێت[١].

بۆیە فرەوانبوونی گەردوون و هێزی ڕاکێشان هەردووکیان پەیوەندیان بە چڕی ئێستای گەردوونەوە هەیە، ئەگەر چڕی گەردوون بگاتە چڕی (حەرج) وەکو زاناکان دەڵێن: ئەو کاتە هێزی ڕاکێشان توانای هەیە فرەوانبوونی گەردوون بوەستێنێ لە دوارۆژ، بەڵام ئەگەر ئەم چڕیە لە چڕی (حەرج) کەم بوویەوە، واتای ئەوەیە فرەوانبوونی گەردوون زۆرتر دەبێت و بەردەوام دەبێت بەبێ وەستان[٢].

چڕی (حەرج) زانایان بەم جۆرە حیسابیان کردووە (٤/٧) جاران (١٠-٣٠) توان - ٣٠ غرام سم٣ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ سێ گەردی هایدرۆجین هەیە لە هەر م٣ لە بۆشایی ئاسمان بەڵام ئەو چڕیەی گەردوون ئێستا هەیە ٣٥٪ تاکو ٤٥٪ ی (چڕی حەرجە) هەر چەندە ئەم چڕیەی ئێستای گەردوون زاناکان دایاننناوە ڕاستی تەواو نیە، چونکە هێشتا چڕی ئەشکەوتە ڕەشەکان بە هیچ جۆرێك نازانن و نازانن لە ناویاندا چی هەیە، لەبەر ئەوەی تیشك قوت دەدەن واتە: کات و شوێن و ماددە هەڵدەمژن، وە هیچ زانایەك و زانستێك لەمەو پێش و لە مەودوایش نازانێت نهێنی ئەم ئەشکەوتە ڕەشانە تێبگات ئەمە بێجگە لە ئەشکەوتە سپیەکانی لێوارەکانی گەردوون کە لە ئەشکەوتە ڕەشەکان زۆر زۆرترن، لەوانەیە بە گوێرەی زانست (١٠٠٠٠٠٠) هەزار ملیۆن ساڵی ڕووناکی تاکو (١٥٠٠٠٠٠) ملیۆن ساڵی ڕووناکی لە ئێمەوە دووربن، لەبەر ئەوە خێراترین شت تاکو ئێستا ڕووناکیە لە چرکەیەکدا (١٨٦٠٠٠) میل ئەڕوات.. کەوابوو ئەگەر کەشتیەکی ئاسمانیمان هەبێت بەو خێراییە بڕوات دەبێ (١٠٠٠٠٠٠) هەزار ملیۆن ساڵ بەرێوە بڕوات، ئینجا نزیك ئەشکەوتە سپیەکان دەبێتەوە.

---

(١) الأسماء والصفات، للإمام البیهقي (٢ /٦٢).

(٢) علم الفلك (لا ٥٤٣).

بەرگی یەکەم

بە گوێرەی تیۆری ڕێژەیی ئەنیشتاین هەرچی شتێك خێرایی بگاتە خێرایی ڕووناکی دەبێتەوە بە سفر، واتە: مەحاڵە زاناکان و زانستی نوێ تێبگەن لەم ئەشکەوتە سپییانە یان ڕەشەکان[1].

زاناکان دەڵێن: دوور نییە لە نێوان گەلە ئەستێرەکاندا گازو تۆزێکی زۆر نەبێت، چونکە ناتوانین بە هیچ جۆرو شێوەیەك بیانبینین، لەبەر ئەوە چڕی گەردوون دوور نیە لە پاشە ڕۆژ نەگاتە چڕی (حەرج) دوای ئەوەی گازو تۆزی نێوان گەلە ئەستێرەکان ئاشکرابوو - لەگەڵ ئەشکەوتە ڕەشەکان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هێزی ڕاکێشان زاڵ دەبێت بەسەر هێزی فرەوانبوونی گەردووندا و ئەم جووڵانەوەی گەردوونە وردە وردە هێواش دەبێتەوە تاکو دەوەستێ و گەلە ئەستێرەکان دەست دەکەن بە گەڕانەوەی پێچەوانە بۆ شوێنێکی تایبەتی و کۆدەبنەوە لە یەك خاڵدا، بەم جۆرە چاوەڕوانی مردنی ئەستێرەکان نابین لە گەردوونی کراوەدا بەڵکو ئەم جۆرە گەردوونە داخراوەو هەموو ئەستێرەکان بە یەکەوە دەمرن و قیامەتی هاوبەش دەبێت و هەموو شتێك کۆتایی دێت.. ئەو سات پلەی گەرما بەرز دەبێتەوە: ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن جار گەرمیان زیاد دەکات و ئەستێرەکان هاواری مردنیان لێ بەرز دەبێتەوەو ئەتوێنەوە و شۆربایەکی گەردوونی دروست دەکەن، کە پێکهاتووە لە: تیشکەکان و ئەلکترۆنەکان و ناوکی گەردەکان - لە ماوەیەکی زۆر زۆر کەم هەموو گەردوون دەتوێتەوە دەبێت بەم شۆربا گەردوونیەو ئەکوڵێ بەڵام چ کوڵانێك مەگەر پەروەردگار خۆی بزانێت.

بەم جۆرە گەردوون هەمووی دەکوڵێ تا قەبارەی کەم دەبێتەوەو دەبێتە سفرو لەناو دەچێت و نامێنێ، بۆیە زاناکان پێی دەڵێن: (القيامة المشتركة) وە پەروەردگاریش لە قورئانی پیرۆزدا بە (الطامة الكبرى) سوێندی پێ خواردووە.

بۆیە خوای پەروەردگار لە قورئاندا باسی هەسارەکان و مانگ و خۆر دەکات کە چۆن لە سەرەتادا یەك پارچە بووە و پاشان جیابووەتەوە ئاواش جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی، هەروەکو دەفەرموێ:

---

(١) علم الفلك، (لا ٢٣٢).

[يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ][1].

واتە: بێباوەڕەکان بێ باکانە دەپرسن کەی ڕۆژی دوایی دێت و بەرپا دەبێت؟ کاتێك دێت چاو ئەبڵەق دەبێت، مانگیش دەگیرێت و تاریك دەبێت، خۆرو مانگ کۆدەکرێنەوەو دەدرێن بە یەکدا، ئەو ڕۆژە مەردووم دەڵێت: بۆ کوێ ڕابکەم لە کوێوە خۆم ڕزگار بکەم.

ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەکات کە چۆن هەسارەکان و مانگ و خۆر سەرەتا یەك پارچە بوون جیابوونەوە جارەکی تر بۆ دۆخی ڕابردوو دەگەڕێنەوە.

زانای گەورەی ئەمریکی (کریسی موریسۆن) دەڵێت: چۆن ڕابردوو مانگ لە زەوی جیابۆتەوە، جارەکی تریش مانگ بۆ باوەشی زەوی دەگەڕێتەوە (واتە: ڕۆژی دوایی دێت)[2].

گەردونناسان دەڵێن: خۆر بۆ زەبەلاحی سوور دەگۆڕێ، کە تا سنوری خولگەی زوهرە دەکشێ، ئەو کاتە ئۆقیانوسەکان دەکوڵێن لەسەر زەویدا، ئەمەش قسەی جۆرج گامۆڤە کە لەسەر خۆر بڵاوی کردۆتەوە، داهاتوو زیاتر بەمە ئاشنا دەکەین، دیارە ئەو کاتە خۆر لە زەوی و مانگ نزیك دەبێتەوەو وەکو کۆبوونەوەیەك پێکەوە دەردەکەون و سنورەکان نامێنێت.. ئەم دیاردەیەش خوای پەروەردگار (١٤٤٠) ساڵ پێش ئێستا فەرموویەتی: [فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾].

واتە: کاتێك دێت ئاسمان شەق دەبێت وەکو گوڵێکی سوور دێتە بەرچاو یاخود وەکو ڕوونی قرچاوی لێدێت.

پێشەوا (زەمەخشەری) لە تەفسیری (الکشاف) دەڵێت: (وردة حمراء / کالدهان کدهن الزیت) واتە: گوڵی سوور وەکو ڕۆنی زەیت. (وقیل: الدهان الأدیم الأحمر)، (الدهان) واتە: پێستی سوور، یان کەوڵی سوور.

---

(١) سورة القيامة، الآية: (٦-١٠).

(٢) علم الفلك،(لا ٤١٠).

خاڵی ئیعجازی لەم ئایەتە ئەوەیە :

کە ئاسمان لە دوا ڕۆژ کاتێ کەرت دەبێ بە گوڵەکی سوور دەچوێنێ ئینجا بە زەیت، بەڵام زەیتی ئاسمان جیایە لە زەیتی زەوی، ئەو بریتیە لە گازی تواوە لە پلەی پلازما دان لە پلەی گەرمی بەرزدا.

دکتۆر زەغلول نەجارِ دەڵێت: ئێستا توانیویانە وێنەی هەسارەیەك بگرن کە تەقینەوە تیایدا ڕووی داوەو ڕەنگەکەی هەمان ئەو ڕەنگەیە کە قورئان باسی دەکات.. ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ڕاستێتی قورئان، چونکە پیاوێکی نەخوێندەوار لەو ڕۆژگارەدا چۆن دەتوانێ باس لەشتی وابکات، هەروەها قورئانی پیرۆز باس لە ئەستێرە دەکات کە دەکوژێتەوەو گڕو گەرمی نامێنێ و بۆ (هەسارەکان) یش دەفەرموێ: (هەپرون هەپرون دەبێ) [وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ۝٢][1].

ئەم ئایەتە بناغەی سەردەمی هەسارەیی بە دیار دەخات کە هەور گەلێکی گازی مەزنە کە ئەستێرەیەکی مردوو لە چەند تەقینەوەیەکی یەك لە دوای یەك دەری کردووە، دەرکردنی ماوە درێژی گازە داگیرساوە تازە پێگەیشتووەکە لە تەقینەوەیەکی نوێدا لە دوو هەوری گازاوی داوە، لە تەقینەوەیەکی پێشتردا دەرهاوێژراون، وە پاش ماوەکەش ناوکە هایدرۆجینیەکانی بەکاردەبرێ و لە دواییدا مەزن دەبێ هەتا دەگاتە زەوی، ئەو دەرهاویشتە گازیانەی کە دەری دەکات لە فرەوان بووندا بەردەوام دەبێت هەتا خۆرەکە دەگۆڕێت بۆ سەدیمێکی هەسارەیی، لەم کاتەدا ئادەمیزاد ئاگادار دەکرێتەوە لەوەی کە کردوویەتی لەسەر ڕووی زەوی بەڵام ئەگەر گەردوون نەگاتە چڕی (حرج) ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە فرەوانبوون و کشانی گەردوون بەردەوام دەبێت و هەرگیز کۆتایی نایەت» نەخێر، ئەگەر گەردوون کراوە بێت ئەستێرەکان بەرە بەرە یەك لە دوای یەك دەمرن و دەکوژێنەوە لە ئەنجامدا هەموو گەردوون دەبێت بە گۆڕستانێکی هەرە گەورەی ئەستێرەکان.

ئەمە نوێترین زانستی ئەمڕۆ وا دەڵێت کە بە زۆر پێشکەوتوو لە قەڵەم دەدرێت، کەوابوو لە هەردوو جۆرە گەردوونەکەدا.. (کراوە) و (داخراو) گەردوون تەمەنی

---

(١) سورة التكوير ، الآية : (٢).

دیاری كراوی هەیە، دەست پێك و كۆتایی هەیە.. وە كاتی دروست كردنی و كاتی مردنی تەمەنی دەكەوێتە نێوان ئەم دووكاتەوە گەردوون دەمرێت و نامێنێ.

تەنانەت هەندێ لە گەردووںناسان بڕوایان وایە كە تەقینەوەی ناوكی هەندێ مەجەرە بەهۆی ڕەوانەكردنی تیشكی ڕادیۆیی زۆرە، ئەم تەقینەوەیە ئەم ڕێژمە هایدرۆجینە بە خێراییەكی زۆرو بۆ دووری (١٢٠٠٠) ساڵی تیشكی دەردەكەوێ، ماوەی ئەو تەقینەوەیەش (١,٥-٢) ملیۆن ساڵ دەخایەنێت.

قورئانیش وەكو موعجیزەیەك ئاماژەی بەو دیاردە گەورانە كردووە لە بوونەوەردا، جا هەر یەكێ لەم ئایەتانەی پێشوو باس لە دیاردەی كەرتبوونی ئاسمان دەكات كە بەردەوام ڕوودەدات و بەسەر ئەستێرەو مەجەرەكاندا دێت و گۆڕان دەیانگرێتەوە[١].

ئەم هەموو ڕووداوانە مەترسی بۆ سەر بوونەوەر پەیدا دەكات، پاشان پێشبینی دەكات، كە مرۆڤ لە ئایندەدا گوێ بۆ ئەم پەیامە مەترسیدارە شل ناكات ئەو هاوسەنگیە لە بەین دەبات.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٌ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٩﴾][٢].

واتە: بە ڕاستی هاتنی ڕۆژی دوایی هەر دێ و هیچ گومانی تێدا نیە بەڵام زۆرترینی خەڵك بڕوا بە هاتنەكەی ناكەن.

دیسان ئەمە ئەوە ناگەیەنێ گەردوون بەم دوو شێوەیە ئەمرێ و كۆتایی دێت.. بەڵكو هەزاران ڕێگە و تێكچوون و ئەگەری تر هەیە كە زاناكان و زانست باسی دەكەن.

بەڵێ.. لێرەدا ناتوانین هەموویان باس بكەین، چونكە چەند پەرتوكێكی وەكو ئەم پەرتوكەی ئەوێ بۆ باسكردنیان.

---

(١) علم الفلك (لا ٣٢١).

(٢) سورة غافر، الآية: (٥٩).

بەرگی یەكەم

خوای گەورە فەرموویەتی: [ وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ][1].

واتە: هاتنی ڕۆژی دوایی هێندە ئاسانەو خێرایە هەر بە قەد چاو تروکانێکە، بەڵکو لە خێراییدا هاتنی ڕۆژی دوایی لە چاو تروکانێکیش نزیکترە، چونکە تەنها هەر ئەوەندەیە کە خوا پێی بفەرمویّ ببە، ئینجا دەست بەجیّ دەبێت جا کاتیّ ڕۆژی دوایی هات حەق و ناحەق بە دەردەکەوێت[2].

زاناکانی گەردوونناسی دەڵێن: هەرگیز ناتوانین پێش بینی ئەو وێرانکاری و کاول بوونەی گەردوون بکەین لە ماوەی چەند چرکەیەکداو کۆتایی بە هەموو شتێك دەهێنیّ لە ماددەو ئادەمیزادو ئاژەڵاً و ڕووەکو ئاو و هەواو هەموو بوون و بوونەوەرێك لە گەردووندا.

وە دەڵێن: کۆتایی زەوی لە چرکەیەك یان کەمتر دەبێت و تەقینەوەو وێرانبوونی گەردوون دەست پیّ دەکات لەناو گەردەکان و زەوی و ئاسمانەکان و هەرچی لەناو تەنە گەردوونیەکاندایە.. جا شەو بێت یان ڕۆژ بێت کۆتایی بەم گەردوونە دێت بە فەرمانی پەروەردگار.

ئەم زانستەش لەو کاتەدا بە وەحی هاتووە بۆ پێغەمبەرمان محەممەد (ﷺ) کە خوێندەوار نەبووە.

تەنانەت لێژنەی وزەی ئەتۆمی ڕایگەیاند کە دکتۆر (ئیرنست لورنس) گەیشتۆتە دۆزینەوەیەکی ترسناك ئەویش ئەوەیە کە (کەهارب) پەیدابووە لە نەژادی پرۆتۆن بەڵام لە جۆری سالبی (-) چینەکانی سەرەوەی بەرگەبا، ئەمەش دژی سروشتەو مەترسیەکی وای هەیە کە ئەقڵی ئادەمیزاد پێشبینی ناکات[3].

---

(١) سورة النحل، الآية: (٧٧).

(٢) علم الفلك (لا ٥٥٤).

(٣) علم الفلك (لا ٥٦٤).

## زانایانی کەشناسی لە کۆنگرەکەی (برۆکسل) لە بەلجیکا لە ساڵی ١٩٩٢ دووپاتیان کردەوە کە مرۆڤی ئەم بونەوەرە کۆتا دروستکراوی ئەم زەویەن

لە کۆنگرەی زانستی لە برۆکسلی بەلجیکا لە ساڵی ١٩٩٠ع توێژینەوەیەك کرا لەسەر بوونەوەر کە پێك هاتبوون لە زانایانی گەردووناسی لە زۆربەی وڵاتانی جیهان.. هەر یەکەیان توێژینەوەیەکی زانستیان ئامادە کردبوو لەسەر پێك هاتنی بوونەوەرو ئەستێرەو هەسارەو مانگ و تەمەنیان... بۆیە ئەم زانایانە گەیشتنە ئەم دەرەنجامە زانستیە و گوتیان:

لەگەڵ یەکەم کاتژمێر لە دروستبوونی ئەم بوونەوەرە :
خوای گەورە بە ملیارەها هەزار مەجەرات و ئەستێرەی دروست کردووە..

لە کاتژمێری دووەم :
خوای گەورە ئەم مەجەڕانەی لە یەکتری جیا کردەوە..

لە کاتژمێری سێیەم :
خوای گەورە هەسارەکان و مانگ و نەیزەکەکانی دروست کرد..

لە کاتژمێری چوارەم :
خوای گەورە هەر یەك لە ئەستێرەو مەجەڕاتی لە جێگاکانی خۆی چەسپاند و داینا.

لە کاتژمێری پێنجەم :
خوای گەورە زۆر لە هەسارەکان و مانگەکانی دروست کرد، لە پاش ئەوەی جیاوازی کردنەوە لەگەڵ ئەستێرەکان[1].

---

(١) مجلة البحث العلمي ـ أكاديمية البحث العلمي القاهرة.. أشراط الساعة ـ العلامات الصغرى

لە کاتژمێری شەشەم :

خوای گەورە هەر یەك لە تەبەقەو بورج و ئاسمانەکانی گێڕا لە جێگای خۆیدا..هتد..

هەتا لە کۆتاییدا گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە گوتیان:

خوای گەورە ئەم زەویەی دروست کردووە لە کۆتا کاتژمێری ئەو ڕۆژە لە تەمەنی بونەوەر.. واتە: لە سەرەتای (٢٤) کاتژمێری یەکەم..

زانایان دەڵێن: بوونی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە حەوت خولەکە لە دە خولەك، ئەمەش تەمەنی مرۆڤە لەسەر زەوی، وە تەنها ٣ خولەکی کۆتایی ماوە لەم دە خولەکە[1].



والوسطى، ماهر أحمد الصوفي، (لا ٧٧) .

(١) مجلة البحث العلمي ـ أكاديمية البحث العلمي القاهرة.. أشراط الساعة ـ العلامات الصغرى والوسطى، ماهر أحمد الصوفي، (لا ٧٨) .

# ڕوودانی بچوكترین هەڵە لە یاساكانی گەردوون دەبێتە هۆی هەڵگەڕانەوەو كاول بوونی هەموو بوونەوەر

ئەگەر سەیری گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار بكەین دەبینین: لە هەموو گەردووندا هێزی كاهرۆموگناتیسی بەرامبەرە لە نێوان هەردوو جەمسەری جیاوازدا واتە: ژمارەی هەموو جەمسەرە گەرمەكان لە گەردووندا یەكسانە لەگەڵ ژمارەی هەموو جەمسەرە ساردەكان، ئەگەر تەنها جەمسەری یەكێكیان بچێتە سەر ئەوی تریان واتە: یەك جەمسەر جیاوازیان هەبێ لە زۆرو كەمیدا، لە ماوەی چەند چركەیەكدا هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەر لەناو دەچن.

سوپاسی بێ پایان بۆ پەروەردگار ئەم ڕێكخستنە سەر سوڕهێنەرە بەڕێوە دەبات، ئایا بە حاڵەتی كەساسیەوە خوانەناسەكان چی دەڵێن؟ ئایا ئێستاش هەر دەڵێن: بەڕێكەوت ئەم گەردوونە دروست بووەو خۆی لە خۆیەوە دەچێتە بەڕێوە؟

لەبەر ئەوەی باسی هێزی كاهرۆموگناتیسیمان كرد، كەمێك باسی تیشكی خۆر ئەكەین یان تیشكی كاهرۆموگناتیسی.

زانای بەناوبانگ (ئیسحاق نیوتن) سەلماندی كە تیشكی خۆر لە چەند ڕەنگێكی جیاواز پێك هاتووە، هەروەها شەپۆڵ و لەرینەوەی جیاوازی هەیە[١].

**ئەم زانایە لە تیشكی خۆردا ئەم ڕەنگانەی دۆزیەوە :**

١- ڕەنگی سوور.
٢- ڕەنگی پرتەقاڵی.

---

(١) علم الفلك (لا ٥٦٠).

٣- ڕەنگی زەرد.

٤- ڕەنگی سەوز.

٥- ڕەنگی شین.

٦- ڕەنگی وەنەوشەیی.

شەپۆلە کاهرۆموگناتیسیەکان خاسیەتی جیاوازیان هەیە، بەڵام خۆیان جیاواز نین.. بۆ نمونە: ئەو شەپۆلانەی دێنە بەرچاومان و ئەو شەپۆلانەی دێنە بەر گوێمان لە ڕادیۆوە وەکو یەك وان، هەرچەندە لە خاسیەتەکانیاندا جیاوازی هەیە، هەروەها هەڵگری هێزی پەروەردگارن ئەو هێزەی لە شتێك هەموو شتێك دروست دەکات.

**جا تیشکی کاهرۆموگناتیسی: لەم تیشکانە پێك هاتووە :**

١- تیشکی (گاما).

٢- تیشکی سینی ئان ئێکس.

٣- تیشکی وەنەوشەیی.

٤- تیشکی بینراو.

٥- تیشکی ژێر سوور، لەگەڵ شەپۆلی (مایکرۆویف) و شەپۆلە ڕادیۆییەکان.

ئەو خاسیەتە جیاوازانەی لەم شەپۆلانەدا هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ درێژاییان، ئەم جیاوازی درێژیەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بڕە وزەیەی کە لە فۆتۆنەکانیاندا هەیە، (فۆتۆن بارستەی نیە، هەڵگری شەپۆلی کاهرۆموگناتیسیە).

هەتاکو وزە زۆر بێت لە فۆتۆندا درێژی شەپۆل کەم دەبێتەوەو لەرینەوە زۆر دەبێت، درێژی شەپۆل بریتیە لە ماوەی نێوان دوو لوتکەی دراوسێ لە شەپۆلەکاندا.

لەرینەوە بریتیە لە بڕی ئەو شەپۆلانەی لە چرکەیەکدا دەڕۆن بەخاڵێکی دیاری کراو، بۆ نمونە: لەرینەوەی تیشکی (گاما) گەورەترە لە لەرینەوەی

بەشی یەکەم

تیشکی بینراو، بەڵام شەپۆڵەکانی کورتە، هەروەها فۆتۆنی تیشکی (گاما) وزەی زۆرتری تێدایە، لە فۆتۆنی تیشکی بینراو، واتە: هەتاکو وزە کەم بکات درێژی شەپۆڵ زیاد دەکات[1].

بەم جۆرە فۆتۆن دەبێت بە گوێزەرەوەی (ناقل) تیشکە شەپۆڵ درێژەکان لە تیشکی کاهرۆموگناتیسی.

(١) علم الفلك (لا ٥٦١).

## کۆتایی گەردوون چۆن دەبێت؟

دەربارەی ئەو مشتومڕەی کە دەکرێت پێی بڵێین: وزەی تاریك واتە: ئەو هێزە نادیارەی بەرای زاناکان هۆکاری کشانی گەردوونە بە تێکڕاییەکی خێرایی هەمیشەیی (برادلی شیڤەر) زانای گەردوونناسی ئەمریکی لە زانکۆی (لویزیانا)ی بۆمبایەکی گەورەی تەقاندەوە، شیڤەر توێژینەوەیەکی پێشکەش کرد کە تیایدا باس لەوە دەکات کە ئەو هێزەی وزەی ڕەش دەریدەکات لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دی دەگۆڕێت، ئەو توێژینەوەیە بڕی زیاتر لە گومان دەخاتە سەر بیرۆکەی ئەلبرێت ئاینیشتاین دەربارەی جێگیری گەردوونی پاش ئەوەی کە بەهەوڵی زاناکان پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر ئەو بیرۆکەیە لە بیرچوونەوەی زانستی پارێزرا.

(شیڤەر) لە دیدارێکی تایبەت کە لەگەڵیدا ساز درابوو پاش کۆبونەوەی هەفتانەی کۆمەڵەی گەردوونی ئەمریکی کە تیایدا توێژینەوەکەی پێشکەشکردبوو گوتی: من ئەو توێژینەوەیە وەك بەڵگەیەك پێشکەش ناکەم بەڵکو وەك ئاماژەیەك دژی ئەوەی بەجێگیری گەردوونی ناسراوەو وەك ئەنجامێکی سەرەتاییش بۆ دەرخستنی چۆنیەتی گۆڕانی وزەی ڕەش بە گۆڕانی کات، ئێمە پێویستمان بە کەسانی زیاتر هەیە بۆ تاقیکردنەوەی ئەنجامەکان و بەدەستهێنانی زانیاری زیاتر لەو ڕووانەوە.

بنەمای دۆزینەوەو زانیاریەکانی شیڤەر شیکردنەوەی ئەو تەقینەوە گەردوونیە زۆر پڕشنگدارانەیە کە بە تەقینەوەکانی تیشکی گاما دەناسرێت کە لە دووری ١٢,٨ بلیۆن ساڵی ڕووناکیەوە دۆزراونەتەوە.

شیڤەر ئەوەی دۆزیەوە کە تەقینەوە زۆر زۆر دوورەکان زیاتر پڕشنگدارن لەوەی کە پێویست بوو وانەبن ئەگەر گەردوون بە تێکڕاییەکی نەگۆڕ لە کشان

و گەورەبووندا بێت بە تێپەڕبوونی کات، دەڵێت: گەردوون لە کشاندایە، بەڵام بە تێکڕاییەکی گۆڕاو کە وردە وردە کەم دەکات[1].

بە پێی توێژینەوەکەی شیڤەر لە هەندێك کاتدا ئەو هێزەی کە وزەی ڕەش دروستی دەکات دەبێتە سفرو هیچ فشارێك لەسەر گەردوون دروست ناکات، کە هیچ ڕاڤەو لێکدانەوەیەکیش نیە بۆ ئەو دیاردەیە، دۆزینەوەکانی شیڤەر دادەنرێت بە یەکەمین دۆزینەوە کە تیایدا تەقینەوەکانی تیشکی گاما بەکاردەهێنرێت بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوە لە وزەی ڕەش، ئەو دۆزینەوانەش ئەنجامی وایان داوە کە دژایەتی ئەو هەموو بەڵگە کەڵەکە بووانە دەکات کە لە میانەی بەدواداچوونی جۆرێکی دی لە تەقینەوەکان کۆکراونەتەوە کە بە تەقینەوەی سوپەر نوڤا دەناسرێن، واتە: گەردوون دەکشێت بە تێکڕاییەکی نەگۆڕ.

چەمکی وزەی ڕەش لە ساڵی ١٩٩٩ دا دەرکەوت وەك هۆیەك بۆ ڕاڤەکردنی ئەو ڕاستییەی کە دەڵێت: کشانی گەردوون کەم دەکات هەر لە تەقینەوە مەزنەکەوە واتە: پێش ١٣,٧ بلیۆن ساڵ کە پێشتر وا دەزانرا ئەو کشان و گەورەبوونە بە تێکڕاییەکی نەگۆڕ لە زیادبووندایە، بەهۆی ئەوەشەوە دەرکەوت کە کشانی گەردوونی خێرابوونەوەو هێواش بوونەوەی بەخۆوە نەدیوە وەك پێشتر وا دانرابوو، هەردەبێت هێزێکی دوورکەوتنەوە هەبێت کە بەسەر هێزی کێشکردندا زاڵبێت کە دەیەوێت گەردوون بچێتەوە یەك، زاناکانیش ئەو هێزەیان ناو ناوە وزەی ڕەش.

لە ساڵی ١٩٩٨ع زاناکان ڕووبەڕووی دۆزینەوەیەکی گەردوونی گەورە بوونەوە ئەویش ئەوەبوو کە گەردوون لە کشانێکی خێرای بەردەوامدایە، زاناکان لەلایەکەوە گرفتی ئەوە هاتە بەردەمیان کە نەیاندەزانی هۆکاری ئەو دیاردەیە بزانن چیە؟ لەلایەکی تر چەمکی وزەی تاریك هاتە پێشەوەو دانرا بە هۆکاری ئەو کشانە خێرایەی گەردوون، وزەی تاریك گرفتێکی گەورەی لەبەردەم زاناکان دروست کرد، ئەگەر ئەو هۆکارە وزەی تاریك بێت ئەی وزەی تاریك خۆی چیەو چەمکی ئەو وزەیە چی دەگەیەنێت[2]؟

---

(١) موجز تأريخ الأرض باسل محمد الحديثي، لا ٢٨٠، دار المأمون - بغداد ١٩٩٠.

(٢) موجز تأريخ الأرض باسل محمد الحديثي، لا ٢٨١، دار المأمون - بغداد ١٩٩٠.

دۆزینەوەی نهێنی و نادیاری کاتی زۆرو هەوڵ و ئارام گرتنی زۆری دەوێت بە تایبەتی بابەتێکی زۆر ئاڵۆزی وەك وزەی تاریك کە لەوانەیە پێویستی بەدوو لایەن بێت، لایەنی یەکەم لێکۆڵینەوە لە پێکهاتەی مادده لەسەر ئاستی تەنۆلکە سەرەتاییەکانی خوار گەردیلەوە ئەوەش لە ڕێگەی ئەو تاودەرە زەبەلاحانەی کە ئێستا هەن لە ئەمریکاو سویسراو ئەڵمانیاو وڵاتانی دیکە، لایەنی دووەمیش لێکۆڵینەوە لەم گەردوونە فرەوانە لە ڕێی هەموو ئەو ئامێرانەی لەبەردەستدان وەك تەلسکۆبە زەمینی و فەزاییەکان.

زانیاری دەربارەی وزەی تاریك گرنگی و بایەخی زۆری هەیە بۆ تێگەیشتنمان لە گەردوون، ئەوەی تا ئێستا زانراوە ئەوەیە کە گەردوون لە سێ پێکهێنەری سەرەکی پێکهاتووە، ماددەی ئاسایی، ماددەی تاریك، وزەی تاریك، لەو پۆلینکردنەدا مرۆڤی سەدەی بیست و یەك تەنیا ٧٠٪ ی ئاسیوەو ٢٥٪ ی گەردوون ماددەی تاریکە کە مرۆڤ هیچی دەربارەی نازانێت و لەوەش سەیرتر ٧٠٪ وزەی تاریکە هەر هیچی دەربارە نازانرێت کە ئەوە گرنگترین زانیاریە بۆ توێژینەوەکانی گەردوون و فیزیای گەردوونیە.

لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا زاناکان بۆیان دەرکەوت کە گەردوون لەباری کشاندایە و لە کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو زاناکان ئەوەیان دۆزییەوە کە تێکڕای کشانی گەردوونی جێگیر نیەو لە خێرابووندایە، بە پێی یاسای نیوتن هێزی کێشکردن لە نێوان ماددەکاندا هەیە، بەو پێیە دەبوایە هەموو پارچەکانی گەردوون بەرەو یەکترکێش بوونایە تا ئەو کاتەی هەموو ماددەی گەردوونی لە خاڵێکدا کۆدەبوونەوە، دەبێت ئەوە چی بێت کە نایەڵێت ئەوە ڕوویدات و یان ئەو هێزی دوورکەوتنەوەیە لە کوێوەیە؟ ئەوەی سەیرە ئەوەیە هەر چەندە گەردوون گەورە بێت پارچەکانی زیاتر لە یەکتر دوور دەکەونەوەو هێزی دوورکەوتنەوە گەورەتر دەبێت و ناتوانرێت پێوانەی ئەو هێزەی دووکەوتنەوەیە پێوانە بکرێت.

سەیر نیە بوترێت ٧٠٪ ی گەردوون بریتیە لە وزەی تاریك کە ئەوەندە توانای هەیە کە پارچەکانی گەردوون پاڵ پێوە بنێت بە ئاراستەی پێچەوانەی هێزی کێشکردن لە نێوان ئەو پارچانەدا کە ئەوەش بەڕاستی سەیرە ئەو وزەیە چیە

کە ئاوا پارچەکانی گەردون لە یەکتر دوور دەخاتەوە؟! ئەو وزەیەی کە ٧٠٪ی هەموو گەردوونی داگیر کردووە وزەیەکی شاراوەو نادیارە وەك یەکێك لە زانا فیزیاویەکان، د.لیڤۆ دەڵێت: ئەوە هەروەك ئەو ئاوەیە کە ٧٠٪ی گۆی زەوی داپۆشیوەو هیچیش دەربارەی نەدەزانرا پێش چەند سەدەیەك لەمەوبەر و وزەی ڕەش بەهەمان شێوە چەند سەدەیەکی دەوێت تا شتێکی لێ تێبگەین، یەکێك لە ڕاڤەکارانی وزەی تاریك ئەوەیە کە سیفەتێکی فەزایە بۆیە نابێت کەم بکات لەگەڵ کشانی گەردووندا بەڵکو دەبێت زیاد بکات، چونکە بە کشانی گەردوون فەزای نوێ دروست دەبێت بۆیە ئەو وزە ڕەشە زیاد دەکات کە ئەمە زۆر گرانە لێی تێبگەین، گەردوونیش با بۆ خۆی لە کشانێکی خێرای بەردەوامدا بێت.

بۆیە گۆڕانی گەردوون لە تەقینەوە مەزنەکە تا ئەمڕۆ پەیوەستە بە بڕی ماددەی ئاسایی، ماددەی ڕەش و وزەی ڕەش کە لە گەردووندا هەن، ئەگەر بڕی ماددەی ئاسایی و ماددەی ڕەش یان تاریك زیاتر بوایە ئەوا گەردوون دەچویە یەکو ئەگەر وزەی ڕەش زیاتر بوایە ئەوا گەردوون بەجۆرێکی وا دەکشا کە هەموو پارچەکانی لە یەکتر جیا دەبوونەوەو دەپچڕان! واتە: دوا ڕۆژی گەردوون بەستراوەیە بە پەیوەندی نێوان ماددەو ئەو وزە نادیارەوە بۆ تێگەیشتن لە گەردوون دەبێت ئێمە لە ماددەی تاریك و وزەی تاریك تێبگەین[١].

(ستیڤن هۆکینگ) دەڵێت: تیۆری ڕێژەیی ئەنیشتاین بە سروشتەکەی خۆی پێشبینی کرد کە (کات - شوێن) لە کاتی تاکبوونی تەقینەوە مەزنەکەوە دەستیپێکردووە، یان لە تاکبوونی لەناوچوونی مەزن (ئەگەر دووبارە گەردوونی گشتی هەرەسی هێنا) یان لە تاکبوونی ناو کونە ڕەشەکان (ئەگەر ڕوویەرێکی ناوخۆیی هەرەسی هێنا)، بۆ نموونە لەناوچوونی ئەستێرەیەك کۆتایی دێت، هەر ماددەیەك ئەگەر لەناو کونەکەشدا بێت و بکەوێتە خوارەوە ئەوا لە کاتی بەتاکبووندا لەناو دەچێت، ئەو تاکە شتەی کە لێی دەمێنێتەوە کاریگەری کێشکردنی بارستاییەکەیەتی کە لە دەرەوە هەستی پێدەکەین، ئەمە لەلایەکەوە،

---

(١) موجز تأريخ الأرض باسل محمد الحديثي، لا ٢٨٤، دار المأمون — بغداد ١٩٩٠.

لەلایەکی دیکەوە ئەگەر بێت و لە کاریگەریەکانی ووردبینەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە بارستایی ماددەکە یان وزەکەی لە کۆتاییدا دەگەڕێتەوە بۆ بەشەکانی دیکەی گەردوون و کونی ڕەش لەگەڵ ئەو تاکبوونەی لەناویدایە دەبێتە هەڵم و لە کۆتاییدا لەناو دەچێت و نامێنێت، بەڵام ئایا میکانیکی کوانتەم دەتوانێت کاریگەریەکی زۆر بکاتە سەر تاکبوونی تەقینەوەی مەزن و لەناوچوونی مەزن؟ ئایا گەردوون سەرەتا یان کۆتاییەکی زانراوی هەیە؟

زانای بەناو بانگ (نیوتن) دەڵێت: گەردوون لە ژمارەیەکی زۆر گلاکسی پێك هاتووە لە ئەسیردا مەلە دەکەن، لە دواوەی هیچی تێدا نیە، ئەو ڕووناکی و گەرمیەی لە گلاکسیەکاندا دەردەچن لە بۆشایی دا بەبێ گەڕانەوە بڵاودەبنەوە، واتە: گەردوون سنووردار نیە، لەسەر ئەو بنچینەیە گەردوون بەردەوام وزە ون دەکات و بەرەو نەمان دەڕوات، لە کۆتاییدا دەڵێت: ئەمانە وای لێدێت هەموویان نامێنن و ئەستێرەکان دەتەقێنەوەو ڕۆژی دوایی دادێت، بەڵام لە هەمان کات زۆربەی زۆری هاتنی ئەمانەش بۆ ئیصلاح کردنی مرۆڤە بۆ ئەوەی تێبگات لە دەرەنجامی ئەو هەموو هەقیقەتانەی کە ڕوو دەدات[1].

بەشی یەکەم

---

(١) موجز تأريخ الأرض باسل محمد الحديثي، لا ٢٨٥، دار المأمون — بغداد ١٩٩٠.

## دەستپێکی کۆتایی بونەوەر

چۆن کۆتایی بەو هەسارەیە دێت کە ژیانی تێدایە، گەیشتن بەو پلەو ئاستە جیاوازانە لە شێوەو جۆرو ئاستی هەستپێکردندا، بەدڵنیاییەوە کۆتایی دێت بەژیان لە ڕێگەی ئەستێرە کلکدارە گەورەکانەوە، کە ئەوەش پێکدادانی زەوی و ئەو ئەستێرەیە کە دەبێتە هۆی تێکچوونی ژیان بە وێنەی ئەو ڕووداوەی کە (٦٥) ملیۆن ساڵ پێش ئێستا ڕوویداوە، بەو هۆیەوە پێکدادانی هاوشێوە بە ڕێژەی ٧٥٪ ڕوویدا لەناو هەموو جۆرەکانی زیندەوەر لەسەر زەوی.

بەردەوام مانگ لە زەوی نزیك دەبێتەوە تاوەکو ئەو پیاکێشانە ڕوودەدات و دەگەڕێتەوە بۆ هەمان دەرەنجام کە لە پیاکێشانی یەکەمدا بەهۆی ئەستێرەی کلکدارەوە ڕوویدا، یاخود کۆتایی بەهەموو هەسارەکان و (هەموو کۆمەڵە خۆرەکان)ی تر دێت، لەنێو کونی ڕەش (ثقب السوداء).

بەڵام گەر وا بزانین هیچ شتێك ڕوونادات لەوەی باسمانکرد، ئەوا چۆن ئەم هەسارەیەی لەسەری دەژین کۆتایی پێدێت؟

لە وەڵامدا لەگەڵ ئەوەی هەمووومان دەزانین هیچ مرۆڤێك ناتوانێت ئەو شتە ببینێت لەبەر ئەوەی ژیان کۆتایی پێدێت پێش ئەوەی زەوی و خۆر کۆتایی پێبێت.

دوای (١٠) هەزار ســاڵ : کاریگەری مرۆڤ بەردەوام دیارەو ئاشکرایە لەو کۆشك و تەلارو کارانەی کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات لەسەر زەوی بەردەوام دەبێت، بە هەزاران ساڵ ئەو زەمینەی کە لەواقیعدا بە ملیۆنەها ساڵ یاخود ملیارەها ساڵ لێکرداوەتەوە لە دایکبوون، ئەم هەسارەی کە لەسەری دەژین نزیکە (٥) ملیار ساڵ دەمێنێتەوە لە ژیان بەهەمان شێوەی ئێستا یاخود کەمتر لەوە، بزوێنەری سەرەکی زەوی بریتیە لە (هایدرۆجین) کە لە زەویدا بەکاردەبرێت و نامێنێت[١].

---

(١) موجز تأريخ الأرض ، لا ٣٢ .

بە تەواوی لە سێ تا چوار ملیار ساڵی ئاینده هەموو هەوا دەگۆڕێت بۆ هیلیۆم، لە کاتی ئەم ڕووداوە هەموو پێکهاتە ناوەکییەکان دەوەستێت کە خۆری لەسەر ئەم تەوازنەی ئێستای هێشتوەتەوە.

ئەگەر مرۆڤ بەردەوام زیندوو بێت لەسەر زەوی، ئەوا شاهێدی بینینی گەورەترین ڕووداو دەبێت کە ترسێنەرە لە مێژووی جیهاندا، بەجۆرێك دەبینی خۆر درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە (١٢٠) جار لەوەی ئێستا هەیە، هەم دەگۆڕێت بۆ ئەستێرەیەك لە جۆری (العملاق الاحمر) تا ڕەنگی خۆر لە زەردەوە دەگۆڕێت بۆ سوور.

لە ڕاستیدا خۆر قۆناغ بە قۆناغ هەڵدەوەشێت و سیفەتی خۆر لەدەست دەدات و کاریگەری دەگۆڕێت بۆ سەرەتای سیلسیلەی گەرمی و تاوداری ناوەکییەکەی کە لێوەی وەردەگیرێت، زۆرترین و گەورترین وزە لە ئاستێکدا سەر دەکێشێت بۆ ئەو درێژبوونەوەیەی خۆر، کە دەگۆڕێت بۆ (العملاق الاحمر) کە بەشێك لە جازیبەتەکەی زەوی کەمدەبێتەوەو کەمێك زەوی لەخۆر دووردەخاتەوە.

دوای (٤) ملیار ساڵ: ئاستی ئاوەکان کەمدەبێتەوە بە شێوەیەکی بەرچاو کە لێرەوە کێشەو گرفتی زەوی دەستپێدەکات، پلەکانی گەرما بەرز دەبنەوە ئاوی دەریاکان دەبن بە هەڵم، بە جۆرێك زەوی گەورەترین شت لەدەست دەدات کە ئەویش (هایدرۆجین)ە، کە هەمووی دەگۆڕێت بۆ (هیلیۆم) لێرەوە دوورکەوتنەوەی خۆر دەستپێدەکات.

دوای (٤,٥) ملیار ساڵ: کەرتبوون و تێکچونی هەموو بەشەکانی ژیان لەسەر زەوی و دیارنەمان و ونبوونی هەموو دەریاو زەریاکان، بەجۆرێك پلەی گەرما بەرز دەبێتەوە بۆ سەدان پلەی سەدی (وەك ئەستێرەی زوهرەی لێدێت پلەی گەرمای ئاوەکانی لە ئێستادا)[1].

ژیان زۆر پێشدەکەوێت بەجۆرێك ون دەبێت و نامێنێت یاخود دوور دەکەوێتەوە لەم هەسارەیە ئەویش بەسواربوونی کەشتی گەلێك کە لە بۆشایی ئاسماندان.

---

(١) موجز تأريخ الأرض ، لا ٣٩ .

**دوای (٧) ملیار ساڵ:** لە کاتی گەشتن بەم قۆناغەدا زەوی دەبێتە نزیکترین هەسارە لە خۆرەوە بەجۆرێك زەوی (عەتاردو زوهرە) هەڵدەوشێتەوە کە لەوێوە دەستپێدەکات و دێتەوە یەك لەدوای (٧) ملیار ساڵ خۆر لە زەوی نزیك دەبێتەوەو ڕۆژ بەرەو لەناوچوون دەڕوات، ئەمەش بەهۆی ئەو جازبیەی کە زەوی هەیەتی بەردەوام خۆر بە شێوەیەکی پلەبەندی دەگۆڕێت بۆ (قزم ابیض) کە خۆرێکی زۆر لاواز دەنوێنێت کە تیشك و گەرمیەکەی لە (١٥) کیلۆمەتر تێپەڕ ناکات.

**دوای (٧,٥) ملیار ساڵ:** لەژێر کاریگەری و فراوانبوونی کۆمەڵگەی خۆر بەردەوام زەوی لە خولگەی خۆی دووردەکەوێتەوە لەخۆر، لەچاو ئەو دووریەی ئێستای کە ئیتر خۆر ناتوانێت زەوی قوت بدات.

دوای (٨) ملیار ساڵ خۆر دەگۆڕێت بۆ (قزم أبیض) بەڵام چەندین دەرهاویشتەی غازی بەهێز لەخۆی دووردەخاتەوەو ڕووەو زەوی، ئەم غازانە بەر زەوی دەکەون لەم کاتەدا ژیان لەسەر هیچ بەشێکی زەوی نامێنێت و بەکۆمەڵەی خۆریشەوە، چونکە خۆر ناتوانێت ڕووناکی و گەرمی وەك پێویست ببەخشێتە زەوی.

ئایا گەردوون لە کشان دایە، وە لەکشان بەردەوام دەبێت؟

لەوانەیە لە دایك بوونی گەردوون بزانرێت ئەگەر دروست بوونی بەهۆی تیۆری تەقینەوەی مەزن لێك بدرێتەوە، بەڵام ئایا دەتوانین کۆتایی بزانین؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئاسان نیە، لەبەر ئەوەی پشت بە هەموو زانراوەکان و مۆدێلەکانی ئەندازەی و فیزیایی تەواوی گەردوون دەبەستێت، بۆ نمونە گریمان گەردوون سنووردار نیە کرداری کشان هەتا هەتایە بەردەوام دەبێت، بەڵام ئەگەر گەردوون بەسەر خۆی داخرا بێت بەشێوەی وەك گۆیەك، لێرەدا چەند بارێك هەیە![1]

لەوانەیە هەتا سەر لە کشان بەردەوام بێت، بەڵام تێکڕای کشان بە هۆی بەرهەڵستی هێزی کێشکردن بە تێپەڕبوونی کات بەرەو نەمان دەچێت.

---

(١) موجز تأریخ الأرض ، (لا ٣٤) .

ئەگەر چڕی گەردوون گەورە بێت لەوانەیە هێزی کێش کردن بەرهەڵستی کرداری کشان بکات، ئەو کاتە گەردوون لە جیاتی کشان دەست بە گرژبوونەوە دەکات، هەروەك لەباری ئەو تەنەی شاوڵیانە سەرەو ژوور دەهاوێژرێت بە هۆی کاریگەری هێزی کێش کردنی زەوی بەرەو هێواش بوونەوەیەکی ڕێك دەڕوات تا دەسوتێت، ئینجا بە تاودانێکی ڕێك بە کاریگەری هەمان هێز بەردەبێتەوە.

زۆربەی زانا ئاسمان ناسەکان لەو باوەڕەدان کە گەردوون لە جۆری کراوە بێت (سنوردار نیە)، هەر لەبەر ئەوەشە کرداری کشان بەردەوامە تا گەردوون دەگاتە باری لەناوچوون (یان مردنی گەردوون) ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەوە تیشکەکان بە بەردەوامی وزە ون دەکەن و هەموو ماددە گەردوونیەکان لەناو ئەستێرەکان کۆدەبنەوە، وەك کەلێنی ڕەشەکان ئەو کاتە گەردوون دەگاتە باری نەگواستنەوەی گەرمی تیایدا گەردوون تا سەر بە هاوسەنگی و نەبزۆکی دەمێنێتەوە.

کۆتایی گەردوون لە ئەنجامی ئەوە نیە کە زانایان پێشبینیان بۆ کردووە، بەو مانایە لە ئەنجامی کشان بێت و پاشان ئەم کشانە وورده وورده کەم دەبێتەوە تا گەردوون دەچێتەوە یەك و دەگەینەوە بە خاڵی سفر، بۆیە من توێژینەوەیەکی زۆرم لەو بارەوە کردووە، کە دوا ڕۆژی گەردوون لە ئەنجامی یەك ڕیزی سوپەر گەلاکسییەکان و ئەستێرەو هەسارەکانە[١].

ئەگەر ئەستێرەکان هەتا هەتایە بمێننەوە، واتە: ڕۆژی دوایی نەیەت، ئەوا لەگەڵ بەسەرچوونی کات ئاسمان تا دێت ڕووناکترو ڕووناکتر دەبێت، تا وای لێدێت ئاسمان بە تەواوی لەشەودا ڕووناك و گەشاوە دەبێت، هەر چەندە ئەستێرەکان تەنیا (١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ دەژین و دەمێننەوەو لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا ڕووناکی لە دووری ئەستێرەکانەوە بە ئێمە دەگات، کەواتە تا ئەستێرەکان لە ئێمە نزیکترین ئەوا لە ساردبوونەوەدان و بەرەو نەمان دەچن، تا دەگاتە ئەو خاڵەی کە لەبەر چاومان ون دەبن، چونکە دووری ئەستێرەکان واتای گەنج بوونیان دەدات و نزیکیشیان بەو مانایە دێت کە کۆنن.

---

(١) موجز تأريخ الأرض، ل٤٣٧ .

خوای گەورە دەفەرموێ: [يَوْمَ نَطْوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥۚ وَعْدًا عَلَيْنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ].

واتە: ئەو ڕۆژەی کە ئاسمان وەك پەڕەیەکی نووسراوە دەپێچینەوە، وەکو یەکەمجار دەستمان پێی کردەوە دەیگێڕینەوە، پەیمانمان داوە کە ئێمە کردومانەو ئێمە دروستی دەکەینەوە.

**خاڵی ئیعجازی لەم ئایەتەدا ئەوەیە:**

زاناکان دەڵێن: ئێستا گەردوون بەردەوام لە فراوان بووندایە، لە هەمان کات زاناکان لەگەڵ ئەوەن کە ڕۆژێك دێت ئەم گەورەبوونە دەوەستێت و ئەم فراوان بونە کۆتایی دێت، ئینجا بە پێچەوانەوە گەردوون بچوك دەبێتەوەو دەگاتە ئەو خاڵەی کە یەکەم جار تەقینەوەکە ڕوویدا بوو دەچێتەوە بۆ دۆخی پێشوو، قورئان جەخت لەسەر ئەو ڕاستیە زانستیە دەکات و زاناکانی گەردوون بە ئیسپرینگێکی بەراورد دەکەن، کە ڕادەکێشرێت تا دەگاتە ئاستێك، کە بەریدەیت دێتەوە دۆخی پێشووی.

ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین خوای گەورە فەرموویەتی: [كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ] خوا کردویەتی بە بڕیارێك و پەیمانێکی خۆی کە ئەم گەردوونە گەورە بکات تا ڕاددەیەکی دیاری کرا و پاشان پەیمانە لەسەر خۆی فەرمویەتی: دەیهێنینەوە حاڵەتەکەی خۆی.

بە واتای ئەم گەردوونە دوورە بەرفرەوانە، ئەم بینایە پتەوە بیناکراوە لە تریلیۆنەها تریلیۆنەها لە ئەستێرەکان کۆتایی دێت، بە کرداری پێچەوانە بۆ خاڵی یەکەم، کە هەموو وێنەیەکی ماددەو شوێن و کاتی تێ دەبینرێت و بە تەواوی لەو ئەستێرە سەرەتاییە دەچێت کە گەردوون دەستی پێکرد[1].

دەسا مەزنی و پاکی هەر بۆ خوای پەروەردگار! چەندە بە وردی لە کۆتایی گەردوون دەدوێ!

---

(١) موجز تأريخ الأرض ، لا ٩٨ .

ئەگەر سەیری قورئان بکەین لە ڕاستیدا کرداری پێچانەوەی بەشەکانی گەردوون ـ کە ئەم ئایەتە باسی کرد ـ هەمان دەرەنجامە کە دواهەمین توێژینەوە زانستیەکانی ئێستای لەمەڕ گەردوونیش بە دەستەوەی دەدەن!

زانایانی گەردووونناسی بەیەك دەنگ دەڵێن: ڕاستە هێڵ لە گەردووندا نیە و هەموو شتێك لارو چەماوەیە و سەرجەم بەشەکانی گەردوون لە هەسارەو ئەستێرەو گەلەئەستێرەو نەیزەك و کلکدارەکان و تیشکەکان و کونە ڕەشەکان لە چەند سوڕگەیەکی لارو چەماوەدا دەسووڕێنەوە، کەواتە کارێکی تا بڵێی مەنتیقیە کە کۆتایی گەردونیش لارو چەماوە بێت، بە وێنەی پێچانەوەی کاغەزێك.

خوای پەروەردگار وشەی [كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ] ی بەکار هێناوە، کە بەو تۆمارە دەوترێت (چەشنی کاغەز) کە نوسینی لەسەر دەکرێت، خۆ کاتێ ئەو تۆمارە دەپێچرێتەوە، بێگومان نوسینەکانیشی لەگەڵدا دەپێچرێنەوە کە لەسەری نوسراون، جا لە کۆتایی گەردووندا هەمان شت بەسەر گەلەئەستێرەکاندا دێت، بە وێنەی کاغەزی نوسراو بەسەریەکدا دەپێچرێتەوە.

زانایانی گەردوون و فیزیایی بانگەشەی کرداری چونەوەیەکە بەهێزەکە دەکەن، جیاوازن لە بۆچووندا، هەیانە وای بۆ دەچێت کۆتایی هەبوونەو هیچی لە دوا نایەت، هەیانە وای بۆ دەچێت کردارێکی بە لەرە لەرەی بەردەوامە، هەموو ئەمانە بە شێوەی گومان هێنراوەتەوە لە قوڵایی پەنهانی ڕەهاداو نایروژێنێت.

زانایان لەو بڕوایەدان کە گەردوون کراوەیە و سنووری نیە، ئەمەش لە کاتی کرداری بەرەو سوور چوون، گشت ماددەی گەردوون لەناو ئەستێرەکانی دوا قۆناغدا کۆدەبنەوە، وەك ئەستێرە ڕەشەکان (النجوم السوداء) ئەو کاتە گەردوون گەرمی ناگەیەنێ و تا سەر خامۆش دەبێت[1].

زانایانی گەردووونناسی سەریان سوڕماوە نازانن کە ئایا گەردوون لە داهاتوودا دادەخرێت؟ واتە: لە کشان دەوەستێت و دەست بە وێکهاتنەوە دەکات، یان دەکرێتەوە واتە: بۆ هەتا هەتایە لە کشاندایەو بەردەوام گەورە دەبێت.

---

(١) علم الفلك، د فياض النجم، د حميد مجول، لا (٤٠٩-٤١٠).

لە لایەکی ترەوە دیاردەیەکی وەك فرەوانبوونی گەردوون (توسع الکون) کە زانستی ئەمڕۆ سەلماندویەتی و شتێکە ئەگەر بە زانستی پێشکەوتووی ئەمڕۆ نەبوایە هەرگیز مرۆڤ هەستی پێ نەدەکرد، بە پێی ئەم دیاردەیەش گەلە ئەستێرەکان لە بۆشاییدا بەردەوام لە یەکتر دوور دەکەونەوە، ئەمەش بە هۆی هەمان هێزی تەقینەوەی یەکەم جاری گەردوونەوە کەوا لە پارچەکانی تەقینەوەکە (گەلە ئەستێرەکان) دەکات، بەردەوام دوور بکەونەوە تا کاتێکی دیاریکراو.

دیارە باسکردنی هەموو ئەم دیاردانە بەم شێوەیە لە قورئاندا باسی لێوەکراوە، خوای گەورە دەفەرموێ: [وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ].

ئەم ئایەتە قورئانیە گوێی خەڵکی ڕووشاند لە ماوەی چواردە سەدە، خەڵکی تا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لەسەر ئەوە بوون کە گەردوون جێگیرەو ناگۆڕێت، کاتێك زانایانی گەردووناسی لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەم ساڵی (١٩٢٤) دانیاننا بە ڕاستیەتی فرەوانبوونی گەردوون و دوورکەوتنەوەی زۆربەی کاکێشانەکان لە یەکتری بە خێراییەکی ئەوەندە زۆر کە نزیکە وەکو خێرایی ڕووناکی خێرا بێت، ئەم تێبینیانەش بە لیلی لە نێوان زانایان مایەوە، تاکو یاساکانی فیزیای تیۆری دانراو هەموو هاوکێشە بیرکاریەکان و پێوانە گەردوونیەکان ڕاستی کشانی گەردوون و فرەوانبوون و دوورکەوتنەوەی کاکێشانەکان، ئەمەش یەکێك بوو لە گرنگترین دۆزینەوە زانستیەکانی مێژووی مرۆڤایەتی[1].

ئەستێرەکان (مجموعة هائلة من النجوم) نزیکە وایان لێبێت کە بە شێوەیەکی بەردەوام لە یەکتر دووربکەونەوە، ئەمەش پێی دەگوترێت: فرەوانی بوونەوەر [وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ].

واتە: ئاسمانمان بەهێز دروستکردووەو بەردەوامیش گەورەو فراوانی دەکەین.

واتای ئەم ئایەتە ڕوونەو ئاماژەیەکی ئاشکرایە بۆ بەردەوام گەشەکردن و فراوانبوونی بنیاتی گەردوون (کە لە ئایەتەکەدا بە ئاسمان ئاماژەی بۆ کراوە).

---

(١) علم الفلك، لا (٤٠٣).

(ئیبنو عەباس) و (موجاهید) و (قەتادە) و (سەوری) دەڵێن: [بِأَيۡيْدٍ] واتە: بەهێز، هەروەها زانایانی تەفسیر ئاماژەیان بەوە داوە کە وشەی فراوانی دەکەین (اسم فاعل)ە بە شێوەی (جمع) بۆ کرداری (أوسع) کە لە عەرەبیدا بە واتای بەردەوامی دەگەیەنێت، واتە: گەردوون لە فراوانبووندایە لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتووشدا، هەتا ئەو کاتەی خوای گەورە ویستی لەسەر بێت.

ئەی دەبێت ئەو فراوانبونەی گەردوون چۆن بێت؟ کە قورئانی بە پێز پێش (١٥) سەدە ئاماژەی پێکردووە!!

ئەو زەویەی لەسەری دەژین بەشێکە لە چەند هەسارەیەك کە بە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوەو پێیان دەوترێت: سیستەمی خۆر، سیستەمی خۆریش لەگەڵ چەند کۆمەڵەیەکی ترو بورجەکاندا گەلە ئەستێرەیەك پێك دەهێنن کە پێی دەڵێن ڕێی کاکێشان.

گەردوونی فراوان وەك بۆشاییەك دەردەکەوێت کە پڕە لە ملیۆنان ملیۆن گەلە ئەستێرە، هەر یەکەیان چەند جیهانێکن مەودای زۆر گەورە لە نێوانیاندایەو لێکیان جیا دەکاتەوە وەك چەند دورگەیەك وان لە بۆشاییەکی گەردوونیی گەورەدا.

لە سەرەتای سەدەی بیست زانایانی گەردوون بۆیاندەرکەوت کە گەلە ئەستێرەکانی گەردوون بەخێراییەکی زۆر لە گەلە ئەستێرەی ئێمە (ڕێگەی کاکێشان) دوور دەکەونەوە، لە دۆزینەوەکانیاندا ئامێرێکیان بەکار هێنا پێی دەڵێن: شیتەڵکردنی شەبەنگی ڕووناکی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا بنەماکانی دانراوە[1].

لە ساڵی (١٩١٥)ع زانای فیزیای بەناوبانگ ئالبرێت ئانشتاین بیردۆزەکەی بڵاوکردەوە کە پێی دەڵێن بیردۆزی ڕێژەیی گشتی کە تیایدا باسی کشانی گەردوونی کرد بەڵام بۆ ئەو کاتە بیرۆکەیەکی سەیر بوو بۆیە پاشماوەیەك ئاینشتاین لەو بۆچوونە کشایەوە.

---

(١) علم الفلك، (لا ٩٨) .

تا ساڵی (١٩٢٩)ع زانای گەردوونی ئەمریکی هابڵ بە تەلیسکۆبەکەی ئەوەی دۆزیەوە کە گەردوون بەڕاستی لە کشاندایە.

(هابل) کە زانایەکی گەردووناسەو توێژینەوەیەکی کردووە، لەم توێژینەوەدا گەیشتۆتە دەرئەنجامێکی ترسناك، ئەویش ئەوەیە کە (خێرایی و دووری کۆمەڵەیەکی زۆر لە گەلە ئەستێرەکان لە یەکتری جیابوونەتەوە، گەردوون بەرەو فرەوان بوون چووە).

ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم گەردوون و زەویەی لەسەری دەژین کپ دەبێتەوە، ئەمەش هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ماددە بەرەو کەمبوون دەچێت بەڵام زانستی ئەستێرەناسەکان دەڵێن: کۆتایی هاتنی ئەم بوونەوەرە لە هاتنێکی یەکجار زوو دەست پێ دەکات، ئەم قسەیەش زیاتر باوەڕ پێکراوە بە پێی ئەم نیشانانەی کە ئێستا لە بوونەوەر دروست بوون و هەستیان پێکردووە.

زانایانی زانستی (بوونەوەرو ئەستێرەناس و گەردووناسان) لەسەر ئەوە کۆکن کە ڕۆژێك دێت ئەم جیهانە لەناو دەچێت، بەزووترین کات بەپێی ئەم نیشانانەی کە بۆیان دەرکەوتووە، بەڵام چ تێکچوونێك و چۆن تێك دەچێت، جیاوازیەکە لێرەیە ئەمەش تەنها خوای پەروەردگار دەزانێت، چۆن تێك دەچێت ڕۆژێك دێت ڕۆژو ئەستێرەو زەوی و مانگ هەمووی لەناو دەچێت[1].

ئایا گەردوون بەردەوام لە فرەوانبوون دایە؟

ئەی باشە هێزی کێشکردن زاڵ ئەبێت بەسەر هێزی فرەوانبوونی گەردووندا؟

یاخود پێچەوانەکەی ڕاستە؟

لەم کاتەدا: دوو گریمان هەیە:

گریمانی یەکەم: ئەوەیە کە خێرایی بەهۆی هێزی کێشکردنەوە وردە وردە هێواش دەبێتەوەو پاشان دەوەستێت و دوای گەردوون دەست بە گەڕانەوە بەرەو دواوە دەکات، هەتا ئەوەی کە هەموو گەردوون دەگەڕێتەوە، ئەمەش تەنها

---

(١) علم الفلك، لا ٣٩٢ .

لە خاڵێكی بچووكدا چڕ دەبێتەوە كە لەوانەیە نزیكەی (سفر) بێت، بێگومان ئەمەش بە واتای مردن و تیاچوونی گەردوونە بە ماوەیەكی زۆر، پێش ئەوەی بگاتە ئەم ڕاددەیە، خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: [كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ][١].

گریمانی دووهەم: هێزی كێش كردن ناتوانیٚ بەسەر هێزی فراوانبونی گەردوون زاڵ ببێت.

ئەی ئەمە ئەوە ناگەیەنیٚ كە مردن سەرەنجامی ئەم گەردوونەیە كە بەردەوام لە فرەوانبوون دایە؟

گەردوون ناتوانیٚ خۆی لەو كۆتاییە حەتمیە هەموو بەدیهێنراوان رزگار بكات كە مردنە، تەنانەت لە گریمانەی دووەمیشدا، چونكە ئەم گەردوونە فرەوانبووە پاش ئەوەی كە سووتەمەنیەكەی تەواو بوو، بەهۆی كاری تیشكدانەوە (تیشكی چالاكی) كە لە هەموو هەسارەكان هەیە، ئەوا - بێگومان - كۆتایی دیٚت، لەم كاتەشدا وەك گۆڕستانێكی گەورەو فراوان بووی لیٚ دیٚت، كە شوێنەواری ژیانی تێدا نەبێت.

خێرایی فراوانبوونی گەردوون وردە وردە دەست بەكەمبوونەوە دەكات، هەتا دەگاتە سفر، بە تەواوی فراوانبوون دەوەستێت، بەو جۆرە گەردوون بە تێپەڕبوونی كات بە چەندین خێرایی زیاد بوو دەست بە ئاراستەكردن و كشان ڕووەو چەقەكەی دەكات[٢].

پاش ملیۆنەها ساڵ ڕووناكی فەزا دەگاتە ڕاددەیەك كە بەرگە نەگرێت و پلەی گەرماش بەرز دەبێتەوە بۆ ملیۆنەها پلە، لەوانەیە پێش گەیشتنیش بەم رادەیە هەموو جۆرەكانی ژیان و زیندەگی كۆتایی بێت و تیابچێت، ئیدی هەسارەكان لە شلەی گەردووندا (حساء الكونی) دەتوێنەوە كە لەبەشەكانی

---

(١) سورة الرحمن: ٢٦ ـ ٢٧ .

(٢) علم الفلك، لا ٢٣٣ .

گەردیلەکان و تیشکەکان پێکهاتووە، ئەم شلەیە پلەی گەرمایەکەی دەگاتە بلیۆنان پلەو ئیتر گەردوون بچووك بچووك دەبێتەوە، تا دەگاتە قەبارەی خاڵێکی زۆر بچوکی نزیك لە سفرو ئیتر دەگۆڕێ بۆ (کونێکی ڕەش).

فرەوانبوونی گەردوون و هێزی ڕاکێشان هەردووکیان پەیوەندیان بە چڕی ئێستای گەردوونەوە هەیە، ئەگەر چڕی گەردوون بگاتە چڕی (حەرج)[1] وەکو زاناکان دەڵێن: ئەو کاتە هێزی ڕاکێشان لە توانای هەیە فرەوانبونی گەردوون بوەستێنێ لە پاشە ڕۆژ بەڵام ئەگەر ئەم چڕیە لە چڕی (حەرج) کەم بوویەوە، واتای ئەوەیە فرەوانبوونی گەردوون زۆرتر دەبێت و بەردەوام دەبێت بەبێ وەستان، بەڵام ئەو چڕیەی گەردوون ئێستا هەیە ٣٥٪ تاکو ٤٥٪ ی (چڕی حەرج)ە هەر چەندە ئەم چڕیەی ئێستای گەردوون زاناکان دایانناوەو ڕاستی تەواو نیە، چونکە هێشتا چڕی ئەشکەوتە ڕەشەکان بە هیچ جۆرێك نازانن لە ناویاندا چی هەیە، لەبەر ئەوەی تیشك قوت دەدەن، هیچ زانایەك و زانستێك لەمەو پێش و لە مەودوایش نازانێت نهێنی ئەم ئەشکەوتە ڕەشانە تێبگات، ئەمە بێجگە لە ئەشکەوتە سپیەکانی لێوارەکانی گەردوون، کە لە ئەشکەوتە ڕەشەکان زۆر زۆرترن، لەوانەیە بە گوێرەی زانست (١٠٠٠٠٠) هەزار ملیۆن ساڵی ڕووناکی تاکو (١٥٠٠٠٠) ملیۆن ساڵی ڕووناکی لە ئێمەوە دوورین، لەبەر ئەوە خێراترین شت تاکو ئێستا ڕووناکیە لە چرکەیەك دا (١٨٦٠٠٠) میل ئەڕوات[2].

زاناکان دەڵێن: دوور نیە لە نێوان گەلە ئەستێرەکاندا گازو تۆزێکی زۆر نەبێت، چونکە ناتوانین بەهیچ جۆرو شێوەیەك بیانبینین، لەبەر ئەوە چڕی گەردوون دوور نیە لە پاشە ڕۆژ کە نەگاتە چڕی (حەرج)، دوای ئەوەی گازو تۆزی نێوان گەلە ئەستێرەکان ئاشکرابوو ـ لەگەڵ ئەشکەوتە ڕەشەکان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هێزی ڕاکێشان زاڵ دەبێت بەسەر هێزی فرەوانبوونی

---

(١) چڕی (حەرج) زاناکان بەم جۆرە حیسابیان کردووە (٤/٧) جاران (١٠-٣٠) توان - ٣٠ غرام سم٣ ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ سێ گەردی هایدرۆجین هەیە لە هەر مەتر موکەعەبێك لە بۆشایی ئاسماندا.

(٢) علم الفلك، لا ٣٢٢ .

گەردووندا، ئەم جوڵانەوەی گەردوونە وردە وردە هێواش دەبێتەوە تاکو دەوەستێ و گەلە ئەستێرەکان دەست دەکەن بە گەڕانەوەی پێچەوانە بۆ شوێنێکی تایبەتی و لە یەك خاڵدا کۆدەبنەوە، بەم جۆرە چاوەڕوانی مردنی ئەستێرەکان نابین لە گەردوونی کراوەدا بەڵکو ئەم جۆرە گەردوونە داخراوەو هەموو ئەستێرەکان بەیەکەوە دەمرن و ڕۆژی دوایی هاویەش دەبێت و هەموو شتێك کۆتایی دێت.

لەم کاتەدا پلەی گەرما بەرز دەبێتەوە: ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن جار گەرمیان زیاد دەکات و ئەستێرەکان هاواری مردنیان لێ بەرز دەبێتەوە و ئەتوێنەوەو شۆربایەکی گەردوونی دروست دەکەن کە پێك هاتووە لە: تیشکەکان و ئەلکترۆنەکان و ناوکی گەردەکان - لە ماوەیەکی زۆر زۆر کەمدا هەموو گەردوون دەتوێتەوە دەبێت بەم شۆربا گەردونیەو دەکوڵێ، بەڵام چ کوڵانێك مەگەر پەروەردگار خۆی بزانێت[1].

بەم جۆرە گەردوون هەمووی دەکوڵێ تاکو قەبارەی کەم دەبێتەوە و دەبێتە سفرو لەناو دەچێت و نامێنێ، زاناکانیش پێی دەڵێن: (القيامة المشتركة)، پەروەردگاریش لە قورئانی پیرۆزدا بە (الطامة الكبرى) سوێندی پێ خواردووە.

خوای پەروەردگار لە قورئاندا باسی ئایەتێکمان بۆ دەکات کە ئاماژە دەکات چۆن هەسارەکان و مانگ و خۆر سەرەتا یەك پارچە بوون و جیابوونەوە، ئاواش جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی هەروەکو فەرموویەتی: [يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ][2].

واتە: بێباوەڕەکان بێ باکانە دەپرسن کەی ڕۆژی دوایی دێت و بەرپا دەبێت؟ کاتێك دێت چاو ئەبڵەق دەبێت، مانگیش دەگیرێت و تاریك دەبێت، خۆرو مانگ کۆدەکرێنەوەو دەدرێن بە یەکدا.

---

(١) علم الفلك، لا ٣٢٢ .

(٢) سورة القيامة، ٦ ـ ٩ .

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بەوە دەکات کە چۆن هەسارەکان و مانگ  و خۆر سەرەتا یەك پارچە بوون جیابوونەوە، جارەکی تر بۆ دۆخی ڕابردوو دەگەڕێنەوە.

گەردونناسان دەڵێن: خۆر بۆ زەبەلاحی سور دەگۆڕێ، کە تا سنوری خولگەی زوهرە دەکشێ و ئەو کاتە ئۆقیانوسەکان لەسەر زەویدا دەکوڵێن، ئەمەش قسەی جۆرج گاموڤە کە لەسەر خۆر بڵاوی کردۆتەوە، داهاتوو زیاتر بەمە ئاشنا دەکەین، دیارە ئەو کاتە خۆر لە زەوی و مانگ نزیك دەبێتەوە، وەکو کۆبوونەوەیەك پێکەوە دەردەکەون و سنورەکان نامێنێت.

خۆری خۆمان بریتیە لە ئەستێرەیەك کە لە قۆناغی زنجیرەی سەرەکی ـ قۆناغی گەنجێتی ـ دایە، تێبینی ئەوە دەکرێت کە جێگری یەك لە تایبەتمەندیەکانیدا هەیە، چونکە هەرگیز نەبووە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە ڕوناکیەکی زۆری لە ڕادەبەدەرو ڕۆژێکی تر وەك ئەستێرەیەکی دووری درەوشاوە دەربکەوێت، ئەمەش یەکێکە لە بەخششەکانی پەروەردگار لەسەرمان کە خۆرەکەمان ئەستێرەیەکی جێگیرە لە ڕووی ناردنی ڕووناکی وزە، ئەمەش هۆکارەکانی ژیان و گەرمیمان بۆ دەرەخسێنێت کە پێداویستی بەردەوامی ژیانمانن، وە قۆناغی گەنجێتی درێژترین قۆناغە لە جیهانی ئەستێرەدا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خۆری خۆمان بە ویستی خوای پەروەردگار لەسەر ئەم حاڵەتە جێگیرو نەگۆڕەی دەمێنێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژی تەمەنی، دوای ئەوەش دەکرێتەوەو دەبێتە ئەستێرەیەکی زەبەلاح و هەسارە نزیکەکانی خۆی یەك لە دوای یەك هەڵدەلوشێت و قوتیان دەدات، ئەمەش واتای ئەم ئایەتەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ]. واتە: خۆرو مانگ کۆدەکرێنەوەو دەدرێن بەیەکدا[1].

زاناکانی گەردونناسی دەڵێن: ئەگەر بە هەر هۆیەکەوە بێت و ڕێك بکەوێت، تەنها یەك پرۆتۆنی موجەب (+) لەناو هەر گەردێکدا لەناو گەردووندا (−) هەرگیز ناتوانین پێشبینی ئەو وێرانکاری و کاول بوونەی گەردوون بکەین کە لە ماوەی چەند چرکەیەك کۆتایی بە هەموو شتێك دەهێنێ، لە ماددەو

---

(١) علم الفلك، لا ٢١٢ .

ئادەمیزادو ئاژەڵ و ڕووەك و ئاو و هەواو هەموو بوونەوەرێك لە گەردووندا، هەتاکو ئاسمانەکانیش نامێنن، خوای گەورە دەفەرمویٚ: [إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ۝١ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ۝٢ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ].[1]

واتە: کاتێك کە ئاسمان لەت بوو، دەمێك کە ئەستێرەکان کەوتنە خوارەوە بە پەرش و بڵاوی، ساتێك کە دەریاکان تێکەڵ کران.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویٚ: [إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ][2]. واتە: کاتێك کە ئاسمان لەت بوو، مل کەچی کرد بۆ پەروەردگاری و دەبیٚ واش بیٚ.

زاناکان دەڵێن: کۆتایی زەوی لە چرکەیەکدا یان کەمتر دەبێت و تەقینەوەو وێرانبوونی گەردوون دەست پیٚ دەکات لە ناو گەردەکان و زەوی و ئاسمانەکان، هەرچی لەناو تەنە گەردونیەکاندایە.

جا شەو بێت یان ڕۆژ بە فەرمانی پەروەردگار کۆتایی بەم گەردوونە دێت لەبەر ئەوەی زەوی بە هۆی سوڕانەوەکەی بە دەوری خۆیدا شەو و ڕۆژ پێك دەهێنیٚ، لەبەر ئەوە نیوەی ڕۆژەو نیوەی شەوە لە هەر کاتێکدا گەردوون کۆتایی هات.. ئەم زانستەش لەو کاتەدا بە وەحی هاتووە بۆ پێغەمبەرمان (محمد) کە خوێندەوار نەبووە.

زانا (ڤاستۆ ماڵڤن سلیڤەر) لە ساڵی (١٩١٣) دەریخست کە هەندێك لەو تەنانەی باوەڕ وابوو کە (تەمومژی گەردوونی (غبار کون)ن، بەخێرایی ١٨٨٠کم / چرکە لێمان دوور دەکەونەوە).

ئەم دۆزینەوەیەش بۆ زاناکان موفاجەیەکی گەورەبوو، چونکە ئەو تەنانە گەلە ئەستێرەی دوور لە ئێمە نەبێت، چی تر نەبوون[3].

---

(١) سورة الانفطار: ١ ـ ٣ .

(٢) سورة الانشقاق: ١ ـ ٢ .

(٣) علم الفلك، لا ٣٢٢ .

پاشان زانا (هابل) لە ساڵی ١٩٢٩ یاسا ناسراوەکەی ئاشکرا کرد کە دەڵێت: (گەلە ئەستێرەکان بە خێراییەك لێمان دوور دەکەونەوە کە ڕاستەوانەیە لەگەڵ دووریان لێمان).

دواتر دەرکەوت کە لە ڕاستیدا گەلەستێرەکان تەنها لە ئێمە دوورناکەونەوەو بەس، بەڵکو بەهەمان شێوە لەناو خۆشیاندا لێك دوور ئەکەونەوە.

کەواتە بونەوەر تا سەر نامێنێ و نەبونی دەبێت، وەکو نەبوونی بووە بە پێی دوا فەرهەنگی زانست - یاسای دووەمی- دینامیکای گەرمی، ئەم یاسایە دەڵێ: گەرما لە تەنێکی گەرمەوە دەڕوات بۆ تەنێکی سارد، تاکو لە گەرمیدا وەکو یەکیان لێ دێت، ئیتر لە پلەیەکی گەرمایی یەکساندا ڕادەوەستن تاکو دەست دەکەن بە ساردبوونەوە[1].

ئەگەر ئەم بونەوەرە هەر ببوایە، بەبێ سەرەتا ئێستا هەموو هێزێکی گەرما بەکاردەهێنراو، تاکو ئەمڕۆ ژیان نەدەما، دیسان مردنی ئادەمیزادو نەمانی شارستانیەتی و کۆتایی ئەستێرەکان و هەموو گیانلەبەرانی دیکە.

ئەو قیامەتە بچوکەی کە لە دەوروبەرماندا دەیبینین، هەر لە نەمانی ژیارەکان و مردنی خەڵك و کۆتایی ئەستێرەکان و مردنی ژیانلەبەرو ڕوەکەکان و کۆتایی هاتنی ساتە وەختەکان و ساڵەکان، دیمەنێکی تری قیامەتی گەورەیە، کە پێمان دەڵێ: هەر دەبێ ئەم بوونەوەرە کۆتایی پێ بێت.

هەروەها گەرمایی گەردوون کاری لەسەر لەناوچوونی بونەوەر هەیە، ئەگەر سەیری ئەم جیهانە بکەین، دەبینین فرەوانبوونی گەردوون هەتا هەتایە بەردەوام نابێت، بەڵکو ڕۆژێك دێت کە گەردوون لە فرەوانبوون دەوەستێت و گەشتی پێچەوانەی دەست پێ دەکات و بارستاییەکەی بچووك دەبێتەوە تا دەگاتە ئەو خاڵەی کە گەشتەکەی لەوێوە دەست پێکرد، ئەمەش دەرەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەیە کە ئەمڕۆ سەبارەت بە ئایندەی گەردوون ئەنجام دراون و

---

(١) علم الفلك، (لا ٣١١) .

دەرکەوتووە ئێستا گەردوون لەو خولەدایە کە یەکەم جار لە بارستاییەکی تا بڵێی قورسەوە دەستی پێکردووە.

لە کۆتایی سەدەی بیستەم زانایان تێبینی ماددەیەکی تاریکیان کرد، کە بەناو هەموو گەردوون و لە نێوان گەلەئەستێرەکانداو بەبڕێکی یەکجار گەورەو زۆر بڵاودەبێتەوە، زانایان قەبارەی ئەم ماددە تاریکەیان زۆر زیاتر لە قەبارەی گەردوونی بینراو خەمڵاند، کەواتە ئەو ماددەیەی قەبارەکەی نابینرێ زۆر گەورەترە لەو ماددەیەی کە دەبینین.

ئەم ماددە تاریکە هێزێکی کێشی چەندین ئەوەندەی هێزی کێشی گەردوونی بینراوی هەیە، جا لەسایەی ئەم ماددەیەدا بەشەکانی گەردوون ـ کە ئێستا لە فرەوانبووندان ـ ناتوانن پەرتەوازە ببن و دووربکەونەوە، هەروەك فرەوانبوونی گەردونیش هەتا ئەبەد بەردەوام نابێت، بەڵکو لە کاتێکی دیاریکراودا دەوەستێت و گەلەئەستێرەکان بەخێرایی و بە ئاراستەی پێچەوانەی جووڵەی ئێستایان بەرەو دواوە دەگەڕێنەوە، هەتا دەگەنەوە ئەو خاڵەی لەوێوە دەستیان بە جووڵەی فرەوانبوونیان کردووە.

بێجگە لەمانە ئێمە هەموو شتێك کۆتایی دەبینین: وەکو مردنی خەڵك و نەمانی شارستانیەکان، کۆتایی ئەستێرەکان و ژیانلەبەران و ڕووەکەکان و کۆتایی هاتنی کاتژمێرو ڕۆژو هەفتەو مانگ و ساڵ و تەمەن و هەموو شتێك - کەوابوو کۆتایی هاتن و کۆتایی گەردوونیش دەبێت.

(فرانك آللن) خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە دەڵێت: پێکهێنەرەکانی ئەم گەردوونە بەردەوام گەرماکەیان دەڕوات و کەم دەبێتەوە، تاکو کاتێك دێت هەمووی سارد دەبێتەوەو پلەی گەرمای دەگاتە (صفر المطلق) واتە: هیچ گەرمایی نامێنێ، بەم جۆرە ووزە نامێنێ و هیچ ژیانێکیش نامێنێ[1].

---

(١) الله يتجلى في عصر العلم، (لا ٨).

لەبەر ئەوە بۆمان دەردەکەوێ هەموو شتێك کە دروست بووە، لە گەردووندا سەرەتای هەیەو کۆتاییشی هەیە.

زانای بەناو بانگ (بلیڤن) دەڵێ: بەشە دوورەکانی گەردوون لە بۆشایی ئاسماندا بە خێراییەك دەڕۆن، زۆر زۆر ترسناکە.

ئەم زانایە دەڵێت: گەردوون بە هەموو ئەستێرەو تەنە گەردوونیەکانەوە کە لە ژماردن نایەن، هەموویان زۆر بە خێرایی دەڕۆن هەروەکو (بۆمبێکی تەقیو) وایە، پارچەکانی بڵاودەبنەوە بە خێراییەکی زۆر زۆر کە هەرگیز ئادەمیزاد ناتوانێ بە بیری دابێت.

گۆڤاری (لوك)ی ئەمریکی باس لەوە دەکات کە گەردونناسان لەسەر ئەوە کۆکن کە لەناوچوون لەسەر زەوی و مانگ و سیستەمی گەردوونی مانگی و زەمینی نووسراوە، بەڵکو تا خۆریش بە تاك تاکی.. ئەم خۆرەی سەر ڕووی زەوی تا نزیکەی (٥) ملیار ساڵی تر گۆڕانی بەسەردا نایەت، پاشان دەست بە فرەوان بوون و کشان دەکات، یان بۆ زەبەلاحی سوور یان بۆ ئەسمەرو ڕەنگی گەنمی دەگۆڕێ، گەر بۆ زەبەلاحی سوور بگۆڕێ ئەوەندە فرەوان دەبێ وای لێدێت نیوە تیرەکەی (٢٠-٣٠) هێندە گەورە بێت، ئەو گەورەبونە تەواوی زەریاکان و چەم و ڕووبارو دەریاچەکانمان دەکوڵێنێ و زەوی وشك دەکات و ئاسەواری ژیانی تێدا نامێنێ، بەڵام ئەگەر بۆ زەبەلاحی ئەسمەر بگۆڕێ نیوە تیرەکەی (٢٠٠-٣٠٠) هێندەی ئێستا فرەوان دەبێ ئەو کاتە خۆرو مانگ و زەوی ڕادەماڵێ و کەرەستەکانیان دەکات بە هەڵم و لەگەڵ کەرەستەی خۆر تێکەڵا دەبن، بەڵکو کۆتایی ژیان لە زەویدا خێرا دەبێ و داخکەرێکی سەخت دەبێ هەتا ئەگەر خۆر لە کشانیدا بۆ دوورتر لە زوهرە نەڕوات[1].

(فلاماریون) دەڵێت: دەرکەوتنی ژیان بە شکۆی خۆیەوە لە ئاکامی بە شوێندا هاتنی سیستەمی خۆرەوە بووە، بە دوای هێزی کێشکردنی گشتی و هێزی

---

(١) الطبيعة في القرآن الكريم، د. كاصد ياسر الزيدي، ل٤١١-٤١٢، بغداد، ١٩٨٠ م، وە گۆڤاری (رسالة الإسلام) العدد الأول السنة الأولى ١٣٨٥ هـ، ١٩٦٦ م بغداد ص (٤١-٤٢ ) دا باسکراوە.

ناوەندی پاڵنەردا، چونکە هێزی کێشکردنی گشتی هەموو بەشەکانی جیهان لە گەردیلەوە تا ئەستێرەکان بە یەکتریانەوە دەبەستێتەوە، بەڵام هێزی ناوەندی پاڵنەرە جوڵەکانی ڕێك دەخات، هەر ئەویش لە تەواوی جیهاندا سیستەمێکی گشتی بڵاودەکاتەوە، بەڵام وردە وردە بڵاودەبێتەوەو ئایندە هەسارەکان ڕێگای کۆتایی دەگرنە بەرو ئایندەی ئەستێرەکان وەکو دەنکە تەسبیح پەتیان پساوەو دەپچڕێن.

(جۆرج گامۆف) دەڵێت: تیشك لە خۆردا وردە وردە زیاد دەکات، کاتێ هایدرۆجین لە خۆردا لە کەمیدایەو وزەی خۆر سەد ئەوەندە پتر دەبێ، لێرە بۆمان دەردەکەوێ کە تاووتوێکردنی بابەتی بەرهەم هێنانی وزە لە خۆردا، بە ئاکامێکمان دەگەیەنێت، کە بە تەواوی لەوە جیایە کە لە تیۆری کلاسیکی ڕەسمیدا هەیە[1].

خۆر بە هۆی تەقینەوەیەك بوونی ناوکی (الإندماج النووي) لە یەك چرکەدا (٦٧٤) ملیۆن هایدرۆجینی بۆ (٦٧٠) ملیۆن تەنی هیلۆم دەگۆڕێ، واتە: لە هەر چرکەیەکدا (٤) ملیۆن تەنی لە ماددەی بنەڕەتی کەم دەبێتەوە[2].

کەواتە ڕۆژێ دێ خۆر سوتەمەنی ناوی بەتاڵ ببێ و بکوژێتەوەو ڕووناکی لە دەست بدات و ئەستێرەکانی تریش هەمان ڕێگا بگرنە بەر.

بە پێی توێژینەوەکانی تیۆری گەشەکردنی ئەستێرەیی دەبێت خۆر بە حەوت قۆناغدا گوزەرە بکات:

١- خۆر لە هەوری پلازما دروست بووە، کە چڕ بۆتەوەو خۆرو هەسارەکانی پێکهێناوەو ئەو بڕە ماددەیەی خۆری لێ پێکدێ بارستاییەکەی تەواوی هەبووە بۆ ئەوە کە خۆر لەو قۆناغە یەك بە دوای یەکە.

٢- ڕەنگە کرداری یەك بوونی ناوکی (٨) ملیار ساڵ بەردەوامی هەبێت.

٣- خۆر بەردەوام لە کشاندایە، چونکە فشاری ناو جەرگەی زۆرە.

---

(١) أصول العقائد في الإسلام، مجتبي موسوي اللاري، تعريب محمد عبدالمنعم الخاقاني، (٣/١١٠-١١١).

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەشی یەکەم

٤- خۆر دەگۆڕێ بە زەبەلاحە سورەکان و ڕووناکی سەر ڕووی کەم دەبێتەوە.

٥- چەند هەزار ساڵە ڕووناکی بە شێوەی پرتە (النبضات) دەنێرێت.

٦- پاشان خۆر خۆی گرِدەدات و خۆی دەتەقێنێتەوە.

٧- پاشماوەی خۆر دەچێتە ناو یەك و بەسەر یەکدا کەڵەکە دەبێ و دەگۆڕێ بە قەزەمە سپیەکان (الأقزام البيضاء) و قەبارەی بە قەد قەبارەی زەوی لێدێت[1].

بەو پێیە گەردوون تەمەنێکی دیاری کراوی هەیە، کە تیایدا دروست بووەو تەمەنێکی دیاری کراوی هەیە بۆ کۆتایی و لەناوچوون؟

بەڵام کەی؟

ئەوە تەنیا خودا کاتە دیاری کراوەکەی دەزانێت، ئەو کاتە بوونەوەر ڕووداوی گەورەی بەسەر دێ، کە قەت بە خۆیەوەی نەبینیوە، مەگەر ئەو ڕۆژەی تیایدا دروست بووە، ئەو کاتە سەرجەم ئەستێرەکان دەکوژێنەوە، زەوی بومەلەرزەو تەقینەوەی بەسەر دادێ، بەو کارەساتە سامناکە چارەنووسی گەردوون بەرەو لەناو چوون دەچێت، ئەو کاتە جیهان لە قۆناغی ماددیەوە بەرەو قۆناغی میتافیزیکی دەڕوات کە مرۆڤەکان گیاندارانی تێدا زیندوو دەبنەوە.

زانای ئینگلیزی (ڕیك) دەڵێت: جیهان بەر لە (١٠-١٥) ملیار ساڵ بە تەقینەوەیەکی گەورە دروست بووە، کەوا نیوەی وزەکەی بۆ پاڵنانی ئەستێرەکان لە دەست داوە، نیوەکەی تری مەجەرە کۆی دەکاتەوەو بۆ تەقینەوەی کۆتایی هەڵیدەگرێت.

ئەم کارەساتە گەورەیەش پێی دەوترێت (القيامة) یان (اليوم الآخر) واتە: ڕۆژی دوایی.

---

(١) علم الفلك، لا ٢٧٦.

ئەم کارەساتە گەورەیە زۆر واتای تری لە قورئاندا بۆ هاتووە، وەکو (القارعة، الزلزلة، الحاقة، يوم الغاشية، الحشر، التكوير، الإنفطار، الإنشقاق، الدخان، الواقعة، النبأ...هتد).

لەم ڕۆژەدا جیهان دەگۆڕیٚ و مرۆڤەکان و ژیانداران لە بوونەوەردا زیندوو دەبنەوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، بە پێی کارو کردەوەی چاك و خراپیان بەرەو جیهانی بەهەشت و جیهانی دۆزەخ دەبردرێن، کە جیهانی هەمیشەیی و نەمرییە کە لە زاراوەی زانستی نویٚ بە جیهانی میتافیزیکی ناسراون.

بە پێی بیردۆزێکی تر بەهۆی هێزی ڕاکێشانەوە سەردەمێك دێت، کە بڵاوبوونەوەو کشانی کاکێشانەکان ڕادەوەستیٚ و دەست دەکەن بە هاتنەوە یەك، لەم حاڵەتەدا گەردوون کشان و هاتنەوەیەکی هاوسەنگە.. وە زۆر ئەستەمە عەقڵی مرۆڤ وێنەی ڕاستەقینەی قەبارەی گەردوون لە مێشکی خۆیدا بکێشێت، چونکە ئێمە قەبارەی نازانین.. ئەگەر لە گۆی زەویەوە دەست پیٚ بکەین و لێی بچینە دەرەوە، ئەو کاتە سەختی و ئاستەمی زانینی قەبارەی گەردونمان بۆ دەردەکەوێت.

زەوی بەشێکە لە سیستەمی کۆمەڵەی خۆر، بەڵام بەشێکی زۆر بچوك کۆمەڵەی خۆر پێك هاتووە لە خۆرو ئەو هەسارانەی بە دەوریدا دەسوڕێنەوە، لەگەڵ ئەستێرەو پرشە ئاگرەکانیشدا (نەیازیك).

ئەم کۆمەڵەی خۆرە بەشێکی زۆر بچوکە لەو سیستەمەی کە پێی دەڵێن: ڕاکێشکە کە لە ملیۆنەها ئەستێرە پێکهاتووە، ڕەنگە سەدان هەزاریان لەم خۆرەی خۆمان گەورەترین یان سیستەمێکی خۆری تایبەت بە خۆیانیان هەبێت.

ئەو ئەستێرانەی کە لە ڕاکێشکەی خۆماندا دەبینین، پێی دەڵێن: ڕێی کاکێشان هەموویان خۆرن و هەمووشیان زۆر زۆر لێمانەوە دوورن و تەنانەت نێوانیشیان بەساڵی تیشکی پێوانە دەکرێت نەك بە میل[1].

---

(١) الله يتجلى في عصر العلم، (لا ٣٨).

بەرگی یەکەم

## بۆچی باس لە نیشانەكانی كۆتایی بونەوەر دەكەین؟

هەموو مەسەلەیەك كە مرۆڤ باسی دەكات و لێی ورد دەبێتەوە، بێگومان بەروبووم و دەرەنجامێكی لیٚ دەدورێتەوە.

جا ئایا توێژینەوەی دەربارەی نیشانەكانی كۆتایی بونەوەر و ناسینیان بەروبوومێكی هەیە هەستی پیٚ بكەین لە ژیانماندا؟

لە وەڵامدا: باسی نیشانەكانی كۆتایی بونەوەر لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، وە سوودی زۆریشی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا.

بە درێژایی مێژوو خەڵكانێك پێیان وا بووە، ئەو جیهانەی كە تیایدا دەژین، بۆ هەتا هەتایی دەمێنێتەوەو كۆتایی نیە، بڕبڕەی پشتی ئەم هەڵەیەش دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفە ماددیەكان و بیروباوەڕە دەستكردو ئەفسانەكانی سۆمەریەكانی عێراق، گەورەترین هۆكاری ئەم تێڕوانینە نادروستانە ئەوە بوو، كە زۆرینەی خەڵكی بیٚ ئاگابوون لە ڕاستیە ئایینە ئاسمانیەكان، تا ئەوان هەڵیان بژێرن یان پشت گوێیان بخەن، هەروەها فەلسەفە ماددیەكانی یۆنانیش بنەڕەت و بناغەی دروست بوونی ئایینە كۆنەكانی سۆمەری و میسری بوونە، ئەم ئایینانەش لە پەرستنی چەند خودایەكی وەسفی پێك دەهات، گرنگترین هۆكارەكانی ئەم بیركردنەوە پوچە نەزانین و نەفامی خەڵكی بوو سەبارەت بە ئایینە ئاسمانیەكان، یان بە شێوەیەكی تر بڵێین خۆ لادان بوو لە ئایینە ئاسمانیە ڕاست و دروستەكان، هۆكاری ئەم نەزانین و نەفامیەی ئەو كاتیش ئەوە بوو، ئەو سەردەم زانست و زانیاری ئەوەندە زۆرو بەس نەبوو تاوەكو خۆیان بپارێزن لەو هەڵە گەورانەی كە تێی دەكەوتن، بەڵام ئەمرۆ لە ڕێی زانستەوە زۆر بە ڕوونی دەركەوتووە، كە ئەم بوونەوەرەی تیایدا دەژین چۆن سەرەتای هەبووە ئاواش كۆتایی هەیەو لە

ئایندەیەکی نزیکیشدا کۆتایی بەم بونەوەرە دێت، ئەم ڕاستیە گەورەیەش زۆر بە ڕوونی لە قورئان باسی لێوە کراوە، ئەم قورئانەی کە زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ پێش ئێستا بۆ پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) لەلایان خوای گەورەوە دابەزیوە، هەر دەبێ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم دونیایە کۆتایی پێ بێت و ڕۆژی دواییش دابێت ئەمەش هیچ گومانێکی تێدا نیە.

خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: [وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي ٱلْقُبُورِ ۝٧ ][1].

واتە: بێگومان ڕۆژی دوایی بەرپا دەبێت، ئەمەش هیچ گومانی تێدا نیە، خوای پەروەردگاریش لە گۆڕەکان زیندومان دەکاتەوە.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویێ: [وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ۝٨٥].

ئەم یاسا تۆکمانەی ملیۆنەها ساڵە بەڕێکی ئیش دەکات کاری دەستی گەورەیەکە هەموو شتێکی هێناوەتە بوون و لە کاتی بەدیهێنانیدا فەرمانی پێداون.

بەڵێ ... خوای گەورەو باڵا دەست دروست کاری ئەم سیستەمە گەورەی بوونەوەرە، ملیۆنەها ساڵ لەمەوبەر ئەم گەردوونەی بەدیهێناوە، بەبێ ئەوەی هیچ کەم و کوڕی و گرفتێکی تێدا بێت، ئەم سیستەمەش ڕۆژێك دادێت بە فەرمانی خوای پەروەردگار دەوەستێت و لەکار دەکەوێت، لە ڕۆژێکدا کە بە خۆی کاتەکەی دیاری کردووە، هەرچیەکیش لەم بوونەوەرەدا هەبێ لە گیانلەبەرو بێ گیان، گەورەو بچوك، دەبێ لەناو بچێت، سەرەڕای ئەوەی قورئان باسی هاتنی ڕووداو و قۆناغەکانی ڕۆژی دواییمان بۆ دەکات، وەکو دەفەرمویێ: [إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ۝١ ][2]. واتە: کاتێ ئاسمان کەرت بوو.

---

(١) سورة الحج، الآية: (٧).

(٢) سورة الإنفطار، الآية: (١).

بەڕگی یەکەم

[وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ۝٣]. واتە: کاتێ چیایەکان پەرت و بڵاوبوونەوە.

[وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ۝١][(١)]. واتە: سوێند بە ئەستێرەکانی ئاوابوو.

[فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ ۝٨][(٢)]. واتە: کاتێ ئەستێرەکان شوێنەواریان نەما.

[إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١][(٣)]. واتە: کاتێ ڕۆژ پێچرایەوە.

[إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١][(٤)]. واتە: کاتێك ئاسمان کەرت بوو.

[يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ۝١][(٥)].

[إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١][(٦)].

[هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١][(٧)].

قورئان بەم ئایەتانەو هاوچەشنیان لە سەرەتای نزیکەی چل سورەتدا دەیچەسپێنێت، کە حەشر شتێکی بێ گومانەو ڕووداوێکی گەردوونیە، ڕوودانیشی گەلێ پێویستە، بە ئایەتەکانی تریشی بە چەندین بەڵگەی جۆراو جۆر جەخت لەسەر ئەم ڕاستیە دەکاتەوە.

ئەو ئایەتانە هەموو باس لەو هەموو گۆڕانکاریانە دەکەن کە بەسەر ئەستێرەکاندا دێت، لە نەمانی ڕووناکی و شوێنەواریان و کوژانەوەیان، پەرش بوونەوەو لە دەست دانی بارستایی لە ئاسماندا.

---

(١) سورة النجم، الآية: (١).

(٢) سورة المرسلات، الآية: (٨).

(٣) سورة التكوير، الآية: (١).

(٤) سورة الإنشقاق، الآية: (١).

(٥) سورة الحج، الآية: (١).

(٦) سورة الزلزلة، الآية: (١).

(٧) سورة الغاشية، الآية: (١).

بێگومان ڕۆژی دوایی کارەسات و ڕووداوێکی وەها گەورەیە مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوو ڕووداوی لەم جۆرەی نەدیوە، ئەو چارەنوسە حەتمیەی کە بوونەوەرەکان چاوەڕێی دەکەن، چەندین جار لەسەر یەك لە قورئان باسی لێوەکراوە، بۆیە هەر لە دێرین زەمانەوە مرۆڤ هەوڵی داوە دەربارەی ئەو ڕۆژە زانیاری لە پێغەمبەرانی سەردەمەکانیان وەربگرن، بەڵام خوای گەورە کات و سات و هاتنی ڕۆژیی دوایی لە خەڵکی شاردۆتەوەو نادیاری کردووە، تەنها نیشانەو هێماکانی هاتنی ئەو ڕۆژەی بە پێغەمبەر(ﷺ) ڕاگەیاندووەو بۆی باس کردووە.

پێغەمبەریش (ﷺ) لە چەند فەرموودەیەکدا باسی هاتنی ڕۆژی دوایی بۆ کردووین، خوای گەورەش بە پێغەمبەری (ﷺ) ڕاگەیاندووە کە هاتنی نیشانەکان و بەڵگەکان واتە: نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژیی دوایی.

خوای گەورە لەگەڵ شاردنەوەی بەرپابوونی هاتنی ڕۆژی دوایی چەند ڕووداوێکی گرنگی بۆ پێغەمبەرمان موحەمەد(ﷺ) ئاشکرا کردووە، کە ئاماژەن بۆ نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

سەرجەمی هەموو ئەو موعجیزانە بەڵگەن لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ)، هەروەها گشت بەڵگەکانی تری پێغەمبەرێتی و ڕاستگۆیی ئەو، هەموویان پێکەوە شایەتی لەسەر ڕاستی حەشر دەدەن چونکە بانگەوازەکەی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە(ﷺ) بە درێژایی ژیانی پاش مەسەلەی «تەوحید» ئاراستەی مەسەلەی «حەشر» کراوە، هەموو ئەو بەڵگەو موعجیزانەی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە(ﷺ) کە دەبنە بەڵگەی ڕاستی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) ئەوەندە بەهێزن کەخەڵکی بۆ تەسیدیقیان هان دەدەن، هەموویان شایەتی لەسەر هەمان ڕاستی دەدەن کە بریتی یە لە«حەشر».

باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی پایەکە لە پایەکانی بیروباوەڕ، بەهیچ جۆرێك لە گرێ کوێرەی مەسایلی نادیاردا نازین و لەجیهانی خەیاڵدا سەرگەردان نین، چونکە ئاینی ئیسلام هەموو شتێکی بۆ ڕوونکردوینەتەوە .

بەرگی یەکەم

باوەڕ بەڕۆژی دوایی پایەکە لە پایە گەورەو گرنگەکانی ئیسلام، لە ڕووی پایەخەوە دووەمین پایەیە، بۆیە لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویستە باوەڕی بەو ڕۆژە هەبێت، بەبێ ئەمەش بیروباوەڕ دانامەزرێ، لە زۆر شوێنی قورئاندا لە دوای باوەڕ بە خوای پەروەردگار هاتووە، هەروەك لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ][١].

واتە: چاکەو چاکە کاری هەر ئەوە نیە ئێوە ڕوو لە خۆر هەڵات بکەن یان خۆر ئاوا، ئەگەر لە ڕووی گوێڕایەڵیەوە نەبێ بۆ فەرمانی خوا، بەڵکو چاکەی ڕاست و دروست ئەوەیە کە باوەڕی ڕاستەقینەت هەبێ بە خواو بە ڕۆژی دوایی، بە فریشتەو بە پەرتوکی ئاسمانی و بە پەیامبەرانی خوا، وە لەو ماڵ و دارییەش هەر چەند خۆشەویستیش بێ لایان بەشێکی بدەنە خزمەکانیان و دەستیان لێ نەنوقێنن و بێ بەشیان نەکەن و بەشی بدەن بە منداڵانی هەتیو، خەلکانی بێ نەواو ڕێبوار، وە سواڵ کەران و ئەوانەی کەوا بەندەو دیلن، وە نوێژی تێرو تەواو ئەنجام بدات و زەکاتی ماڵی خوا بدات، ئەوانەی کە پابەندی بەڵێنن دەیبەنە سەر، ئەوانە خۆگرو خۆ ڕاگرن بۆ زاڵ بوون بەسەر تەنگانەدا، هەروەها لە کاتی شەڕکردن لە پێناو ئاییندا خۆڕاگرو چاو نەترسن و هەرکەسێ ئەم ڕەوشتانەی تیابوو ئەوا خواناسی ڕاستەقینەیە.

خوێنەری سەنگین لەم ئایەتە پیرۆزەدا بۆمان دەردەکەوێت کە باوەڕ هێنان بە ڕۆژیی دوایی یەکێکە لە ڕەوشتی پیاوی ڕاستگۆو ڕاستەقینەو لە خوا ترس.

---

(١) سورة البقرة ، الآية : (١٧٧) .

لەم ئایەتە پیرۆزەدا بۆمان دەردەکەوێت کە چاکەو چاکە کاری ئەوەیە دەبێ باوەڕمان بە رۆژیی دوایی هەبێت.

پێشەوا قەتادە(ﷺ) دەڵێت: ڕۆژێکیان پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چاکە چیە؟ خودای پەروەردگاریش ئایەتی [لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ...][1] نارده خوارەوە.

پێشەوا ڕەبیع و قەتادە (ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ) دەفەرموون: ئەم ئایەتە گفتوگۆیە لە نێوان جوولەکەکان و گاورەکان، چونکە لە ڕووی ڕووگەوە جیاواز بوون، لەبەر ئەوەی جوولەکەکان ڕوویان لە ڕۆژئاوا دەکردو گاورەکانیش ڕوویان لە ڕۆژهەڵات دەکرد[2].

هەرکەسێك باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێت، ناگونجێت باوەڕی بەخوا هەبێت، چونکە بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی بەرهەمی بڕوابوونە بە خوا، بێگومان ئەو کەسەی باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نیە، کردەوەی چاك ئەنجام نادات، چونکە بە هیوای پاداشتی ئەو ڕۆژە نیە لە تۆڵەو ئەشکەنجەو ئازار ناترسیٚ، وەك ئەو کەسانە دەبێت کە خوای پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرمویٚ: [وَقَالُواْ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾][3].

واتە: خوانەناسان دەیانگوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دونیایە، دەمرین و دەژین بەنۆرە، هەر ڕۆژگارو زەمانە کاریگەرن تێمانداو دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانست و زانیاریەك ئەوە بڵێن، بەڵکو تەنها پشت بە گومان و دوو دڵی دەبەستن.

پێشەوا ئیبنو کەسیر(ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) خاوەنی (تفسير القرآن العظيم) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ئەمە وتەی هاوەڵ بۆ خوا دانەرانی عەرەب بوو،

---

(١) سورة البقرة ، الآية : (١٧٧) .

(٢) تفسير القرطبي، لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي، (١/ ٦٢٨).

(٣) سورة الجاثية، الآية: (٢٤).

بەرگی یەکەم

کە نکوڵیان لە زیندووبوونەوە دەکردو دەیانگوت: ژیان هەر ژیانی ئەم دونیایەیە، کۆمەڵێك دەمرن و کۆمەڵێك دەژین، ئیتر نەزیندووبوونەوە هەیە نە ڕۆژی دوایی.

ئەو کەسانەی باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نیە ئەوانە کەسانی گومڕاو سەر لێشێواون خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ: [يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾][1].

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەردەوام و دامەزراوبن لەسەر باوەڕ بەخواو بە پێغەمبەرەکەی و بەو قورئانەی دایبەزاندووە بۆ پێغەمبەرەکەی، بەو کتێبانەش کە پێشتر ڕەوانەی کردوون، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بەخواو بە فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی ئەوە بەڕاستی گومڕابووە بە ئەو پەڕی گومڕایی.

یەکێ لە بنچینەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی و یەکێ لە پایەکان و کۆڵەگەکانی باوەڕ ئەوەیە، کە بڕوایەکی پتەومان هەبێت بەوەی کە خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا گشت دروست کراوەکانی زیندوو دەکاتەوە دوای مردنیان و گشت ئەندامێکیان کۆدەکاتەوە دوای بڵاوبوونەوەیان و گیانیان بۆ دەگەڕێنێتەوە دوای گیان لێدەرچوونیان، وە پێشتر لە دونیا چۆن بووە ئاوایان لێدەکاتەوە.

بە ڕاستی ئەو سورەتانەی قورئان کە لە مەککەی پیرۆز دابەزیون، لە ماوەی (١٣) ساڵدا، لە زۆربەی هەرە زۆریاندا بانگەوازە بۆ بڕوا بوون بە خوای تاك و تەنهاو ڕۆژی دوایی و ڕەوشتی جوان و بەرز، لەبەر ئەوەی بڕوابوون بە زیندووبونەوەی دوای مردن و لێپرسینەوەی دوای مردن، لە پاشان تۆڵە سەندنەوە بە یەکێ لە هۆکارەکان دادەنرێ، لە دامەزرانی شکۆمەندی و بڕوا تەواوی مرۆڤ، کە ئەوەش بەشێکە دابەش نابێت لە ژیانی موسڵماندا، لەسەر ئەم زەویەدا بەر لە گەیشتن بۆ بەزەیی فرەوانی خوای گەورە.

---

(١) سورة النساء، الآية: (١٣٦).

**ئایە هیچ جیاوازیەك هەیە لە نێوان ژیانی بڕوادارو ئامانجەکانی، ژیانی بێ باوەڕو ئامانجەکانی؟**

بەڵێ جیاوازی هەیە لەم چوار خاڵانەی خوارەوە:

١) بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی، پێویستە بۆ هەست کردنی تەواو بەوەی کە لە دوای ئەم ژیانەدا حیکمەتێك هەیە، ئەو [illegible] کەوا پەیامەکانی خوا بانگەوازی بۆ دەکەن، ئەوە مەبەستی ژیانە، لەلایەکی ترەوە دەبیٚ مرۆڤ بگات بە پاداشت یان سزای خۆی هەر چەندە لەم ژیانەش پێی نەگات، بەڵام لە ڕۆژی دوایی بۆی مسۆگەر دەبێت، باوەڕ نەبوونی ئەوانەی بێباوەڕن بە ڕۆژی دوایی لە نەبوونی زانیاریان پەیدا بووە، بە حیکمەتی خواو ئەندازە دانەریەکەی، چونکە حیکمەتی خوای گەورە ئەوە دەخوازیٚ، کەوا خەڵك نابیٚ ئاوا بیٚ هیچ مەبەست و مانایەك دروست بکریٚ و بژیت.

٢) بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی، بڕوا بوونە بە دادپەروەری ڕەهای خوای گەورە، چونکە حیسابی کۆتایی بۆ کردەوەکان لەم دونیایەدا نیە، بۆیە پاداشتی کۆتایی و یەکلاکەرەوە لە ڕۆژی دواییە، جا دادپەروەری ڕەها لە نێو ئەم لێپرسینەوە دەستەبەر دەبیٚ، بۆیە هیچ دڵە ڕاوکێی ناویٚ گەر مرۆڤ نەگەیشت بە پاداشت یان سزا لەم ژیانە کورتەی دونیادا، بەڵکو کاتیٚ ڕۆژی دوایی هات، خوای گەورە بە تەرازووی ڕاست و دادپەروەرانە پاداشتی دەداتەوە، جا دادپەروەرانەکەی هیچ گومانی تێدا نیە، کە دەبێت بێتە دی و خوای گەورەش ستەم لە بەندەکانی ناکات، جا با گوناهباران و تاوانکاران دڵخۆش نەبن گەر لەم دونیایە سزای خوایان پیٚ نەگەیشت، چونکە سزای ڕۆژی دوایی زۆر سەخت و ناخۆشە.

٣) باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی، یەکێکە لە پێویستیەکانی باوەڕ بوون بە خواو بەرەو خوا چوون، چونکە هیچ پەناو پشتێك نیە بتپارێزیٚ لە خوا تەنها ئەو نەبیٚ، وە هیچ کەس ناتوانیٚ خۆی ڕزگار بکات لە سزاکەی، تەنها بەزەیی ئەو نەبیٚ، جا بڕوادار ئەم پەناگیریەی بە خوای گەورە هاندەرە بۆی لە ناخۆشیەکانی ژیاندا، چونکە بەو هۆیەوە بۆی ئاسان دەبیٚ لەبەر ئەوەی بەردەوام

دڵی بەخوا ئارامە و دڵنیایە كەوا گشت كارێكی خوای گەورە بۆ ئەو خێری تێدایە، جا ئەگەر شادی و خۆشی بەشی بوو سوپاسی خوای لەسەر كرد، ئەوە بەخێر بۆی دەگەڕێتەوە، ئەگەر خراپەو دڵتەنگی و ناخۆشی بۆ هات، ئارامی لەسەر گرت ئەوە بەخێر بۆی دەگەڕێتەوە.

٤) بڕوابوون بەڕۆژی دوایی، واتە: بڕوابوون بە ڕێزگرتنی خوای گەورە بۆ مرۆڤ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە ژیان كۆتایی پێ نەهاتووە، هەروەكو ژیانی گیانلەبەران و زیندەوەران بە گوێرەی بڕوای باوەڕ نەبوونی بە ڕۆژی لێپرسینەوە، بەڵكو بڕوادار وادەبینێ كە لە ڕۆژی دواییدا، لە دوای ئەم ژیانە كورتە مانەوەیەكی بێ مردن هەیە، كە كەس ماوەی نازانێ تەنها (الله) دەیزانێ، جا هەر لە ڕوانگەی ئەم بڕوایەدا جیاوازی دروست دەبێ لەسەر هەڵسوكەوت و ڕەوشت.

بێگومان بڕوای بڕوادار بە لێپرسینەوەو هەڵدانەوەی دەفتەری كردەوەكانی لەبەردەم پەروەردگاردا دووری دەخاتەوە لە ڕووپامایی بە كردەوەكانی، لەبەر ئەوەی هاوبەشی خەڵك لە نیەت و مەبەستدا كردەوەكانی پوچەڵ دەكاتەوە، هەرچەندە زۆریش بن، بۆیە دڵسۆزی و نهێنی وەرگیرانی كردەوەكانە.

موسڵمانان ئەمڕۆ زۆرن بەڵام ئەوانەی بڕوایەكی بێ گرێیان بە ڕۆژی دوایی هەیە ژمارەیان كەمە، كەمێكیش لەوان هەیە كە دەترسێ لەم ڕۆژەداو كردەوەكانی بۆ ئەم ڕۆژە پاك و بێگەرد ڕادەگرێ، لەبەر ئەوەیە هەر بازرگانێ كە بترسێ لە ڕۆژی لێپرسینەوە هەرگیز فێڵ ناكات.

دیاردەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی و ژیانێكی نوێ پاش مردن لە دوا ڕۆژ لەناو كۆمەڵگەی ئەمریكی بە هەموو ڕێڕەو (مەزهەب) و بیر و باوەڕەكانەوە بەرەو زیادكردن دەچن، تەنانەت لەلای ئەو كەسانەی باوەڕیان بە ئایینە ئاسمانیەكان نیە.

ئەو لێكۆڵینەوە كۆمەڵایەتیانەی كە مەڵبەندی لێكۆڵینەوە ئایینەكان لە واشتنتۆن بڵاوی دەكاتەوە.. ڕایگەیاندوە كەوا ئەو كەسانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هەیە ڕێژەكەیان لە (٧٧٪) وە بەرزبوەتەوە بۆ (٨١٪).

بەرگی یەكەم

هەروەها ئەو سەرژمێری و ژمارە نوێیانە کە مەڵبەندی ناوبراو لە ساڵی (١٩٩٧)دا دەست نیشانی کردووە، بە تایبەت لە ساڵی (١٩٩٠ ـ ١٩٩٤) بەم شێوەیە لە (٨٤٪) پرۆتستانت و[1] لە (٨١٪) ی کاثۆلیك و لە (٤٨٪)ی جولەکەکانن کەوا باوەڕیان بە ڕۆژی زیندووبوونەوە هەیە[2].

خوای گەورە لە قورئاندا ئاماژە بەوە دەکات کە ڕۆژی دوایی دێتە دی، بۆیە ئەرکی سەر شانی هەموو باوەڕدارێکە کە بڕوای بە ڕۆژی دوایی هەبێ، چونکە بڕوا هێنان بە ڕۆژی دوایی، هەروەکو لەڕابردودا ئاماژەمان پێکرد یەکێکە لە بنەڕەتەکانی باوەڕ، ئەگەر بڕوامان نەبوو بە ڕۆژی دوایی ئەوا یەکسەر لە ئاینی ئیسلام دەردەچین، چونکە بەبێ باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی باوەڕمان تەواو نابێت.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: [ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ مِنۡهُمۡ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَۚ وَٱلۡمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَۚ وَٱلۡمُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤۡتِيهِمۡ أَجۡرًا عَظِيمًا ١٦٢ ].

واتە: ئەوانەی کەوا شارەزایی ئایینن خەڵکە بڕوادارەکان بڕوایان بەو کتێبە هەیە، کە بۆ تۆ نێردراوەتە خوارەوە، وە باوەڕیشیان بەوە هەیە کەوا بۆ پێش تۆ نێردراوەتە خوارەوە، بە تایبەت ئەوانەی کە نوێژەکانیان بە تەواوی جێبەجێ دەکەن، هەروەها ئەوانەی کە زەکاتی ماڵەکانیان دەدەن و ئەوانەی کە باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە، بێگومان ئەوانە پاداشتێکی گەورەو گرنگیان پێ دەبەخشین.

لەم ئایەتە قورئانیانە بۆمان دەردەکەوێت، ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هەیە ئەوا خوای گەورە بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون، ئەوەی باوەڕی

---

(١) (بروتستانت): کۆمەڵێکی نەسرانین، بە ناوی ئینجیل و ژێرییەوە نارەزاییان دەربڕی لەسەر کەنیسەی ڕۆژئاوا، ڕەخنە دەگرن لە هەموو شتێك پێچەوانەی کتێبەکەیان و ڕزگاربوونی خۆیان بێت، ناویشیان دەبرێت بە ئینجیلیەکان، چونکە تەنها شوێن ئینجیل دەکەون و بەس، وەجیاوازییان نیە لەسەرجەم کەنیسەکانی تر.. جا لە بیروباوەڕی سێ خواییدا بێ یان بیروباوەڕی لە خاچ دان و بە پیرۆز ڕاگرتنی خاچدا، هەروەها (مارتن لۆسەر) دامەزرێنەری بووە.

(٢) گۆڤاری الطاهرة، ژمارە: (٩٤).

بە ڕۆژی دوایی نەبێ ئەوە خوا دووری دەخاتەوە لە بەهەشتی پان و بەرین و دەیباتە نێو دۆزەخ.

پێشەوا ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموێ: ئەم ئایەتە لەسەر ئەو کەسانە هاتە خوارەوە کە شارەزاییان هەبوو لە تەورات و ئینجیل وەکو (عبداللەی کوڕی سەلام) و (ثعلبهی کوری سەعیە) و (زەیدی کوری سەعیە) و (ئەسەدی کوری عوبەید) ئەم چوار کەسە باوەڕیان بە پێغەمبەر(ﷺ) هێنا، چونکە زانیان پێغەمبەر(ﷺ) یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی کە خوای گەورە ناردویەتی بە پێی ئەم نیشانانەی کەوا لە تەورات و ئینجیلدا هات بوو[1].

خودای گەورە لە ئایەتێکی تری قورئان دەفەرموێ: [وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٤﴾][2].

واتە: ئەو ڕۆژەی دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، خودا هەواڵی ئەوەی کردوویانە پێیان ئەدا، خودا بە هەموو شتێك زانایە.

پاشان خودای گەورە ئایەتێکی ترمان لە قورئان بۆ باس دەکات سەبارەت بەم ڕۆژە کە دەبێ بڕوامان پێی هەبێ وەکو دەفەرموی: [إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَىٰ ].

واتە: بێگومان هاتنی ڕۆژی دوایی بەڕێوەیەو هەر دێت، نزیك بوو بیشارمەوە (واتە: شاردومەتەوە) تا هەر کەسێك بە گوێرەی هەوڵ و کارەکانی پاداشت بدرێتەوە.

خودای گەورە لە ئایەتێکی تری قورئان دەفەرموێ: [وَإِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾][3].

---

(١) تفسير القرآن العظيم، للإمام حافظ عماد الدين أبي الفداء إسماعيل بن كثير القرشي الدمشقي، (٢/ ٢٨٧).

(٢) سورة النور، الآية: (٦٤).

(٣) سورة الحجر، الآية: (٨٥).

بەرگی یەکەم

واتە: بێگومان ڕۆژی دوایی بەڕێوەیەو دێت، تۆ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بە شێوەیەکی جوان و چاك چاو پۆش و لێبوردەبە (واتە: لەبەرامبەر ڕەفتاری نەفامان).

خوای بەتواناو بەهێز لەم ئایەتە پیرۆزەدا وشەی (فاصفح الصفح)ی بەکارهێناوە، ئەمەش لە زانستی بەلاغەدا پێی دەوترێ: (جناس الإشتقاق).

خودای گەورە لە ئایەتێکی تری قورئان ئەفەرمووی: [مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَآتٍۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ۝٥ ](١).

واتە: ئەوەی ئومێدی بە گەیشتنی دیداری خوا هەبێ، با دڵنیا بێت کە کاتی دیاریکراوی خودا هەردێت (واتە: ڕۆژی دوایی ئەویش بە دیداری شاد دەبێت)، چونکە خودا بیسەرو زانایە بە بیرو باوەڕو کرداریان.

لە ئایەتێکی تر دەفەرموێ: [ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِۗ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ](٢).

واتە: جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی تری بە هەق نیە، سوێند بەخوا لە ڕۆژی دوایی هەمووتان کۆدەکاتەوە، کە هاتنی ئەو ڕۆژە هیچ گومانێکی تێدا نیە، کێ هەیە لە خودا ڕاستگۆترو قسەی باشتر بێت.

خوێنەری بەڕێز: بیر لە وشەی (ليجمعنّكم) بکەوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، کە چۆن لام چۆتە سەر فیعلی (مضارع)، بەڵام با بچینە لای پێشەوا قرطبي (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بزانین چی دەفەرموێ: (وكل لام بعدها نون مشدده فهو لام القسم). واتە: هەر لامێك لە دوایەوەی نونی (مشدد) شەددەداربێت ئەوە بۆ سوێند خواردنە، وەکو (ليجمعنّكم) یان (لتبعثنّ).

کەواتە خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا سوێندمان بۆ دەخوا کە دەگەڕێینەوە لای لە ڕۆژیی دواییدا.

---

(١) سورة العنكبوت، الآية: (٥).

(٢) سورة النساء، الآية: (٨٧) .

ئەم ئایەتەش لەسەر ئەو کەسانە هاتە خوارەوە کە بڕوایان بە زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی نەبوو.

لەوانەیە کەسێك پرسیار بکات و بڵێت: لە بەرچی خوای گەورە لەم ئایەتەدا سوێند بە هاتنی ڕۆژیی دوایی دەخوات؟ چونکە ئەم ئایەتانە جێگەی بیرکردنەوەن بۆ دۆزینەوەی خودای باڵا دەست.

[وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِى ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾ ][1].

واتە: بێ باوەڕەکان دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دەیانگوت: ئەی موحەمەد (ﷺ) ئایا ئەو هەواڵەی پێت داوین دەربارەی هاتنی سزاو ڕۆژی دوایی دێتە دی؟ تۆش ئەی موحەمەد(ﷺ) پێیان بڵێ:

بەڵێ ڕۆژی دوایی دێتە دی سوێند بە پەروەردگارم، ئێوەش ناتوانن خوا دەستەوسان بکەن و لە دەستی ڕابکەن و خۆتان دەرباز بکەن، چونکە هەرچی هەیەتی لە دونیادا، لە ڕۆژی دواییدا دەیەوێت خۆی پێ ڕزگار بکات لە ئاگری دۆزەخ.

ئینجا کاتێ لە ڕۆژی دواییدا سزاکە دەبینن بە چاوی خۆیان زۆر پەشیمان دەبنەوە، بەڵام لەبەر خەجاڵەتی خۆیان دەیشارنەوە دەری نابڕن، وە لە نێوانیاندا دادپەروەرانە دادوەری دەکرێن، هیچ ستەمیشیان لێ ناکرێت، ئاگاداربن هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەر بۆ خوایە، وە ئاگاداربن و چاك بزانن کە بەڵێنی خودا بە هاتنی ڕۆژی دوایی ڕاست و ڕەوایە، بەڵام زۆربەی ئەوانە نازانن

---

(١) سورة يونس، الآية: (٥٣ ـ ٥٦).

ئەو رۆژە چ ڕۆژێکە، بۆیە وا بێ ئاگان و ململانێ دەکەن، وەهەر خودایە دەمانمرێنێ و زیندوومان دەکاتەوە، لەکۆتایشدا هەر بۆ لای خودای باڵا دەست دەگەڕێینەوە، ئەو کاتە بەڵێنەکانی خودا بە چاوی خۆتان دەبینن واتە: (هاتنی رۆژی دوایی).

هەندێ لە زانایان دەڵێن:

**کات چـــوار ڕۆژە :**

- ڕۆژی دونیـــا
- ڕۆژی دوایـــی
- ڕۆژی ئـــاگر
- ڕۆژی بەهەشت

یەك لەو ڕۆژانە لە فەوتان و نەمان دایە.

هەر کەسێك بە دوای شێوازەکانی قورئاندا بگەڕێ لە گەیاندنی هەواڵی ڕۆژی دوایی گەلێك جۆری لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی دەست دەکەوێت، بەڵام ئێمە تەنها هەندێکمان لێی هێناوە، بە یارمەتی خوای گەورە لە دوایشدا چەند ئایەتێکی ترتان بۆ دەخەینە ڕوو لەسەر هاتنی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی.

بەشی یەکەم

# هەندێک لە بنەماکانی مامەڵەکردن لەگەڵ کۆتایی بونەوەر

زانایان لە کۆن و نوێدا پەرتوکیان نوسیوە دەربارەی نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر، تاکو ئێستاش نوسین هەر دەنووسرێت لەم بارەوە، هەروەها بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و ڕادیۆو ماڵپەرەکانی ئینتەرنێت ناوبەناو لە مەڕ ئەو نیشانانە قسە دەکەن.. هەندێك لەو دانەرانەیش تووشی تێکەڵ کردن بوونە سەبارەت بە دەقی نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر.

لێرەدا کۆمەڵێك بنەماو بنچینە باس دەکەم لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر.

**یەکەم: پشت بەستن بە قورئان و فەرموودە:**

بۆ زانینی شتە نادیارەکان هەر ئەوانە سەرچاوەن، خوای گەورە دەفەرموێ: [قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾].

لەوانەیە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ئاگادار بکاتەوە لە هەندێ نادیارەکان بەهۆی بەرژەوەندی ئایینیەوە، وەکو نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر، کە زانستێکی نادیاری داهاتووە.. بەڵام زانینی ئەو نیشانانە لە ڕێگەی ئیسرائیلیات، یان خەون، یان لێکدانەوەی ڕووداوە سیاسیەکان گوایە ئەوانە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەرن بەبێ هیچ بەڵگەیەکی ڕاست، ئەوە کارێکی نەگونجاوە.

بە هەمان شێوە پێویستیشە ئەو دەقەی کە دەکرێتە بەڵگە دەقێکی ڕاست بێت، چ فەرموودە بێت لە پێغەمبەرەوە یان شوێنەوار بێت لە یەکێك لە هاوەڵە بەرێزەکانەوە.

ئینجا نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر بووەتە دەرگایەکی وروژاندن و بازرگانی بۆ بازاڕ گەرمکردنی کتێب و خوێنەر ڕاکێشان و زۆر باس کردنی شتی نامۆو

درۆ و خەون، یەکێك لە سەیرترین ئەو شتانەیش کە خوێندومەتەوە لەو بارەوە وتەی یەکێك لە نووسەرەکان بوو کە دەڵێت: (لە شوێنەوارێکی ناوازەدا، لە دەستنووسێکی نایاب لە سەدەی سێیەمی کۆچی لە (دار الكتب الاسلامية) لە پەرتوکخانەی تورك لە ئەستەمبوڵ، ئەوەیە کە ئەبو هوریرەو ئیبنو عەباس و عەلی کوری ئەبو تالیب (ڕەزای خوایان لێ بێت) گێڕاویانەتەوە.

لە ریوایەتێکیشدا هاتووە کە پێشەوا ئەبو هوریرە(ﷺ) ترسا بیگێڕێتەوە بەڵام کاتێك هەستی بە نزیکبوونەوەی مردن کرد ترسا لەوەی زانستێك بشارێتەوە، بۆیە بەدەوروبەری خۆی فەرمووی: لە هەواڵێکدا زانیومە دەربارەی ئەوەی کە ڕوودەدات لە جەنگی کۆتایی بونەوەر، گوتیان ئاگادارمان بکەو خراپەی نیە خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، گوتی: لە دە ساڵەکانی کۆچی پاش هەزارو سێسەد، پێنج یان شەشی ژمارد، پیاوێك فەرمانڕەوایی میسر دەکات نازناوی (ناصر)ە، عەرەب پێی دەڵێن: ئازای عەرەب، خوای گەورەش سەر شۆڕی دەکات و جەنگ لە دوای جەنگ هەرگیز سەرکەوتوو نابێت، خوای گەورەش سەرکەوتنێکی دەوێت بۆ میسر لە خۆشەویسترین مانگەکانیدا، ئیتر خوای کەعبەو عەرەب بە کەسێك ڕازی بوو بۆ میسر فەرمانڕەوای بێت گەنم ڕەنگ، باوکی خۆی نورانی ترە، بەڵام ئەو ئاشتی کرد لەگەڵ دزەکانی مزگەوتی ئەقصا لە شاری خەمباردا.

لە عێراقی شامیش پیاوێکی ستەمکارو.. سوفیانی هەیە، لە یەکێك لە چاوەکانیدا لاوازیەکی کەمی تیایە ناوی لە پێدادان (صدام)ەوەیە، ئەویش پێدادەرە (صەدام)ە بۆ هەر کەسێك لە دژی بوەستێت، هەموو دونیا بۆی کۆبونەوە لە (کوت)ێکی بچوکدا، ئەویش بە چەورکراوی چووە ناوی، سوفیانیش چاکەی تیا نیە بەبێ ئیسلام نەبێت، چاکەو خراپیشە، بەڵا لەو کەسە بکەوێت کە ناپاکی دەکات لەگەڵ مەهدی دەستپاکدا، لە دە ساڵەکانی کۆچی هەزارو چوار سەد، دوو یان سێی باس کرد، مەهدی دەست پاك دەردەچێت و شەڕ لەگەڵ هەموو بونەوەردا دەکات، هەرچی گومڕاو خوا لێ تورە بوو و مونافیقەکانی بۆ کۆدەکەنەوە لە وڵاتی ئیسراو میعراج لەلای کێوی (هەرمەجدون)، شاژنی دونیاو تەڵەکەبازی دەردەچێت.

بەرگی یەکەم

## هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی کارە نادیارەکانی داهاتوو (الغیب)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی ئەوەی داوە کەچی ڕوودەدات تاکو ڕۆژی دوایی، وە ئەوەش لەم ڕووەوەیە کە خوای گەورە ئەو کارە نادیارانەی داهاتووی پێ گوتووە، وە فەرموودەش لەم بوارەدا گەلێ زۆرن تا ئەوەی گەیشتۆتە پلەی متەواتیری مەعنەوی[1].

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) وتارێکی بۆ داین هەموو شتێکی تیا باس کرد کە ڕوودەدات تاکو ڕۆژی دوایی و هیچی وە پاش نەخست، جا ئەوەی زانی زانی، وە ئەوەی لە بیری کرد لە بیری کرد، جا من ئێستا هەندێ شت دەبینم کە پێشتر لە بیرم چوو بوو جا دەیناسمەوە هەروەك پیاو پیاو دەناسێتەوە کاتێ لێی ون دەبێ و دوایی دەیبینێ و دەی ناسێتەوە[2]..

دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی پێداوم بەوەی کە دەبێ و ڕوودەدات تاکو ڕۆژی دوایی جا هیچ شتێ نیە ئەوە ئیلا من پرسیارم لێ کردووە تەنیا ئەوە نەبێ کە پرسیارم لێ نەکردووە کەوا چ شتێك خەڵکی مەدینە لە مەدینەوە دەردەنێ[3].

جا ئەوەش هەر تایبەت نەبووە بە پێشەوا حوزەیفە (ﷺ) بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێکی تەواو وتاری داوە تاکو بۆ هاوەڵانی ڕوون بکاتەوە، ئەوەی کە ڕوو دەدات تاکو ڕۆژی دوایی، هەروەك باوکی زەید عەمری کوڕی ئەختەب (ﷺ) دەڵێ: (صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْفَجْرَ، وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ

---

(١) الشفا بتعريف أحوال المصطفى، للقاضي عياض، تحقيق: أمين قرة علي وزملائه (١/ ٦٥٠).

(٢) صحيح البخاري (١١/ ٤٩٨).

(٣) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٧)، كتاب: الفتن وأشراط الساعة، باب: إخبار النبي(ﷺ) برقم: (٢٨٩١).

الظُّهْرُ، فَنَزَلَ فَصَلَّى، ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الْعَصْرُ، ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى، ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنَا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَأَخْبَرَنَا بِمَا كَانَ وَبِمَا هُوَ كَائِنٌ فَأَعْلَمُنَا أَحْفَظُنَا)[(١)].

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بەیانی پێ کردین و سەرکەوتە سەر مینبەرو وتاری بۆ داین تاکو نوێژی نیوەڕۆ جا هاتە خوارو نوێژی کرد دوایی سەرکەوتەوە سەر مینبەرو وتاری بۆ داینەوە تاکو نوێژی عەسر هات، پاشان دابەزی و نوێژی کرد پاشان سەرکەوتەوە سەر مینبەرو وتاری بۆ داین تاکو خۆر ئاوا بوو جا هەواڵی پێداین لەوەی کە ڕووی داوەو ڕوودەدات جا زانیمان و لەبەرمان کرد.

پێشەوا حوذەیفەی کوری یەمان (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: (وَاللهِ إِنِّي لَأَعْلَمُ النَّاسِ بِكُلِّ فِتْنَةٍ هِيَ كَائِنَةٌ، فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ السَّاعَةِ، وَمَا بِي إِلَّا أَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَسَرَّ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ شَيْئًا، لَمْ يُحَدِّثْهُ غَيْرِي، وَلَكِنْ رَسولُ اللهِ (ﷺ)، قَالَ: وَهوَ يُحَدِّثُ مَجْلِسًا أَنَا فِيهِ عَنِ الْفِتَنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): وَهُوَ يَعُدُّ الْفِتَنَ: مِنْهُنَّ ثَلَاثٌ لَا يَكَدْنَ يَذَرْنَ شَيْئًا، وَمِنْهُنَّ فِتَنٌ كَرِيَاحِ الصَّيْفِ مِنْهَا صِغَارٌ وَمِنْهَا كِبَارٌ، قَالَ حُذَيْفَةُ: فَذَهَبَ أُولَئِكَ الرَّهْطُ كُلُّهُمْ غَيْرِي)[(٢)].

واتە: سوێند بەخوا من شارەزاترینی خەڵکم بە ئاشوبەکان کە ڕوو دەدەن تاکو ڕۆژی دوایی، وە ئەوەش لەبەر ئەوە نیە کە پێغەمبەر(ﷺ) هەندێکی بە نهێنی بەمن گوتبێ و بەکەسی تر نەگوتبێ، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی لە مەجلیسێکدا کە منی تیابوو لە باسی فیتنەدا، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: لە کاتێکدا نیشانەکانی ڕۆژی دوایی باس دەکرد گوتی: لەواندا سێ نیشانە هەن کە هیچ شتێ ناهێڵنەوەو جێ ناهێڵن یەکێ لەوان ئاشوبێکە وەکو بای هاوین، هەر لەم فیتنانەدا بچووك و گەورە هەیە، پێشەوا حوزەیفە(رضي الله عنه) دەڵێت: جا ئەم کۆمەڵەی ئەم فەرموودەیان گوێ لێ بوو مردوون و نەماون جگە لەمن نەبێ.

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕاست و دروستە کە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی بە ئوممەتەکەی داوە بە هەموو شتێ کە ڕوو دەدات تاکو ڕۆژی دوایی لەوەی کە تایبەتە پێیانەوە.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٧)، كتاب: الفتن ، باب: إخبار النبي(ﷺ)، برقم: (٢٨٩٢).

(٢) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢١٦)، باب: إخبار النبي(ﷺ) ، برقم: (٢٨٩١).

به بەڵگەبوونی هەواڵی (فەرموودەی) ئاحاد له بیرو باوەڕدا:

پێشەکی دەبێت ئەوه بزانین که فەرموودەی (ئاحاد): بریتییه له هەموو فەرموودەیەك که مەرجەکانی تەواتوری تێدا به دەست نەهاتبێت..

بۆ ئەم باسه پەیوەندیەکی توندوتۆڵ هەیه له باسی نیشانەکانی نزیکبونەوەی ڕۆژی دوایی، لەبەر ئەوەی زۆرترین نیشانەکانی ڕۆژی دوایی که هاتووه له ڕێگای (ئاحاد)ەوه هاتووه له فەرموودەکان[1] بێگومان هەندێ له زانایانی زانستی کەلام و ئصولیەکان دەڵێن: فەرمودەی (ئاحاد) بۆ بیروباوەڕ نابێت و کاری پێ ناچەسپێ[2] بەڵکو دەبێ بەڵگەی گومانبڕ هەبێ بۆی، جا ئایەتی قورئان یان فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بێ که ئەویش دەبێ متەواتیر بێ[3].

جا ئەم قسەیه ڕەت کرایەوه لەبەر ئەوەی گەر فەرمووده ڕاستیەتی چەسپاو دروست دەرچوو به گوێرەی گێڕەوانی بڕوا پێکراو، وه گەیشته ئێمه به ڕێگایەکی ڕاست ئەوا پێویسته بڕوا پێبونی و بەڕاست دانانی جا جیاوازی نیه که ئایا فەرموودەیەکی موتەواتیره یاخود ئاحاده[4]، بەڕاستی پێویسته یەقینمان پێی هەبێ که هەر ئەوەش ڕێڕەوی زانایانی پێشینانی چاکه وەکو گوێڕایەڵیەك بۆ فەرمانی خوای گەوره بۆ بڕواداران..

---

(١) فەرمووده دابەش دەبێ بۆ سەر دوو جۆر به گوێرەی که به ئێمه گەیشتووه که ئەوانیش متەواتیرو ئاحادە.

متەواتیر: بریتیه لەوەی که کۆمەڵێك دەیگێڕنەوه که عادەت وایه نابێ ئەم هەموو خەڵکه درۆ بکەن لەسەرەتای سەنەدی فەرموودەکەوه تا کۆتایی.

(ئاحاد)یش غەیری متەواتیره. بۆ زیاتر شارەزابوون لەم باسه بڕوانه (تقريب النووي (٢/ ١٧٦).

(٢) موعتەزیلەکان و ئەوانەی هاوڕان لەگەڵیان له دوا دواییەکان وەکو شێخ محمد عەبدەو محمود شلتوت و ئەحمەد شلبي و عبدالكريم عوسمان و ... هتد..

(٣) الفرق بين الفرق (لا ١٨٠).

(٤) فتح الباري (١٣/ ٢٣٤).

خوای گەورە دەفەرموێ: [وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾][(١)].

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: [ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾][(٢)].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: زۆر ئاشکرا و بڵاوە لەسەر کرداری هاوەڵان و تابعینەکان و کارکردنیان بە فەرموودەی تاکە کەسێ کە لە پێغەمبەری گێڕابێتەوە بەبێ هیچ ڕەت کردنەوەیەك، ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە یەك ڕابن لەسەر وەرگرتنی فەرموودەی ئاحاد[(٣)].

پێشەوا ئیبنو ئەبی عیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هەواڵێ کە یەك کەس گێڕابێتیەوە و کۆمەڵێ زانایان پێی ڕازی بووبن و کاریان پێ کردبێ و بەڕاستیان زانیبێ ئەوا بەڕاستی ئەم هەواڵەو فەرموودەیە زانستی یەقینمان لە بارەیەوە لەلای هەرە زۆری زاناکانەوە پێ دەدات، وە ئەوە یەکێکە لە بەشەکانی متەواتیر، وە هەرگیز لە نێوان زانایانی پێشینی ئەم گەلەدا ناکۆکی نەبووە لەم قسەدا[(٤)].

پێشەوا شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمویەتی: هەرکات فەرموودەیەکی ڕاست گێڕدراوە لە پێغەمبەرەوە من وەرمنەگرت و کارم پێ نەکرد ئەوا شاهێدتان دەکەم کەوا بەڕاستی عەقڵ و هۆشی من نەماوە[(٥)].

پێشەوا شافیعی جیاوازی نەکردووە لە نێوان فەرموودەی تاکە کەسی و کۆمەڵیدا، وە جیاوازی نەکردووە لەوەی کە ئایا باس لە بیروباوەڕ دەکات

---

(١) سورة الأحزاب، الآية: (٣٦).

(٢) سورة آل عمران، الآية: (٣٢).

(٣) فتح الباري (١٣/ ٢٣٤).

(٤) شرح العقيدة الطحاوية (لا ٣٩٩ ـ ٤٠٠).

(٥) مختصر الصواعق (٢/ ٣٥٠).

بەشی یەکەم

یان هەواڵدانە بە كارێكی كردەیی بەڵكو هەموو واتای قسەكەی لە دەوری ڕاستیەتی فەرموودەكە دەخولێتەوە.

پێشەوا ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هەر هەموو ئەو فەرموودانەی كە هاتوون لە پێغەمبەرەوە بە ڕێگایەكی باش و دروست ئەوا دانی پیادەنێین، بەڵام ئەگەر ڕەتی بكەینەوە ئەوا فەرمانی خوامان ڕەتكردۆتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: [وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٧ ][1].

واتە: هەرچی پێغەمبەر(ﷺ) پێی دان وەریگرن و هەرچی قەدەغەی لێ كردن، خۆی لێ لادەن وە لە خوا بترسن، كە بەڕاستی سزای خوا سەختە.

پێشەوا ئەحمەد تەنیا دروست و ڕاستیەتی بە مەرج داناوە بۆ وەرگرتنی فەرموودە.

پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: سوننە واتە فەرموودە گەر چەسپاو دروست دەركەوت ئەوا موسڵمانان و زانایانی ئیسلام یەكڕان لەسەر ئەوەی كە پێویستە پەیڕەوی بكرێت[2].

پێشەوا ئیبنو قەییم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: موسڵمانان بە گشتی یەك ڕان كەوا گەڕانەوەی بڕیار بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وەكو گەڕانەوەیە بۆ لای كە لە ژیان بێ، وە گەڕانەوە بۆ سوننەتی لە دوای مردنی وەكو یەك وایە، وە زانایان یەك ڕان كەوا فەرزیەتی ئەم بۆ گەڕاندنەوە لا ناچێت بە مردنی جا ئەگەر هەواڵ و فەرموودەكە متەواتیر بوو یا ئاحاد بوو هەر چەند زانستێكی یا دڵنیاییەكی ئەو تۆشی نەدەدا ئەوا بەڕاستی بۆ فەرمانی پەروەردگار بەوەی كەوا لە كارێكدا ڕا جیایی ڕوویدا بگەڕێینەوە لای خوای گەورە یان پێغەمبەرەكەی ئەوا هیچ ڕوو مانایەكی تر نیە[3].

---

(١) سورة الحشر، الآية: (٧).

(٢) مجموع الفتاوى (١٩/ ٨٥).

(٣) مختصر الصواعق(٢/ ٣٥٢).

ئەمەش ڕێڕەوی پێشینانە وەکو لە شوێنەوارەکەی (ئەبو طوفەیل) هاتووە کە فەرموویەتی: لە کوفە بووم، گوتیان: دەججال دەرچوو، ئێمەش هاتینە لای حوزەیفەی کوڕی ئوسەید فەرموودەی دەگێڕایەوە، گوتم: ئەوە دەججالە دەرچووە! گوتی: دانیشە، منیش دانیشتم، فەرمووی: ئەمە درۆیەکی هەڵبەستراوە، گوتمان: ئەبا (سەریحە) تۆ بێگومان لەبەر مەسەلەیەك ئێمەت لێرەدا دانیشاند، جا قسەم بۆ بکە، فەرمووی: ئەگەر دەجال لە نێوتاندا دەرچێت منداڵان بە بەرد لێی دەدەن، بەڵام دەججال لە کاتی بڵاوبوونەوەی ڕق و کینەو حەسوودی دەردەچێت لە نێو خەڵکیداو ئایین لەو کاتەدا لاوازەو پەیوەندی خەڵکی پەرتەوازەیە، دەچێتە هەموو جێگایەك، سەر زەویشی هەموو بۆ لوول دەدرێت وەکو پێستی بەران[1].

ئەگەر چاوێك بگێڕین بە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆمان دەردەکەوێت کە فەرموودەی (ئاحاد) ئێجگار زۆرە، لەوانە[2]:

١) کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) پەیامنێرەکانی دەنارد بۆ لای پادشایان یەك لەدوای یەك، هەروەها کار بەدەستانی دەنارد بە نێو شاران، خەڵکی بۆ یاساکانی شەرعی و بیروباوەڕ دەهاتنە لایان و ئاینیان لێ وەردەگرتن، جا ئەبو عوبەیدەی جەراح ی نارد بۆ لای خەڵکی نەجران و موعازی کوڕی جەبەلی(ﷺ) نارد بۆ لای خەڵکی یەمەن و دوحیەی کەلبی نارد بەنامەیەك بۆ لای گەورەی بوصری... هتد[3].

---

(١) صحيح: رواه الحاكم في المستدرك: برقم: (٨٦٥٧) وقال الإمام الحاكم: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه.
شێخ (مصطفى العدوى) دەڵێت: لەسەر هەندێ لە پیاوانی سەنەدەکەی قسەیەکی کەم هەیە، چونکە موعازی کوری هیشامی تیایە کە بەهۆی ئەوەوە فەرموودەکە دادەبەزێت بۆ پلەی (حەسەن) هەروەها (قەتادە)ی تیایە(مدلس)ە و لێرەشدا عەنعەنەی کردووە، بەڵام گێڕەرەوەکە (هیشامی کوری ئەبی عەبدوڵلای الدستوائي)یە، کە یەکێکە لە باوەڕ پێکراوترین خەڵکی.
بڕوانە: الصحيح المسند في الفتن والملاحم وأشراط الساعة، برقم: (٥٠٧) رواه عبدالرزاق في مصنفه عن معمر عن قتادة مرسلا، وهو الصواب.
(٢) وجوب الأخذ بحديث الآحاد في العقيدة والرد على شبه المخالفين (لا ٣٦).
(٣) فتح الباري (١٣/ ٢٣٢ ـ ٢٤١).

٢) پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ﷺ) دەفەرموێ: (بَيْنَا النَّاسُ بِقُبَاءٍ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللهِ(ﷺ) قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْكَعْبَةَ فَاسْتَقْبِلُوهَا وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّامِ فَاسْتَدَارُوا إِلَى الْكَعْبَةِ)[1].

واتە: خەڵکی لە (قوباء) لە نوێژی بەیانیدا بوون کاتێ هاوەڵێك هات و گوتی: پێغەمبەر(ﷺ) ئایەتی بەسەردا هاتۆتە خوارەوە کە فەرمانی پێکراوە ڕوو لە کەعبە بکات جا ئێوەش ڕووی تێبکەن دەڵێ ئەو کات ڕوویان لە شام بوو جا یەکسەر ڕوویان وەرگێڕا لای کەعبەی پیرۆز.

٣) عەبدوڵڵای کوری مەسعود(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) فەرموویەتی: (نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا شَيْئًا فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ)[2].

واتە: خوای گەورە دڵی پیاوێك ڕۆشن بکات کە گوێی لە فەرموودەیەکی ئێمە دەبێ و بە خەڵکی ڕادەگەیەنێ چۆن گوێی لێ بووەو لەبەری کردووە چونکە لەوانە زۆر لەوانەی پێیان دەگات زیاتر تێبگات لەوەی بۆی گێڕاوەتەوە.

بەڕاستی ئەو قسەیەی کە دەڵێ فەرموودەی (ئاحاد) لە ڕووی بیروباوەڕەوە وەرناگیرێ ئەوا بەڕاستی ئەم قسەیە ڕەتی سەدان فەرموودە دەکاتەوە کە بە صەحیحی و چەسپاوی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە[3].

جا ئەوانەی کە فەرموودەی (ئاحاد) وەرناگرن لە بیروباوەڕدا ئەوا دەبێ چەندین بیروباوەڕ ڕەتکەنەوە لە ڕووی بیروباوەڕدا کە چەسپاون بە فەرموودەی تاکی (ئاحاد)ەوە لەوانە[4]:

١) گەورەیی پێغەمبەرمان(ﷺ) بەسەر هەموو پێغەمبەران.

٢) تکا گەورەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی دوایی.

---

(١) صحيح البخاري (٨٩/١) باب: ما جاء في القبلة ومن لم ير الإعادة، برقم: (٤٠٣).

(٢) صحيح: سنن الترمذي، (٤/ ٣٣١) باب: ما جاء في الحث على تبليغ السماع، برقم: (٢٦٥٧)، وقال الترمذي: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ وَقَدْ رَوَاهُ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عُمَيْرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ.

(٣) وجوب الأخذ بحديث الآحاد في العقيدة والرد على شبه المخالفين (لا ٣٧).

(٤) وجوب الأخذ بحديث الآحاد في العقيدة والرد على شبه المخالفين (لا ٣٨).

٣) تکایەکی بۆ ئومەتەکەی کە خاوەنی گوناهی گەورەن.

٤) موعجیزەکانی بە گشتی جگە لە قورئان.

٥) چۆنیەتی سەرەتای دروست کراوان، وە سیفەتی فریشتەکان و پەری و بەهەشت و دۆزەخ لەوەی کە قورئان باسی نەکردوون.

٦) پرسیاری نێو گۆڕ.

٧) سیرات و حەوزو تەرازووی دوو پێوانە.

٨) باوەڕبوون بەوەی کە خوای گەورە لەسەر مرۆڤی نوسیوە بەختەوەری و ماڵ وێرانی وە رۆزی و تەمەنی و مردنی لە کاتێکدا لە سکی دایکی بووە.

٩) تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە پێشەوا سیوتی کۆی کردۆتەوە لە پەرتوکێك بەناوی (الخصائص الکبری).

١٠) هەواڵدانی بە دە هاوەڵ کە ئەهلی بەهەشتن.

١١) هەواڵدانی بەوەی کە خاوەنی گوناهە گەورەکان بە یەکجاری نامیێننەوە لە ئاگر.

١٢) باوەڕبوون بە گشت فەرموودەیەکی ڕاست لە وەسفی ڕۆژی دوایی و حەشر کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

١٣) باوەڕی بە کۆمەڵێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی وەکو هاتنی محەممەدی مەهدی و هاتنە خوارەوەی پێغەمبەر عیساو هاتنی دەجال و دەرچوونی ئاگرو هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.. هتد.

بێگومان گشت ئەم بیروباوەڕە کە دەڵێن هاتووە و چەسپاوە بە فەموودەی (ئاحاد) هەر هەمووی بە فەرموودەی (ئاحاد) نەهاتووە بەڵکو هەیانە بەڵگەکەی بە متەواتیر هاتووە بەڵام کەمی زانستی ئەمانە کە ڕەتی فەرموودەی (ئاحاد) دەکەنەوە وایلێکردوون کە ڕەتی هەموو ئەو بیروباوەڕانە بکەنەوە کە هاتوون بە ڕێگای فەرموودە ڕاستەکان[1].

---

(١) وجوب الأخذ بحديث الآحاد في العقيدة والرد على شبه المخالفين (لا ٣٩).

وە ئەوانەی فەرموودەی ئاحاد ڕەت دەکەنەوە دەبێت عوزریان بۆ بهێنرێتەوە مادەم ئەو کارەیان لە کۆشش و ئیجتیهادەوەیەو لە ڕووی لێکدانەوەی هەڵەوەیە، بەڵام ڕەتکردنەوەیان بۆ فەرموودەکانی محەممەدی مەهدی وەکو ڕەتکردنەوەیان نییە بۆ فەرموودەکانی دابەزینی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)، چونکە دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم جێگیرە بە ڕووکەشی قورئان و ڕاشکاوی سوننەتی صەحیح، بەڵام فەرموودەکانی محەممەدی مەهدی زانایان کردوویانە بە چوار بەشەوە:

- صەحیح.
- حەسەن.
- ضعیف.
- موضوع.

پشت بەخوای گەورە لە بەرگی سێیەم ئەو بابەتە بە درێژی ڕوون دەکەینەوە..

وە ئەوانەی سەبارەت بە فەرموودەی (ئاحاد) گومان دەبەخشن، بە ڕەهایی نییە، بەڵکو هەندێك فەرموودەی (ئاحاد) هەیە کە یەقین و دڵنیایی دەبەخشێت ئەگەر بێت و نیشانەو ئاماژە هەبێت (القرائن) لەسەر ڕاستێتی، وەکو فەرموودەی (إنما الأعمال بالنيات) ئەمە هەواڵێکی ئاحادە، وە لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە دەزانین کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی.

### قسەیەك بۆ خەڵکی بکەن کە لێی تێبگەن

هەندێك کەس کەمتەرخەمی دەکەن لە وردبوونەوە لە کاتی باسکردنی نیشانەکانی کۆتایی بوونەوەر، کە باسی هەندێ فەرموودە دەکەن دەربارەی نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر بۆ سەرجەم خەڵکی، یان بۆ ئەوانەی کە تازە موسڵمان بوون کە لەوانەیە بیروهۆشیان لەوانە نەگات.

زانراویشە كە هەموو شتێك بزانرێت مەرج نیە بوترێت، هەموو ڕاستیەكیش شایانی بڵاوكردنەوە نیە، چونكە ئاقڵەكان جارویار ناتوانن هەندیٚ زانیاری وەربگرن..

پێشەوا عەلی (ﷺ) فەرموویەتی:

قسە بكەن بۆ خەڵكی دەربارەی ئەوەی كە دەیزانن، ئایا حەز دەكەن خواو پێغەمبەر بە درۆ بخرێنەوە[1].

لە ڕیوایەتێكی تر هاتووە كە فەرموویەتی:

خەڵكینە، پێتان خۆشە خواو پێغەمبەرەكەی بە درۆ بخرێنەوە، قسەیەك بۆ خەڵكی بكەن كە لێی تێبگەن، واز لەوە بهێنن كە لێی تێناگەن[2].

هەروەها پێشەوا ئیبنو مەسعود (ﷺ) فەرموویەتی:

ئەگەر قسەیەك بۆ خەڵكی بكەیت لێی حاڵی نەبن، دەبێتە هۆی لە خشتەبردن بۆ هەندێكیان[3].



---

(١) صحيح البخاري، برقم: (١٢٧).

(٢) صحيح مسلم في مقدمة الصحيح (١/ ٧٦).

(٣) صحيح مسلم (١/ ٧٧).

# بەشی یەکەم
# پێناسەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی
# (أشراط الساعة)

## واتای الشرط:

الشرط: واتە نیشانە جەمعەکەشی (أشراط)ە، وەکو دەڵێ: (أشراط الشئ) واتە: سەرەتایەکانی، هەروەها (شرط السلطان) واتە: ئەوانەی کە لە پادشا نزیکن و وە پێش خەڵکی تریان دەخات لە سەربازەکانی، وە بەواتای مەرجیش هاتووە وەکو ئەوەی کە خەڵك مەرج لەگەڵ یەکتری دەکات، جا (الشرط) واتە: نیشانە لەسەر نیشانکراودا[1].

پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (الأشراط أمارات للساعة إما على قربها وإما على حصولها)[2].

واتە: (أشراط) نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دواین، یان بۆ نزیك بوونەوەی، یان لە کاتی پەیدا بوونیدا، چونکە هەندێك لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی کاتێك دێن، کە ڕۆژی دوایی دەستی پێکردووەو دێت، هەندێکیشیان پێشەکی و زەمینە خۆشکارن بۆ ڕۆژی دوایی.

خوای میهرەبان لەم ئایەتەدا وشەی (أشراطها)ی بەکارهێناوە واتە: نیشانەکان، مەبەست لە (أشراط) ئەو نیشانانەن کە ڕۆژی دواییان بە دوا دێت.

هەندێك لە زاناکان دەڵێن: (الایات) واتە: ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بە شتێك دەکەن، وەك ئەو نیشانانەی لەسەر لێواری دەریادا بەرز دەکرێنەوە، تا ڕێنمایی ئەو کەشتیانە بکات کە لەناو دەریادا ڕەت دەبن[3].

---

(١) النهاية في غريب الحديث والأثر (٢/ ٤٦٠).
(٢) فتح الباري، (١١/ ٣٥٢).
(٣) القيامة الصغرى، د. عمر سليمان الأشقر، لا ١١.

پێشەوا (الطيبي) دەڵێت: مەبەست لە (الآيات) نیشانەکانی ڕۆژی دوایین، یان واتای نزیك بوونەوە، یان واتای ڕوودانی دەگەیەنن، ئەوانەی کە واتای نزیك بوونەوە دەگەیەنن، وەکو دەجال و دابەزینی عیساو.. هتد، ئەوانەی کە واتای داهاتنی دەگەینن، وەکو دوکەڵ و هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژ ئاواو ئەو ئاگرەی کە خەڵکی کۆدەکاتەوە.

پێشەوا (الكلبى) یەکێکە لە زاناکان دەفەرمویٚ: (أشراط) بە واتای زۆربوونی ماڵ و بازرگانی و پچڕاندنی سیلەی رەحم و کەم بوونی ڕێز دیٚت[1].

شاعیری بە ناوبانگ (أبو الأسود) دەڵێت:

فإن كنت قد أزمعت بالصرم بيننا فقد جعلت أشـــراط أوله تبدو

واتە: ئەگەر تۆ بڕیاری لێکدابڕانت لە نێوماندا داوە
ئەوا هەر لەسەرەتاوە نیشانەکانیت ئاشکرا کردوە



### واتای (الساعة) لە زمانەوانی:

الساعة: ڕۆژی دوایی، واتە: بەشێك لە بەشەکانی شەوو ڕۆژ، دەڵێن کۆیەکەشی: ساعاتی پیٚ دەڵێن، وە شەو و ڕۆژ پێکەوە بیست و چوار کاتژمێر پێکدەهێنن.

### واتای (الساعة) لە زاراوەی شەرعیدا:

مەبەست لە (الساعة) لە زاراوەی شەرعیدا: ئەو کاتەیە کە قیامەتی لیٚ هەڵدەستیٚ، وە ناونراوە بە (الساعة) لەسەر خێرایی حیساب کردن تیایدا یا لەبەر ئەوەی کە لە پڕ خەڵکی دەخاتە ساتیٚ کەوا گشت خەڵك تیایدا دەمرێت بە یەك دەنگ و بانگ کردن[2].

---

(١) القيامة الصغرى، د. عمر سليمان الأشقر، لا ١٢ .

(٢) النهاية في غريب الحديث والأثر (٢/ ٤٢٢).

جا (أشراط الساعة): ئەو نیشانانەن کە لە پێش هاتنی قیامەتدا دێنو دەبنە بەڵگەی نزیکبوونەوەی[1].

جا (الساعة) بە سێ واتا دێت:

١) الساعة الصغری: واتە: قیامەتی بچووك کە ئەوەش مردنی مرۆڤە جا هەر کەسێ کە بمرێ ئەوا قیامەتی لێ بەسەر هاتووە، چونکە ئەچێتە نێو جیهانی بەرزەخ.

٢) الساعة الوسطی: واتە: قیامەتی مامناوەندی کە ئەوەش مردنی خەڵکی یەك چەرخ و سەردەمە، ئەو فەرموودەش دەبێتە پاڵ پشتی ئەم قسەیە کە گێڕدراوەتەوە لە دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە دەڵێ:

(كَانَ الْأَعْرَابُ إِذَا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) سَأَلُوهُ عَنِ السَّاعَةِ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَنَظَرَ إِلَى أَحْدَثِ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ، فَقَالَ: إِنْ يَعِشْ هَذَا، لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ، قَامَتْ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ)[2].

واتە: کاتێ دەشتەکیەکان دەهاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) سەیری گەنج ترین مرۆڤی دەکرد لەناویانداو دەیفەرموو: گەر ئەمە بژیێ و نەگاتە پیری ئەوا ڕۆژی دوایی ئێوە بەرپا دەبێ واتە: ئێوە کە مردن ئەوا چوونە نێو ڕۆژی کۆتایی و چارەنووسی حیساب.

٣) الساعه الكبری: قیامەتی گەورە ئەو ڕۆژەیە کە خەڵکی لە گۆڕەکانیان زیندوو دەکرێنەوە بۆ حساب و پاداشت و سزا وەرگرتن.

بەڵام ئەگەر ناوی (الساعة) هات لە قورئاندا ئەوا مەبەست لێی قیامەتی گەورەیە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: [يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾][3].

---

(١) النهاية في غريب الحديث والأثر (٢/ ٤٦٠).

(٢) صحيح مسلم، (٤/ ٢٢٦٩) باب: قرب الساعة، برقم: (٢٩٥٢).

(٣) سورة الأحزاب، الآية: (٦٣).

واتە: ئەی محەممەد خەڵك پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی بڵێ: زانینی بەرپابوونی ئەو ڕۆژە تەنیا لای خوایە، تۆ چوزانیت لەوانەیە ڕۆژی دوایی نزیك بێت (بەڵام خەڵك نازانن)[١].

لە ئایەتێکی تر فەرموویەتی: [ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ ][٢].
واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوە وە مانگ لەت بوو[٣].

## نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەبن بە دوو بەش

### ا) نیشانە بچووکەکان:

کە ئەویش ئەوانەن کەوا بەدوایاندا قیامەت دێ و هێشتا دونیا وێرانبوون دوورە، وەکو نەمانی زانستی شەرعی و بەدیارکەوتنی نەزانی و زۆر ئارەق خواردنەوە.. هتد، ئەم بابەتانەوە هەندێ لەو نیشانانە کە سەر هەڵدەدات ڕێ خۆشکەرە بۆ نیشانە گەورەکان.

### ٢) نیشانە گەورەکان:

کە ئەوەش کار گەلێکی گەورەن کەوا دەردەکەون لە نزیك دونیا وێران بوون و قیامەتدا وەکو هاتنی دەجال و دەرچوونی یەئجووج و مەئجوج و خۆر هەڵاتن لە خۆرئاوادا[٤].

وە زانایان نیشانەکانی ڕۆژی دواییان دابەش کردووە بەشێوەی سەر هەڵدانیان بۆ سێ جۆر:

---

(١) پوختەی تەفسیری قورئان، لا ٤٢٧ .
(٢) سورة القمر، الآیة: (١).
(٣) پوختەی تەفسیری قورئان، لا ٥٢٨ .
(٤) التذکرة، للقرطبي (لا ٦٢٤).

١) بەشێك سەری هەڵداوەو کۆتایی هاتووە.

٢) بەشێك لە سەردەمی ئێمەدا دەیانبینین کە چۆن سەر هەڵدەدەن.

٣) بەشێك تاکو ئێستا سەری هەڵنەداوە.

بەشی یەکەم و دووەم بریتین:

لە نیشانە بچوکەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، بەڵام بەشی سێهەم تیایدا نیشانەکانی گەورەو هەندێ لە بچوکەکانی تیا بەشدارە.

بەرگی یەکەم

## نیشانە بچووکەکانی کۆتایی بونەوەر

نیشانەکانی ڕۆژی دوایی کە زانایان باسیان کردووە گەلێ زۆرن، لەو پەرتوکەدا تەنیا ئەوانەم باس کردووە کەوا بە ڕێگایەکی دروست هاتووە لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، من ئەم فەرموودانەم هێناوە کە باسی نیشانەکان دەکەن بەبێ ڕیزبەندی لەبەر ئەوەی من هیچ فەرموودەیەکم دەست نەکەوتووە لەسەر ڕیزبەندیان، جا سەرەتا ئەوەم باس کردووە کەوا زانایان قسەیان لەسەر کردووە کە ئەم نیشانە سەری هەڵداوەو کۆتایی هاتووە، پاشان بە گوێرەی بیرو تێگەیشتنی خۆم باسی نیشانەکانی ترم کردووە بە گوێرەی ئەوەی کەوا ڕووداوەکان وا دەخوازێ کە هەندێ لە پێش هەندێکیان بێ.

خوای پەروەردگار ئەوەندە هۆکارو تواناى پێ بەخشیون کە ئیتر هیچ بیانویەکمان بۆ نەمێنێتەوە لە کاتی هاتنە دی نیشانەیەکی قیامەت، بەڵام بەداخەوە نایەتە بەر هەستم ئادەمیزادێك هەبێت لە دەرگای زانایەك بدات و پرسیاری لێ بکات نیشانە بچوکەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی چییە لەبەر ئەوەی مەسەلەکەی بەلاوە گرنگ نییە.. بەڵام زۆر بەلایەوە تەواوە پرسیار لە تیۆرێکی ئابوری بۆ نرخی ئەمڕۆی بەشەکەی لە فلأنە کۆمپانیا بکات.

ئەوەی کە پێویستە بزاندرێ ئەوەیە کە زۆر لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی سەرەتاکەی لە سەردەمی هاوەڵاندا سەری هەڵداوەو لە زیادبوون دایە، پاشان لەوانەیە لە هەندێ شوێن زیاتر بەر چاو بێ لە هەندێ شوێنی تر کە سەرەنجامەکەشی ڕابوونی قیامەتە کە جەوهەری هەموو ئەم کارانەیە وەکو نەمانی زانستی شەرعی کە بەرامبەر ناکرێ تەنیا بە نەزانین کە ئەوەش ئەم قسەیە ڕەت ناکاتەوە، ئەگەر لە هەندێ شوێن دا کۆمەڵێ ئەهلی زانست هەبێ لەبەر ئەوەی ئەو کات ئەم زانایانە لە نێو خەڵکی نەزاندا نادیارو بێناو دەبێ[1].

---

(١) فتح الباري (١٣/ ١٦).

ئەوەی پێویستە کە لێی ئاگاداربین ئەوەیە کە هەندێ لە خەڵکی وا تێدەگەن کە هەندێ لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی قەدەغەیەو باش نیە باس کردنیان، جا ئەم قسە هەڵەیە، وە ئەم نیشانانەی کە ئاماژەم پێکردوون هەموویان لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) باسیان لێوە کراوە، هەر چەندە ئەم نیشانانەم یەك لە دوای یەك باس نەکردوە، ئەمەش هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا فەرموودەیەکم بەکار نەهێناوە، بەڵکو چەندین فەرموودەی پێغەمبەرم(ﷺ) ئاماژە پێکردووە، وە دەبێ ئەوەش بزانین چەندان نیشانە بەرپابوون لە سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، هەر چەندە ڕوودانی نیشانەکان واتای ئەوە ناگەیەنێت کە هەموویان خەراپ بن، هەندێکی باشمان هەیەو هەندێکی خراپیشمان هەیە[1].

بۆیە پێش ئەوەی بچمە ناوەڕۆکی بابەتەکەوە، لەوانەیە کەسانێك پرسیار بکەن و بڵێن: بۆچی تەوەرەی یەکەم باس لەو نیشانانە دەکات کە ڕوویانداوەو بەسەرچون؟

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێم: ڕاستە ئەو هەواڵدانانەی بەشی یەکەم بەسەر چوون، بەڵام باسکردنی ئەم هەواڵدانانە بۆ ئەوە دەگەڕێنمەوە کە پێویستە موسڵمانان لێی بێ ئاگا نەبن و بەردەوام ژیاننامەی ئەم هاوەڵە بەڕێزانەیان لە یادبێت و پێویستە لەسەرمان چاو لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکەین، کە چۆن ئەم ژیانەیان بە ڕێکردووە وەکو کێڵگەی دوا ڕۆژ بە کردەوەی چاك و هەڵوێستی مەردانە تۆماریان کردووە، تا لە دوا ڕۆژدا بەرهەوبومەکەی بدورنەوە.

وە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی گەلێك زۆرن، بەڵام زۆر بەکورتی ئاماژەم پێکردوون، لەوانە:

(١) شرح النووي على صحيح مسلم (١١/ ٣٤٧).

# هاتنی پێغەمبەر محەممەد(ﷺ)

بە یەکێك لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی هەژمار دەکرێت..

ئاشکرایە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) کاریگەریەکی زۆری دروست کرد لەسەر هەموو بوونەوەر.

یەکەم نیشانەی ڕۆژی دوایی هاتنی پێغەمبەرە (ﷺ)، چونکە پێغەمبەری کۆتایەو هیچ پێغەمبەرێکی تر بە دوایدا نایەت، بەڵکو بە دوایدا ڕۆژی دوایی بەرپا دەبێ.

پێشەوا ئەنەسی کوری مالیك(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوسْطَى)[1].

واتە: من و ڕۆژی دوایی ئاوا پێکەوە نێردراوین، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو پەنجەی ناوەڕاست و شایەدمانی پێکەوە جووت کرد.

لە ریوایەتی پێشەوا قەیسی کوری حازم لە ئەبو جوبەیرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (بُعِثْتُ فِي نَسَمِ السَّاعَةِ)[2].

واتە: من لەگەڵ شنەبای بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی نێردراوم.

لە ژیاننامەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە: کە جولەکەکان لە بابەت پێغەمبەر (ﷺ) دەیانگوت: لەگەڵ ڕۆژی دوایی ڕەوانە دەکرێت.

---

(١) صحيح البخاري، كتاب: التفسير، باب: في سورة النازعات (٤/ ١٨٨١) برقم: (٤٦٥٢).

(٢) صحيح: رواه الدولابي في (الكنى) (٢٣/١)، وابن منده في (المعرفة) (٢/ ٢٢٣٤)، وقال الألباني صحيح، والحديث رواه الحاكم في الكنى كما في فتح الكبير صحيح جامع الصغير، برقم: (٢٨٢٩).

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە پەرتوکی (فتح الباری) لە پێشەوا (ضحاك)ەوە هێناویەتی کە فەرمویەتی: (أول أشراطها بعثة رسول الله محمد(ﷺ).

واتە: یەکەم نیشانەو هەواڵ هاتنی پێغەمبەرە(ﷺ).

پێشەوا قورطبی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەڵێت: (أولها النبي (ﷺ) لأنه نبي آخر الزمان وقد بُعِث وليس بينه وبين القيامة نبي)[1].

پێشەوا حەسانی کوڕی سابیت(ﷺ) دەڵێت: من منداڵێکی حەوت ساڵان بووم لە قسە دەگەیشتم، بەیانیەك لە مەدینە جولەکەیەك هاواری کردو گوتی: ئەی گەلی جولەکە، ئەوانیش هاتنە لای گوتیان: چی بووە؟

گوتی: ئەمشەو ئەستێرەی ئەحمەد دەرچوو، کە ئەو شەوەیە پێی لە دایك دەبێ و ئێمە دەیزانین.

پێشەوا عەبدورڕحمانی کوڕی سەعید(ﷺ) ئەویش لە باوکی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەگەڵ چەند کەسانێك دانیشتبووین، (یوشەع) کە یەکێ بوو لە زانایەکانی جولەکە، هاتە لامان گوتی: هاتنی پێغەمبەرێك نزیك بوەتەوە پێی دەڵێن: ئەحمەد، (خەلیفەی کوری سەعلەب) بە گاڵتەوە پێی گوت: نیشانەی چیە؟ یوشەع گوتی: پیاوێك دەبێ نە کورتەو نەدرێژ، بێ هەواو فیزە، بە سواری گوێدرێژ دەگەڕێ، شمشێرەکەی لەسەر شانە، خەڵکی مەککە دەری دەکەن، عەبدوالرحمن دەڵێ: کە گەڕامەوە ماڵ ئەو وتەیەم گێڕایەوە، گوتیان: هەر ئەو وانالێ، بەڵکو هەموو جولەکەی مەدینە وا دەڵێن.

پێشەوا زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەوفەل (ﷺ) دەڵێ: (موبەزان) زانایەکی جولەکە بوو لە شام پێی گوتم: بڕۆ بگەڕێوە لە وڵاتی تۆ پێغەمبەرێك پەیدا دەبێ، ئەو کاتی هات باوەڕی پێ بێنە.

---

(١) التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة، القرطبي، لا ٦٢٦. الناشر: مكتبة دار المنهاج للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة: الأولى، ١٤٢٥ هـ تحقيق ودراسة: الدكتور: الصادق بن محمد بن إبراهيم.

هەموو جاریش کە قورەیشیەکان ستەمیان لە جولەکەکان دەکرد، دەیانگوت: ڕاوەستن پێغەمبەرێك لێرە پەیدا دەبێ، بەسەر هەموتاندا زاڵ دەبێت.

ئەو شەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە دایك بوو تاقی کیسرا لەرزیو دوانزە سواندەی بەربۆوە، ئاگری فارس کە هەزار ساڵ بوو دەسوتا کوژایەوە، دەریاچەی (ساوا) کە لە ئەردەن بوو وشك بوو.

جولەکەیەك لە مەککە هەبوو بازرگانی دەکرد، ئەو شەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە دایك بوو لەگەڵ قورەیشیەکان دانیشتبوو، گوتی: قورەیشیەکان کەس لە ئێوە ئەمشەو منداڵیان نەبوە؟ گوتیان: نازانین، گوتی: دیارە ئێوە ئاگادار نین، ئەمشەو پێغەمبەری ئەو میللەتە هاتوەتە دونیا، لەناو شانی خاڵێك هەیە پڕ موە وەك بژی ماین، دوو شەوان هیچ ناخوا.

لە (شوعەیبی کوڕی شوعەیب) دەگێڕنەوە ئەویش لە باوکی دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەسەر ڕێگای (زەهران)، ڕاهیبێك هەبوو ناوی (عیصا) بوو خەڵکی شام بوو، زۆر زاناو تێگەیشتوو بوو، هەموو ساڵ کە دەچویە مەککە بە خەڵکەکەی دەگوت: کاتی ئەوە هاتووە کوڕێك لەو شارە لە دایك ببێت، دانیشتوانی مەککە سەری بۆ دادەنوێنن و وڵاتی فارسی دەکەوێتە ژێر دەست، هەر کەسێك پێی گەیشت با باوەڕی پێ بێنێ بە ئاوات دەگات، لە ڕاستیدا هەموو نیشانەو وێچوەکانی پێغەمبەرایەتی و کاتی لە دایکبوونی و هاتنی لە کتێبەکانی جولەکەکان نوسرابوو، هەندێ لە جولەکەکان بۆ خەڵکیان دەردەخست، دواتر کە بوو بە پێغەمبەر(ﷺ)، جولەکەکان لەبەر حەسودی و لە دەستچوونی دەسەڵات ئەو وتەیان شاردەوە.

## مزگێنیەکان لە کتێبە پێشینەکاندا بە هاتنی پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ):

-لە تەوراتدا هاتووە: خوای گەورە لە سێ شوێندا لەسەر خەڵکی دەردەکەوێت کە ئەمانەن:

١) سیناء: کە لەوێدا تەوراتی دا بە پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێ بێت).

٢) ساعیر: شاخێکە لە (فەڵەستین) کە ئینجیلی لەوێدا بە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت).

٣) مەککە (فاران): کە لەوێدا قورئان بۆ سەر پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) دابەزی.

(فاران) ناوی کۆنی شاری مەککەیە هەروەك لە تەوراتدا هاتوو لە سفری تەکوینی (٢٢: ٢١).

لە تەوراتدا هاتووە: کە پێغەمبەرێك لە شاری مەککە دەردەکەوێت، نوسراوە (الديار التي سكنها قيدار) واتە: ئەو شوێنەی کە (قیدار) لێی نیشتەجێیە، قیداریش یەکێکە لە کوڕەکانی پێغەمبەر (ئیسماعیل) کە لەمەککە نیشتەجێ بووە.

وە پێغەمبەران موژدەی ئەویان داوە کە لە نەوەی ئیسماعیل لە خاکی (فاران) ی حیجاز، جولەکەکان دستکاری بەشێك لە دەقەکانیان کردووە، بۆ ئەوەی دڵنیابن لەوەی ئەو پێغەمبەرە لە نەوەی جولەکە بێت، وە لە نەوەی ئیسحاق و یەعقوب و داود بێت، نەك لە نەوەی ئیسماعیل، بەڵام دستکاری ئەوە نەکراوە ماوە کە میسیای چاوەڕوانکراو لە کۆتایی بونەوەر دێت و نیشانەیەکە لە نیشانەکانی قیامەت[1].

- لە کتێبی (ئەدروا ڤیدەم) ئەمیش کتێبێکی پیرۆزی هیندۆسیەکانە کە دەڵێت: ئەی خەڵکینە گوێبگرن و تێبگەن لەناو خەڵکیدا موحەممەد دەنێررێت، گەورەییەکەی لەوەدایە کە هەتا لە بەهەشتیشدا سوپاس دەکرێت، ئەو مەحامەدە.

- لە کتێبی (بهۆش برانم) لە کتێبە پیرۆزەکانی هندۆسەکانە هاتووە: لەو کاتەدا ئەو کەسە لەگەڵ هاوەڵەکانی دەنێرێت کە ناوی مەحامەدە نازناوی مامۆستای جیهانەو ڕۆژانە خودا بە پێنج پاککەرەوەکە پاکی دەکاتەوە.

بۆیە پێدەچێت کە هیندۆسەکان لەسەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیم لە ناوچەی (بابل) صوحوفی ئیبراهیمیان وەرگرتووەو دواتر چونەتەوە بۆ هیندیستان[2].

---

(١) موعد الساعة، (لا ٣٦).

(٢) www.eitwhed.com.

پێشەوا ئیبنو تەیمییە(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لە پەڕاوێكی (زەبور) دا مۆژدەی هاتنی پێغەمبەرم(ﷺ) بینی، كەچی لە نوسخەیەكی تر گەڕام ئەو مۆژدەیان لا بردبوو.

(ئەنیس منصور) لە ڕۆژنامەی (الأهرام) دەڵێت:

لە ساڵی (١٧٧٦)ع دەریاوانێكی (ئوسكوتلەندی) لە حەبەشە هەندێ (مەخطوطات)ی زۆر كۆنی دۆزیوەتەوە كە دەڵێت: (صوحوفی)ی پێغەمبەر ئیدریسە، هەروەها لە یوغسلافیاش هاوشێوەی ئەوەیان دۆزیوەتەوە، پاش شیكاركردن و دۆزینەوەی ئەو زمانەی كە پێی نووسراوە بۆیان دەركەوتووە كە مۆژدەی هاتنی پێغەمبەری ئیسلامی تیایە[1].

- لە كتێبی (ساماڤیدا) كە كتێبێكی پیرۆزە لای ئیبراهیمیەكان كە شوێنكەوتەی پێغەمبەر ئیبراهیمن لە هیندستان لە بڕگەی شەش و هەشت، بەشی دووەم، ئەو دەقە هاتووە:

(ئەحمەد شەریعەتی لە خوای خۆیەوە وەرگرت، كە پڕیەتی لە دانایی).

مەولانا (عبدالحق) فدیارتی لە پەڕاوی (محمد في الأسفار الدينية العالمية) دا دەڵێ: لە ئاڤێستاشدا مۆژدە بە هاتنی موحەممەد(ﷺ) دراوە، هەرچەندە گۆڕانكاری زۆر بەسەر ئەو پەڕاوەدا هاتووە[2].

ئەم مزگێنیانە بوونە هۆی قەناعەت كردنی چەندین نەوە لە گاور و ئاگرپەرست و جولەكەو هندۆسەكان، بەڵام ئەوان سووربون لە دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ)، وە دەستیان كرد بە شێواندن و گۆڕینی ئەو مزگێنیانە، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا لە كتێبەكانیاندا هەر مزگێنی ماوە، كە شایەتی لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ) دەدات.

---

(١) بەرنامەی (كلمات القرآنية) د. ئەحمەد كبیسی لە كەناڵی دوبەی باسی كردووە.

(٢) الرسول، سعيد حوى، (لا ٤٠٢).

# دوو کەرتبوونی مانگ

لە دێر زەمانەوە تا ئێستا گرنگی و قەوارەی باسی هاتنی ڕۆژی دوایی دەبینین لە فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدار(ﷺ) کە باس لە هاتنی ڕۆژی دوایی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەکان تەنها سەرچاوە نین بۆ ئەم باسە، بەڵکو چەندین ئایەتی قورئان باس لە چۆنیەتی هاتنی ڕۆژی دوایی دەکات.

یەکێ لە هەواڵە گرنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کەرتبوونی مانگە، کە بە یەکێ لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دادەنرێت، ئەم هەواڵ و نیشانەیەش لە سەردەمی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ڕویدا.

یەکێك لەو هەواڵ و نیشانانە کە لە سورەتی (القمر)دا بەدی دەکرێت ئەوەیە کە وشەی (القمر) ناوی (٥٤)هەمین سورەتی قورئانە کە بە واتای مانگ دێت.

یەکەم ئایەت لەم سورەتە گرنگترین پەیامە دەربارەی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: [ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ۝٢ ][(١)].

واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بۆتەوەو مانگیش بوو بە دوو کەرتەوە، وە ئەگەر هەر بەڵگەو نیشانەیەك ببینن کە بەڵگە بێت لەسەر ڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) پشت هەڵدەکەن و گوێی نادەنێ و دەڵێن: ئەمە جادویەکی هەمیشەیی و هەموو کاتیە.

فەرمووی: [ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ]. نەیفەرموو: [ وَإِن یروها] بەبێ ڕاناو لە قورئان هاتووە، ئەمەش هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەوان مەبەستیان ڕێگەی ڕاست و ڕێنمایی نەبوو، بەڵکو تەنها بۆ ئارەزووی

---

(١) سورة القمر، الآية: (١- ٢) .

خۆیان داوای کەرتبوونی مانگیان کرد، ئەگینا خوای پەروەردگار نەیدەفەرموو: [ وَإِن يَرَوْاْ ءَايَةً يُعْرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ][1].

وشەی (شق) لە زمانەوانی عەرەبی بە واتای کەرتکردن نایەت، بەڵکو بە واتای کەرتکردن بەچەکەری ناسکی دێت.

زانایانی ئیسلام یەکدەنگن کە مانگ لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کەرتبوە، زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان ڕایان وایە کە مانگ لەسەر داوای بێباوەڕەکان کەرتبوو، ئەمەش پێنج ساڵ پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ شاری مەدینە.

کاتی خۆی بێ بڕواکانی مەککە داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە نیشانەیەکی ڕاستی پێغەمبەرایەتیان نیشان بدات، پێغەمبەریش(ﷺ) مانگی بۆ کردن بە دوو کەرتەوە[2] بە شێوەیەك کە ئەشکەوتی (حیراء)[3] یان لە نێوان هەردوو پارچەکەیدا بینی.

لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (انْفَرَقَ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِرْقَتَيْنِ، فَكَانَتْ فِرْقَةٌ عَلَى الْجَبَلِ، وَفِرْقَةٌ مِنْ وَرَاءِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): اللَّهُمَّ اشْهَدْ)[4].

واتە: لەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) مانگ بوو بە دوو کەرتەوە، بەشێکی کەوتە سەر کێوەکەو ئەویکەشی کەوتە خوارەوەی، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئێوە شایەت بن و ببینن.

پێشەوا سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم ڕووداوە بە چەندین ڕیوایەت لەگەڵ دیاریکردنی جێگاو کات دانی پێدانراوە، بێبرواکانیش نەیانتوانی بە درۆی بخەنەوە، کەوا بوو دەبێ کەرتبونی مانگ دەبێ ڕوویدابێ، ئەگینا

---

(١) تيسير الكريم الرحمن، للإمام عبدالرحمن بن ناصر السعدي، (٢/ ٦٦٧-٦٦٨).

(٢) صحيح البخاري ، كتاب: التفسير، باب: اقتربت الساعة، برقم: (٤٨٦٧).

(٣) چیایەکە لە چیاکانی شاری مەککەو (٣) میل لە مەککەوە دوورە. (معجم البلدان ٢/٢٦٩).

(٤) المسند، للشاشي (٢/ ١٨٨) برقم: (٧٥٥).

بێباوەڕەکان ململانێیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە لەو کاتەدا تەنها ئەوەندەیان گوت: کە جادووی لێکردووین، خوای گەورەش سورەتێکی بە ناوی (القمر)ی ناردۆتە خوارەوە، بەم موعجیزە گەورەو گرنگە، واتە: کەرتبوونی مانگ لەسەر داوای بت پەرستەکان دەست پێدەکات، باس لە چارەسەری بیروباوەڕی جاهیلی دەکات[1].

جارێکیان پێشەوا حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە شاری مەدائین وتارێکی بۆ خەڵکی خوێندەوە، پاشان گوتی: (أَلاَ إِنَّ السَّاعَةَ قَدَ اقْتَرَبَتْ، وَإِنَّ الْقَمَرَ قَدَ انْشَقَّ..)[2].

واتە: ئەی خەڵکینە باش بزانن هاتنی ڕۆژی دوایی زۆر نزیکە، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) مانگ بوو بە دوو کەرت و کافرەکانیش بڕوایان پێ نەهێنا.

ئەگەر کافرەکان ئەم ڕووداوەیان نەبینی بوایە قورئانیش ئاوا بە ئاشکرا باسی دەکات، ئەوا گەورەترین ئاشوبیان دەنایەوەو ڕەنگ بوو زۆر لە موسڵمانەکانیش هەڵگەڕابونایەوە.

گەورەترین هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ) کەرتبوونی مانگ بوو، کافرەکان ویستیان بە درۆی بخەنەوە، بەڵام لەبەر گەورەیی ڕوداوەکە نەیانتوانی بڵێن وانەبووە، بەڵکو گوتیان: با چاوەڕوانی کاروانەکان بین، چونکە(محمد) جادووی لە چاومان کردووە، بۆیە ئەم ڕووداوەمان بینیوە، بەڵام بە گەیشتنی کاروانەکان ڕاستی ڕوداوەکە بەدیار کەوت.

---

(١) في ظلال القرآن، سيد قطب، (٦/ ٣٣٤٩).

(٢) مصنف ، ابن أبي شيبة (١٣/ ٣٧٨) برقم: (٣٥٩٤٤).

## موعجیزەی کەرتبونی مانگ:

جوگرافی ناسان دەڵێن: باشترین ناوچە بۆ بینینی کەرتبوونی مانگ، پاش دوورگەی عەرەبی هیندیستانە، لێرەوە ئەوەی چاوەڕوان نەکرابوو بە دیارکەوت بە شێوەیەکی سەیر بۆ زانایانی مێژووی ڕۆژئاوا کە لە نوسراوەکانی ئەو سەردەمە بینیان کە باس دەکرێت:

لە شاری (Dhar)ی هیندی پاشا (Bjohraj) و خەڵکی ئەم شارە بە هەموو چینێکەوە ئەم موعجیزەیان بینی.

لە کەناری ڕوباری (Chamal) پاشای ئەم ناوچەیە لە هەیوانی کۆشکەکەی دوو کەرتبوونی مانگی بینی، توشی ترس و لەرزێکی گەورە بوو، چونکە لای وابوو ئەمە کۆتایی دونیایە، بەڵام پاش ماوەیەك کە گوێی لێ بوو کە ئەم ڕووداوە موعجیزەیەك بوو بۆ پێغەمبەرێك کە لە دورگەی عەرەبی دەرچووە، ئەم پادشایە وەزیرێکی نارد بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕاستی ئەم قسەیەی بۆ وەزیرەکە بەدیارکەوت لەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، ئەمڕۆش نەوەکانی ئەم پاشایە نیشتەجێی دەوروبەری شاری (Dhar)ی هیندی ئێستان.

نەك تەنها پاشاو میرەکانی ئەمەیان بینی، بەڵکو زۆربەی خەڵکانی هیندیستان ئەم ڕوداوەیان بینی، هەندێکیان لە کتێب و نوسراوەکانیاندا ئەم ساڵەیان وەك ساڵێکی جیا کەرەوەی مێژوویی بەکارهێنا، بۆ نمونە: پەیکەرێکی کۆنی بەجێماوە، لەو کاتەوە لە ژێرەوەی نوسراوە (لە ساڵی دوو کەرتبوونی مانگ بۆ دوو بەش ئەمە دروست کراوە)[1].

مێژووی هیند ناوی پادشایەکی خۆی تۆمارکردووە بەناوی (جاکروانی فرماس)، ئەم پادشایە ڕووداوی لەتبوونەکەی مانگ دەبینێت، یەکێك لە

---

(١) المخطوطة الهندية موجودة في مكتبة مكتب دائرة الهند بلندن التي تحمل رقم المرجع: عربي ٢٨٠٧، ١٥٢ إلى ١٧٣ وقد اقتبسها حميد الله في كتابه محمد رسول الله.

دەستنووسە مێژوویەکانی هیندیش بەم جۆرەی نوسیوە: پادشا ماجبار (مالابار) لە هیند (جاکروانی فرماس) لەتبوونی مانگی بینی، کە بە دەستی موحەممەد ڕوویدا، کاتێك هەواڵ هات کە پێغەمبەرێك لە دورگەی عەرەبی هاتوەو بە دەستی ئەو لەتبوونەکە بووە، بۆیە پەرۆش بوو بۆ بینینی پێغەمبەر، بۆیە کوڕەکەی لە شوێنی خۆی دانا و بەرەو دورگەی عەرەبی بۆ لای پێغەمبەر بەڕێکەوت، کاتێك پێغەمبەری بینی موسڵمان بوو، لەسەر داوای پێغەمبەر بۆ نیشتیمانی خۆی گەڕایەوە و لە مینای ڤفار وەفاتی کرد، ئەم زانیاریانە لە دەستنووسێکی هیندی لە مەکتەبەی دائیرەی هیند هەیە، کە بە درێژتر باسی (جاکروانی فرماس)ی تیا کراوە[1].

لە کتێبەکانی فەرموودەش باسی ئەم پادشایە هیندیە هاتووە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کراوە.

لە موستەدرەکی پێشەوا (حاکم) هاتووە لە ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پاشان پادشای هیند دیاری زەنجەفیلی بۆ پێغەمبەر نارد، پێغەمبەریش پارچە پارچە دەیدا بە هاوەڵان و پارچەیەکیش بەر من کەوت[2].

ئاشکرایە ئەم پادشایە بە گەیشتنی بە پێغەمبەرو باوەڕ پێهێنانی و مردنی لەسەر باوەڕ بوو بە هاوەڵ.

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە کتێبی (الاصابه) دەڵێت: ناوی ئەم پادشایە (سربانك) بووە، لەناو عەرەبیش بەم ناوەوە ناسراوە[3].

خاوەنی پەڕاوی (إظهار الحق) لە پەڕاوی (تأريخ فرشنه)وە بۆمان نەقل دەکات، کەوا خەڵکی (مليبار) لە هیندستان لەسەر دیوارێك نوسیبوویان، لە شەوی مانگ کەرتبوونەکەدا دروست کراوە.

---

(١) بينات الرسول ومعجزاته، تأليف: الشيخ عبدالمجيد الزنداني، لا ٢٢٥، دار الإيمان - الإسكندرية، الطبعة ٢٠٠٦.

(٢) المستدرك، كتاب: الأطعمة (٤/ ١٥٠).

(٣) الإصابة (٣/ ٢٧٩).

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ساڵی (١٩٦٢) خۆمان دەبینینەوە بەرامبەر بە موعجیزەیەکی قورئانی زۆر ڕاست، جا کەرتبوونی مانگ پێش چوارده سەدە حەقیقەتی خۆی نواند، دەرەنجامی ئەو کاری هەڵکۆڵینەی کە ڕوویدا لەسەر ڕووی مانگ لە (٢٠)ی یۆنیۆی واتە: حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٢) بوو[1].

لەم مێژووەدا گەشتەوانانی ئەمریکیەکان پێی خۆیان لەسەر مانگ دانا هەستان بە هەلکۆڵین و توێژینەوە لەسەر خۆڵەکەی، کە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش لە سورەتی (القمر)دا هاتووە، ئەم پێشکەوتنەش بە تەواوی دەگونجێ لەگەڵ ئەو ئایەتە قورئانیەی کە هاتووە.

لەو ڕۆژەدا زانایەکی ئەمریکی پێی خستە سەر مانگ و لە چینە خاکیەکانی سەر مانگی کۆڵیەوە، پسپۆڕە زانستیەکان چەند نمونەیەکیان لە زیخ و خۆڵی مانگدا کۆکردەوەو خۆشبەختانە دڵنیابوون کە ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنانە تەواو هەماهەنگن لەگەڵ دەستەواژە قورئانیەکان.

هەروەها لە (٤)ی مایسی ساڵی (١٩٦٧) لە تلیسکۆبی ئاسمانی (cape(محمد)ennedy) بەهۆی زەڕەبینی ئاسمانی (orbiter4) وێنەی ڕوی تاریکی مانگیان وەرگرت، کە ئێمە نابینین لە نزیکی (٣٠٠٠ کم)، چونکە ماوەی نزیکە بۆ ئەم وێنانە بە شێوەیەکی ورد نزیکەی (٩٥٪) ڕووی مانگ دیار دەکات، ئەم وێنانە لە ئەرشیف لە ژێر ژمارەی (١٨٠٥ ـ ٦٧) دانراوە ـ ئەم وێنە لە وێنە کۆنەکان بەمە جیا دەکرێت کە زۆر جیاکەرەوە پێکهاتووی وردی دیار دەکات، کە لە وێنە پێشووەکاندا روون نەبوون، چونکە پێشتر وێنەی بڕ گەیەکی بچووك وەردەگیرا، لەم وێنە نوێیانەدا زاناکان بینیان کە چاڵێکی درێژ دەوری مانگ دەدات وەك پشتێنێك بە درێژایی (٢٤٠کم)، وە بەپانی (٨ کم)وە چەقی ئەم چاڵە دەکەوێتە (٦٥) بۆ باشورەوە (١٠٥) بۆ ڕۆژهەلات، ئەو کەرتبوونە لە ئەنجامی هۆکاری سروشتی ڕوو دەدات بە شێوەی شەپۆلی

---

(١) الأدلة العلمية والشرعية على انشقاق القمر www.quran-m.com، ١٤-٦-٢٠١٠، بتاريخ ١١-٧-٢٠١٨ .

ناڕێك لە ڕێڕەوی درێژی.. هتد، بەڵام ئەوەی کە سەر سوڕهێنەر بوو بۆ زانایان شەقەکە نەبوو (هەر چەندە هۆیەك بوو بۆ بەرپابوونی هەزارەها پرسیار) بەڵکو ئەم شەقە بە شێوەیەکی هێڵی ڕاستی ڕێك و پێك بوو[1]!!

هەر ئەمەش بیرکردنەوەی (نیل ئارمسترۆنگ) (Neil Armstrong)ی شێواند کە یەکەم کەس بوو پێی لەسەر مانگ دانا، هەتا زانایانی (میسر) کەرتبوونی مانگیان بۆ ڕوونکردەوە، لەبەر ئەوەی دوو کەرتبوونی مانگ هەموو بەشی مانگی گرتەوە، کەواتە ئەو شەقە کە لە یەکگرتنی دوو کەرتەکەی مانگ کە ماوەتەوە دەبێت لە ڕووە بینراوەکەی مانگ ببینرێت! بەڵام ئاژانسی ئاسمانی و تەلیسکۆبەکان بە هیچ شێوەیەك باس لەم بابەتە ناکەن!

لە یەکێ لە گۆڤارەکان باس لەوە دەکات و دەڵێت: ئەو بەڵگە نامەیەش نەخشەی ڕووی بینراوی مانگ لەلایەن زانای ئیتاڵی (کاسینی - Cassini) بوو کە دەگەڕێتەوە بۆساڵی (١٣١١)، کۆنی ماوەکە کار ناکاتە سەر دروستی وردی زانیاریەکە چونکە بینینی ڕووی مانگ بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە لە مێژوویەکی کۆنتر لە ساڵی (١٣١١) دەستی پێکردووە.. بە هەمان شێوە لەسەر ڕووی مانگدا هێڵێکی ڕاست بینراوە، بە گوێرەی زانایانی گەردوونناسی ئەم هێڵە پڕە (Magma) برسیکەدار، کاتێك کە تیشکی خۆری دەکەوێتە سەر ئەم نەخشەی کاسین، لەلایەن زانایانی ئەم سەردەمە بە یەکێك لە سەرچاوە ڕاست و گرنگەکان دەژمێردرێت، هیچ ناکۆکیەك نیە بۆ ڕاستیەکەی، چونکە کاتی بەراوردکردنی لەگەڵ نەخشەکانی ئەم سەردەمە لێکچونێکی تەواو بێگەردیان هەیە، بەڵام زانایانی ئەم سەردەمە بێدەنگن لەم ڕاستیە، لای منیش وایە ئەم بێدەنگیە لە پیلانی خۆیان نیە، بەڵکو دەستێکی گەورەی جیهانی تێدایە کە ئەم دەستە ڕۆڵی هەیە لە داڕشتنی هەندێ بیردۆزی زانستی دوور لە ڕاستیەکان، وەك بیردۆزی داروین کە دانەرەکانیان دیارن، بەڵام لە پشت پەردەوە، زۆربەی ئەو

---

(١) الأدلة العلمية والشرعية على انشقاق القمر www.quran-m.com، ١٤-٦-٢٠١٠، بتاريخ ١١-٧-٢٠١٨.

بەشی یەکەم

بەڵگانەی كە بەدەستیان هێناوە بۆ بیردۆزەكە بە درۆ دەرچوون، یەك بە دوای یەك ڕوویەڕووی ئابڕوچونی زانستییانەی ئاشكرا بوونەتەوە[1].

ڕاستیە زانستیەكان پشتگیری لە قورئان دەكات، یەكێك لەوانەش ئەم دوو كەرت بوونەی مانگە، كە زۆر بە كەمی لێی دەدوێن، لەگەڵ ئەوەشدا سەیرترین ڕووداوەكانی سەر ڕووی مانگە!!

بە گوێرەی موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ) هێڵی ئەم كەرت بونە لە سەردەمەكانی نزیك بە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونترو ئاشكراتر بوو، هەر چەندە لەسەردەمی پێغەمبەرایەتی دوور كەوینەوە ئەم هێڵە وردە وردە كەم دەبێتەوە، چونكە ڕوی مانگ بە چەندەها هۆكار كاری تێدەكرێت، لەمانە:

- بە هۆی ئەو نەیزەكە زۆرانەی كە بە بەردەوامی دەكەونە سەر ڕووی مانگ.

- ڕۆژانە ڕوودانی گۆڕانكاری كتوپڕی گەورە لە پلەی گەرمی سەر ڕووی مانگ ڕوودەدات.

- تەقینەوەی گڕكانە شلاوییەكان هەندێ جار لە شوێنی جیاجیا لەسەر ڕووی مانگ سەر هەڵدەدات.

هەندێ هۆكاری تریش كە بوونەتە هۆی نەمانی ڕوونی ئەم هێڵە كە لەكاتی (كاسینی)دا هەبوو، بەڵام لە بەرانبەر ئەوەشدا هۆكارە تەكنیكیەكانی ئەم سەردەمە لە توانایدایە قوڵایی دەیان مەتری ژێر ڕووی مانگ دیاری بكات، وە سەردەمی ئێستاش لە هەموو سەردەمێك زیاتر توانای دۆزینەوەی ئەم كەرت بوونەی هەیە..![2]

---

(١) الأدلة العلمية والشرعية على انشقاق القمر www.quran-m.com، ١٤-٦-٢٠١٠، بتاريخ ١١-٧-٢٠١٨.

(٢) ڕاستیەكانی زانستی سەردەم، وەرگێڕانی: زاهیدە خلیل العصافی، ل١٨٧، چاپی یەكەم ١٤٣١ ك – ٢٠١٠ ، نوسینگەی تەفسیر.

تەنانەت زانایانی سەردەمی ئەمڕۆی زانست و تەکنەلۆژیا باوەڕ بەم ڕاستیە دەکەن، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان (مانگ) لەتبووە.

دکتۆر عەبدولمەجید زەندانی (خوای گەورە تەمەنی درێژ بکات بۆ خزمەتکردنی قورئان) کە سەرۆکی زانکۆی ئیمانە لە یەمەن دەڵێ:

لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناسێکدا باسی کەرتبوونی مانگمان کرد، گوتی: باشە بەڵگەت چیە؟

گوتم: ئەگەر ئەوەی قورئان تۆماری کردوە لە سوڕەی (القمر) وەها نەبوایە ئەوا کافرەکان دونیایان پڕ دەکرد دژ بە پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام هیچیان پێ نەکرا، ئەوە نەبێ کە گوتیان: ئەمە جادووەو موحەممەد(ﷺ) جادوی لێکردوین، هەروەها پاشگەزبوونەوەی موسڵمانان و بەردەوام موسڵمانبوونی کەسانی دیکە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستیە.

گوتی: باشە کێ دەڵێ قورئان نەگۆڕدراوە؟

گوتم: لە دونیادا بگەڕێ دەبینی هەموو قورئانەکان لە کۆن و نوێدا تاقە وشەیەکیش جیاوازی نیە لە نێوانیاندا.

هەروەها دکتۆر زەغلول نەجاڕ (خوای گەورە تەمەنی درێژ بکات بۆ خزمەتکردنی قورئان) کە زانایەکی پسپۆڕی ئیعجازی زانستیە لە بواری (جیۆلۆجی) دەڵێ:

ماوەیەك لەمەوپێش لە زانکۆی (کاردیف) لە ڕۆژئاوای بەریتانیا وتارێکم پێشکەش کرد، ئامادەبووان بریتی بوون لە موسڵمان و ناموسڵمان و، باسی ئیعجازی قورئانم بۆ دەکردن، گەنجێکی موسڵمان هەستایەوەو گوتی: باشە مامۆستا هیچ ئیعجازێك لەم ئایەتەدا شك دەبەی کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت:[ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ]، منیش گوتم: نەخێر، من هیچ ئیعجازێك لەو ئایەتەدا شك نابەم، چونکە زانست تەفسیری پرسە زانستیەکان دەکات و ناتوانێ «موعجیزە» تەفسیر بکات، لەتبوونی مانگیش یەکێك بووە

لە موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، کە بێباوەڕەکان داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، وەکو تاقیکردنەوەیەك با مانگیان بۆ لەت بکات و ئەگەر بتوانێ ئەوە بکات ئەوە ئەوانیش موسڵمان دەبن! پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی کرد بە پاڕانەوەو خوای گەورەش ئیلهامی کرد کە بە پەنجەی موبارەکی ئاماژە بکات بۆ مانگ لەتی بکات، پێغەمبەر (ﷺ) پەنجەی موبارەکی بەرزکردەوەو فەرمانی کرد بە مانگ لەت ببێت، ئینجا مانگیش بوو بە دوو کەرتەوە، هەریەکەیان لەلایەکی ئاسمانەوە بۆ ماوەیەك وەستان و پاشان یەکیان گرتەوە، کەچی کافرەکان لە جیاتی ئەوەی موسڵمان ببن گوتیان: ئەمە جادووکردن بوو، هەندێ لە عاقڵانی ناویان گوتیان: ئەمە ئەگەر لە شوێنەکانی تریشدا ئەمە ڕووی دابێت ئەوە جادوو نیە، ئەگەر ڕووی نەدابێت ئەوە جادووە، ئینجا ڕۆیشتنە سەر ڕێگەو دەروازەکانی شاری (مەککە)یان گرت و هەر کەسێ لە شارەکانی ترەوە دەهاتنە (مەککە) پرسیاریان لێدەکردن هیچ شتی سەیرو سەمەرەیان لا هەیە، ئەوانیش دەیانگوت: شتێکی زۆر سەیر ڕوویداوە، لەم شەوانەدا مانگ بوو بە دوو لەت، ماوەیەکی زۆر لەو حاڵەتەدا بوو پاشان هاتنەوە یەك و یەکیان گرتەوە، کافرەکانیش بۆیان دەرکەوت کە ئەوە ڕاستەقینەیەك بووەو جادووگەری نەبووەو هەندێك لەسەر ئەوە موسڵمان بوون و هەندێکی تریش هەر لەسەر لوت بەرزی خۆیان مانەوە[1].

دکتۆر زەغلول نەجار (خودای گەورە بیپارێزێت) دەڵێت: کە لە قسەکانم بوومەوە گەنجێکی بەریتانی هەستایەوەو خۆی ناساندو گوتی: من ناوم «داود موسی بانیۆك»ە، داوای کرد ڕێگەی قسەکردنی پێبدرێ و منیش گوتم: فەرموو، گوتی: من کابرایەك بووم بە شوێن توێژینەوەی ئاینەکاندا وێڵ بووم، ڕۆژێکیان قوتابیەکی موسڵمان قورئانێکی وەرگێڕدراوی ئینگلیزی بە دیاری نارد بۆم و منیش لێم وەرگرت و زۆر سوپاسم کرد، کە چوومە ماڵەوەو پەرتوکەکەم کردەوە بە ڕێککەوت کەوتە سەر ئەم سورەتە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: [ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ]

---

(١) معجزة انشقاق القمر، سايتى :
http://www.moon15.com/vb/archive/index.php/t-47869.html

گوتم: باشە عەقڵ و زانست پشتی ئەوە دەگرن مانگ دوو لەت ببێت و پاشان لەحیم ببێتەوەو یەکبگرێتەوە؟ چ هێزێك دەتوانێ کاری وابکات؟

کوڕە گەنجەکە دەڵێت: ئەم ئایەتە وای لێکردم کە دڵم لەسەر قورئانەکە سارد ببێت، دوای ئەوە هیچی ترم لێی نەخوێندەوە، گوتم: دیارە قورئانیش باسی خورافیات و ئەفسانە دەکات! بەڵام خوا ئاگادار بوو کە من بەڕاستی بە شوێن ڕاستیدا دەگەڕام و حەزم لە لێکۆڵینەوەی زانستی بوو، پاش ماوەیەك سەیری بەرنامەیەکی زانستیم دەکرد لە تەلەفزیۆندا، کابرایەکی بەریتانی بەڕێوەبەری بەرنامەکە بوو گفتوگۆو حیواری لەگەڵ سێ زانای گەردوونناسی ئەمریکیدا دەکرد، پێشکەشکاری بەرنامەکە ڕەخنەی لەو زانایانە دەگرت دەربارەی ئەو هەموو مەسروفەی دەکرێت بۆ ئەم گەشتە ئاسمانیەو دەیگوت: لە جیاتی ئەو هەموو خەرجیە بدرێتە هەژارانی دونیاو ئەوانەی بە دەست دواکەوتن و نەخۆشی و داماویەوە دەناڵێنن، دێن ئەو هەموو پارە خەرج دەکەن لە پێناو گەشتێکی ئاسمانیدا کە لە ئەنجامدا هیچ شتێکی تازەش نادۆزنەوە.. سێ زاناکەش بەرگریان لە خۆیان دەکردو دەیانگوت: ئەو خەرجیە زۆرە تەنیا بۆ گەشتی ئاسمانی خەرج ناکرێت، بەڵکو بۆ هەموو مەیدانەکانی تری زانستیش خەرج دەکرێت وەکو پزیشکی و پیشەسازی و کشتوکاڵ.. هتد، جا حیوارەکەیان سەری کێشا بۆ باسی ئەوەی یەکەم جار کێ دابەزیە سەرمانگ و چی دۆزیەوە، پێشکەشکارەکە پرسیاری خەرجی ئەو گەشتەی لێکردن، گوتیان: زیاتر لە (١٠٠) ملیۆن دۆلار خەرجی بردووە، کابرای بەریتانیش هاواری کردو گوتی: ئەی هاوار زیاد لە (١٠٠) ملیۆن دۆلار خەرج دەکرێت تەنیا بۆ ئەوەی کابرایەك بچێتە سەر مانگ و ئاڵای ئەمریکا لەوێ بچەقێنێت، بەڵام کابرای ئەمریکی گوتی: ئێمە لەو گەشتەدا ڕاستەقینەیەکمان دۆزیوەتەوە ئەگەر چەند قاتی ئەو خەرجیەشمان خەرج بکردایە ئاسایی بوو، خەڵکی بڕوای پێنەدەکردین!

پێشکەش کارەکە گوتی: کام ڕاستەقینە؟

گوتی: کاتی خۆی ئەو مانگە لەتبوونێکی بەخۆوە بینیوەو پاشان یەکی گرتووەتەوە.. پێشکەشکارەکە گوتی: چۆن ئەمەتان بۆ دەرکەوتووە؟

بەرگی یەکەم

گوتی: پشتێنەیەکی بەردین کە گۆڕانکاری زۆری بەسەر داهاتووە لەسەرەوە بۆ خوارەوە هەموو مانگی گرتۆتەوە، وەکو ئەوەی دوو لەت بوویێت و لەحیم کرابێتەوە بەیەکەوە، ئێمەش لەگەڵ زانایانی (جیۆلۆجی)دا ڕاوێژو لێکۆڵینەوەمان کرد لەسەر ئەمە، ئەوان قەناعەتیان وابوو کە شتی وادەبێت تەنیا لەو کاتەدا ڕوویدا بێت کە ئەم مانگە بوویێتە دوو لەت و پاشان یەکی گرتبێتەوە!

ئەم کوڕە گەنجە دەڵێ: کە گوێم لەمە بوو لەسەر کورسیەکە هەستام و هاوارم کرد، بەڵێ.. موعجیزەکەی موحەممەد(ﷺ) هاتە دی! کە پێش (١٤٠٠) ساڵ باسی لێکردووە، ئەوەتا خوا ئەمریکا بەکاردێنێ بۆ ئەوەی ملیۆنەها دۆلار خەرج بکات تا ڕاستەقینەکانی دینەکەی ئەو بۆ خەڵکی بسەلمێنێ، کەواتە دینی موسڵمانەکان ڕاستەو هی خوایە! بۆیە ڕام کردو قورئانەکەم لەسەر ڕەفەکە هێنا خوارەوە (کە تۆزی لەسەر نیشتبوو) ئینجا دەستم کرد بە خوێندنەوەی و سەر لە نوێ سورەتی (قەمەر)م خوێندەوە، ئەو سورەتە بووە هۆی دەروازەیەك بۆ ئەوەی بێمە ناو ئیسلام و بە قەناعەتەوە قەبوڵم کرد[1].

وە ناشبێ ئەوە لە بیر بکەین، کە لەم سەردەمەدا کۆمەڵێك مرۆڤی نەخوێنەوار کە ناویان لە خۆیان ناوە عەقلانی شەق بوونی مانگ ڕەت دەکەنەوە..

ئەبو ئیسحاق دەفەرموێ: هەندێك لە بیدعەچیەکان کەرتبوونی مانگ ڕەت دەکەنەوەو دەڵێن: عەقڵی مرۆڤ قەبوڵی ناکات، چونکە مانگ دروستکراوی خوای گەورەیە هەر چیەکی بوێت وای لێ دەکات[2].

---

(١) ئەم کوڕە گەنجە ئێستا موسڵمانێکی ئیشکەرەو سەرۆکی (حزبی ئیسلامی بەریتانیا)یە کە لە مانگی (١١)ی ساڵی (١٩٩٩) دایمەزراندو ئێستاش خەریکی خزمەت کردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، سەرچاوە (موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنة المطهرة)، يوسف الحاج أحمد، لا ٣٢٢-٣٢٤.

(٢) فتح الباري (٧/ ٢٣٥).

# سەرکەوتنی
# ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بەسەر فارس

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، سەرکەوتنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمە بەسەر فارس.

ئەم ڕوداوە لە ساڵی (٢)ی کۆچی هاتە دی، کە بەرامبەرە بە ساڵی (٦١٣-٦١٤)ع، ئەمەش لە سەردەمی یەزدەگرد کۆتایی پاشای فارسەکان، هەر ئەو یەزدەگرد کە نامەی پێغەمبەری خۆشەویستی (ﷺ) پارچە پارچە کرد، کاتێ کە بانگی کرد بۆ موسڵمانبوون، بەڵام بە دەمیەوە نەهاتن و بە ناشیرنترین شێواز وەڵامی پێغەمبەری(ﷺ) دایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) نزای لێکرد، تا لە سەردەمی پێشەوا عوسماندا کوژرا، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە دەوڵەتی ڕۆم بە گوێرەی ڕۆژگاری ئەو سەردەم بەرەو هەڵدێرو ڕوخان دەڕۆیشت و شتکستێکی خراپی هێنایە دی و دەوڵەتی فارس زاڵ بوو بەسەر ڕۆمدا، دواتر پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) ئایەتی قورئانی بۆ دابەزی و ئەوەی ڕاگەیاند کە لە ماوەیەکی نزیکدا ئیمپراتۆریەتی ڕۆم زاڵ دەبێت بەسەر فورسدا.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(ﷺ) دەڵێت: (خمس قد مضين الروم والدخان واللزام والبطشة والقمر)[1].

سەرەتای سوڕەتی (الروم) باس لە هەواڵی سەرکەوتنی ڕۆمەکان دەکات بەسەر فارسەکان کە دەفەرموێ: [الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِى بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ

---

(١) صحيح البخاري، كتاب: تفسير القرآن الكريم، باب: يوم نبطش البطشة الكبرى، برقم: (٤٨٢٥).

وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ ][1].

واتە: (ئەلیف لام میم) ئەم پیتانە هێماو ئاماژەن بۆ دەستەوسانی عەرەبەکان بەرامبەر بە قورئان و دەرەنجامیش پەککەوتنیان و هیچ لێ نەهاتنیان[2]، خوا خۆی دەیزانێ مەبەستی لەم وشەیە چیە، ڕۆمیەکان شکان، لە بەشێکی زۆر نزیك بە وڵاتی عەرەبەکانەوە کە دەکەوێتە نێوان (ئوردن و فەلەستین)، پاش ئەمە زاڵ دەبنەوە بەسەر ئەوانەدا کە شکاندبویان کە فارسەکانن، لە ماوەی چەند ساڵێکدا سەرەنجامی کار لەمەوپێش بۆ خوا بوەو لەمەوپاشیش هەر بۆ ئەوە، واتە: فارس زاڵ بێ یا ڕۆم زاڵ بێ سەرەنجامی کار هەر بۆ خوا خۆیەتی، جا ئەو ڕۆژە کە ڕۆمیەکان زاڵ دەبن بەسەر فارسەکان، وە موسڵمانان شاد دەبن[3].

سەبارەت بە [فِي بِضْعِ سِنِينَ] چەند ڕاوبۆچونێك هەیە؟

١ ـ لە نێوان (٢ ـ ١٠) یان (١٢ ـ ٢٠) ساڵە.

٢ ـ (٧) ساڵە.

٣ ـ (٣ ـ ٩) ساڵە.

٤ ـ (١ ـ ٤) ساڵە.

٥ ـ (٥ ـ ٧) ساڵە[4].

ئەوەندەی بەندە توێژینەوەی لەسەر کردبێت، گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە ڕای پەسند لە نێوان (٣ ـ ٩) ساڵە، خوای گەورە لە هەموو کەس شارەزاترە.

---

(١) سورة الروم، الآية: (١٧) .

(٢) توێژەرەوانی قورئان ڕاجیایان هەیە دەربارەی ئەم پیتانە، بۆ زیاتر زانیاریت بڕوانە: تەفسیری (قورطبي).

(٣) خولاصەی تەفسیری نامی، مەلا عبدالکریمی مدرس، لا٤٠٤، چاپی دووەم، ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا، ١٤٣١ ك ـ ٢٠١٠ع. بە دەستکاریەوە.

(٤) أحكام القرآن، أبي بكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، (٣، ٣٨٦)، دار الكتاب العربي، بيروت ـ لبنان.

ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: لە نێوان فارس و ڕۆمەکان جەنگێك هەڵگیرسا، ئینجا فارسەکان بەسەر ڕۆمەکاندا زاڵبوون، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی و هاوەڵانی گەلێك پێیان سەغڵەت بوو، لەو لاشەوە بێباوەڕەکان بە موسڵمانەکانیان دەگوت: ئێوەش وەکو ڕۆمەکان دەشکێن و ئێمە زاڵ دەبین بەسەرتاندا، پێغەمبەریش(ﷺ) حەزی دەکرد ڕۆمەکان زاڵ بن بەسەر فارسەکاندا، چونکە ڕۆمەکان خاوەنی پەرتوکی ئاسمانی بون و فارسەکانیش خاوەن پەرتوکی ئاسمانی نەبون و ئاگر پەرست بوون، بۆیە پێشەوا ئەبوبەکر (ﷺ) بە بێباوەڕەکانی دەفەرموو: دەك نەیبینن[1].

ڕۆم و فارس دوو ئیمپڕاتۆری گەورە بوون زۆربەی زۆری جیهانی ئەو سەردەمەیان بە دەستەوە بوو، هۆزە عەرەبەکانیش لە وڵاتی شام و سەر ڕووی نیوەی دوورگەی عەرەبدا لایەنگری ڕۆم بوون و هۆزە عەرەبەکانی عێراق و ڕۆژهەڵاتی نیوە دوورگەی عەرەبیش لایەنگری فارس بوون.

پێغەمبەریش(ﷺ) سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بانگەوازەکەی بگەیەنێ بە فەرمان ڕەواو پاشاکان، وەکو قەیصەرو کیسرا.. هتد.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نارد بۆ قەیصەرو کیسراو نەجاشی و هەموو دەسەڵاتدارێك بانگی دەکردن بۆ لای بەرنامەی خوا، پاش ئەوەی نامەکان گەیشتن و هەرکەسەو بیروڕای خۆی دەربڕی، جا شەڕو ئاژاوە بەردەوام هەبوو لە نێوان فارس و ڕۆمەکان، ئەوانیش وەڵامی پێغەمبەریان(ﷺ) نەدەدایەوەو خۆیان لە گێلی دەدا، وە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) شەڕ لە نێوان فارس و ڕۆم زۆر زیادی کرد.

بەڵێ.. پێش (هرقل) قەیصەرێك حوکمی دەکرد ناوی (موریس) بوو کە هەواداری فارسەکان بوو، ڕۆمەکان ئەم هەواداری و دۆستایەتیەی قەیصەریان پێ خۆش نەبوو لەگەڵ فارسەکان، بۆیە شۆڕشێکیان کردو (موریس)یان کوشت و کوڕەکەی ڕایکرد بۆ لای کیسراو ڕۆمەکانیش (قوفا)یان کرد بە پادشای خۆیان.

---

(١) أحكام القرآن، أبي بكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، (٣، ٣٨٣ـ٣٨٤)، دار الكتاب العربي، بيروت ـ لبنان.

کیسراش جەنگی ڕاگەیاند لەگەڵ ڕۆمەکان، چونکە دۆستەکەیان کوشتبوو، بۆ ئەمەش (٣) سوپای نارد، یەکێ بۆ داگیرکردنی میسرو یەکێك بۆ داگیرکردنی شام و سوپایەکی گەورەش بۆ داگیرکردنی پایتەختی (قوسطنطنیە)، ئەم سوپایەی دوایی بە سەرکردایەتی (شەهربراز) بوو کە یەکێ بوو لە گەورە سەرکردەکانی فارس، سوپای یەکەم لە ساڵی (٦١٦)ع میسری گرت و دووەمیش لە ساڵی (٦١٤)ع وڵاتی شامی گرت و چووە (قودس)هەو کەنیسەکانی ڕووخاند، سوپای سێیەمیش بەرەو پایتەخت کەوتە ڕێ و لە دەوروبەری پایتەخت مانەوە لە ساڵی (٦١٧)ع.

پێش ئەوەی کیسرا سوپاکانی بنیرێ بۆ داگیرکردنی وڵاتەکانی ڕۆم، ڕۆمەکان (قوفا)ی پاشایان کوشت و (هرقل)یان خستە جێی لە ساڵی (٦١٠)ع، لەم ساڵەدا خوای گەورە (محمد) هەڵبژارد بە پێغەمبەر، هێرشەکانی فارسەکان لە سەرەتای ساڵەکانی بانگەوازی ئیسلامەوە بوو، وە ڕووخانی (بیت المقدس) یش لە ڕێککەوتی ساڵی چوارەمی هەڵبژاردنی پێغەمبەرایەتی بوو[١].

کاتێك فارسەکان کەنیسەکانی (بیت المقدس)یان ڕووخاند، کیسرا پەروێز واتە: کیسرای سەرکەوتوو نامەیەکی گاڵتە ئامێزی نارد بۆ (هرقل) کە تیایدا گاڵتە بە خۆی و ئاینەکەی دەکات و دەڵێت: لە کیسراوە گەورەترین خواوەندو گەورەی هەموو سەر زەوی بۆ بەندەی گێلی زەلیلی (هرقل)، تۆ دەڵێی: پشتت بە خواکەت بەستووە ئەگەر وایە بۆچی (ئۆرشەلیم)ی لە دەستم ڕزگار نەکرد، پاش ئەوەی سوپای فارسەکان کۆبونەوە لە دەوروبەری پایتەختی ڕۆمەکان ئەم سوپایە سەرکردەکەی ناوی (شهربراز) بوو، وە براکەشی یەکێك بوو لە سەرکردە گەورەکانی بەردەستی کە ناوی (فروخان) بوو، لە ئاهەنگی شەوێکیاندا بەبۆنەی سەرکەوتنەکانی فارس لەبەرەی شام و بەرەی میسرەوە، بەخۆشی ئەوەی کە دەوری پایتەختیان دابوو تا بەیانی سەرکردەکان خەریکی مەی خواردنەوە بوون، کاتێك (فروخان) تەواو سەرخۆش بوو گوتی: لە خەومدا بینیم لەسەر تەختی کیسرا دانیشتبووم، ئەم قسەیە گەیشتەوە کیسرا، بۆیە زۆر توڕە بوو قسەکەی

---

(١) الجزاء (١/ ٢٧٤ ـ ٢٧٦)، و ١٠٠ قصة من نهاية الظالمين، (١٤٥ ـ ١٤٧).

وا بۆ لێکدرایەوە کە حەز دەکات بچێتە سەر حوکم، ئینجا کیسرا نامەی نارد بۆ سەرکردەی سوپاکەی (شەهربراز) کە براکەی بکوژیٚ و سەرەکەی بۆ بنێریٚ (شەهربراز) نامەی بۆ کیسرا نوسی و زۆری لیٚ پاڕایەوە کە لێی خۆش بیٚ، چونکە سەرکردەی وای دەست ناکەویٚ و زۆر توندوتیژە بەرامبەر بە دوژمن، کیسراش ئەوەندەی تر تورە بوو، گوتی: خەڵکی تر زۆرە لە فارسدا کە جێی (فروخان) بگرێتەوە زوو بیکوژەو سەرەکەیم بۆ بنێرە..

کاتیٚ (شەهربراز) کارەکەی جێبەجیٚ نەکرد، کیسرا فەرمانی دەرکرد کە لەسەر کار لاببریٚ و (فروخان)ی برای کرد بە سەرکردەی سوپاوە داوای لێکرد کە (شەهربراز)ی برای بکوژی لەبەر ئەوەی (فروخان) ئاگای لە نامەکەی پێشتری کیسرا نەبوو بۆ براکەی، خەریك بوو (شەهربراز)ی برای بکوژیٚ، لەو کاتەدا (شەهربراز) نامەکەی کیسرای پیشانی براکەیداو گوتی: برام من سیٚ جار کیسرا داوای لێکردم بتکوژم نەمکوشتی و بە قسەم نەکرد، تۆ بە یەکجار داواکردن خەریکی بە قسەی دەکەیت و من دەکوژیت، کە (فروخان) ئەمەی زانی وازی لەسەرکردایەتی هێنایەوە بۆ براکەی و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە بە هاوکاری (قەیصەر) کیسرا لەناوبەرن[1]، ئینجا نامەی نوسی بۆ (هرقل) کە چاوی پیٚ بکەویٚ و تەنها (٥٠) چەکدار بهێنیٚ لەگەڵ خۆیدا، لە پێشدا بڕوای نەکرد وایزانی پیلانە، بۆیە بە (٥٠٠) سوار چاکەوە هاتنە ناوچەکە، کە ناوچەکەیان پشکنی و زانی کەمینی بۆ دانەنراوەو پیلان نیە لەگەڵ (٥٠) سواردا لە خێمەکەیدا لەگەڵ (شەهربراز)دا کۆبوویەوەو تەنها وەرگێڕەکەیان کوشت بۆ ئەوەی نهێنیەکان ئاشکرا نەکات.

ئینجا (هرقل) هێرشی هێنایە سەر ئیمپراتۆریەتی فارسی لەلای باکورەوە توانی بە خێرایی سەرکەوتن بە دەست بهێنیٚ، چونکە سوپای (شەهربراز) خۆی دواخست و شەڕی نەکردو سوپاکانی شام و میسریش دووربوون و نەگەیشتن.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، لأبي عبدلله محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي، ب٧، ل٣٣٣، دار الحديث القاهرة، ١٤٢٣هـ ـ ٢٠٠٢م.

کاتیٚ سوپای (هرقل) گەیشتە ناو پایتەختی فارسەکان لە مەدائین و (کیسرا پەرویٚز) بە خۆی و ئاگرەکەیەوە ڕایکرد، بەم شیٚوەیە (هرقل) دەستی گرت بەسەر ماڵ و موڵکیٚکی زۆری فارسەکان و ئافرەتاکانیان کۆیلە کردو سەری کوڕی کیسرای تاشی و سواری گوێدریٚژیٚکی کردو بەڕیٚی کرد، جا شەڕی نیٚوان فارس و ڕۆم دریٚژەی کیٚشاو سەرەنجام ڕۆمەکان توانیان وڵاتی شام بگرنەوەو بچنەوە ناو (بيت المقدس)و بینای کەنیسەکانیان بکەنەوەو (صليب)ەکەش بهیٚننەوە بۆ کەنیسەی (قيامە)، (شيرويە) کوڕی کیسرا پەرویٚز باوکی کوشت و خۆیکرد بە پادشای فارس و ناوی خۆی نا (قوباذ الثاني)، ئینجا صولحی کرد لەگەڵ (هرقل) و بە ڕەسمی دەستی کیٚشایەوە لە میسرو سوریاو فەلەستین و دانی نا بە هەقی (رۆمەکان) لەو ناوچانەدا.

(قوباذ الثاني)یش تەنها (٨) مانگ حوکمی کرد، دوای ئەو (ئەردەشیر)ی کوڕی حوکمی گرتە دەست کە تەمەنی (٧) ساڵ بوو، لەم کاتەدا (شەهربراز) هاوپەیمانی (هرقل) توانی بیٚتە مەدائین و حوکم بگریٚتە دەست و خۆی بکات بە پاشایان، هەر زوو فارس هەستان دژی (شەهربراز) لەبەر ئەوەی لەگەڵ دوژمندا هاوپەیمان بوو کوشتیان و لە شەقامەکاندا لاشەکەیان ڕاکیٚشا، ئینجا (بوران)ی کچی کیسرا (پەرویٚز)یان کرد بە پادشای خۆیان، لەسەردەمی (بوران)یشدا پەیماننامەی صولحیان لەگەڵ (هرقل) بە ڕەسمی مۆر کرد و ڕازی بوون کە ڕۆمەکان دەسەڵاتدارین بەسەر شام و میسر، بەم پەیماننامەیەش بە ڕەسمی شەڕی دریٚژی نیٚوان فارس و رۆم تەواو بوو کە ئەمەش لە ساڵی (٦٢٩) بوو.

کاتیٚك ئاینی ئیسلام هات و دەسەڵاتی پەیدا کرد، دەوڵەتی فارسی لە چەند جەنگیٚکدا ڕووبەڕووی سوپای ئیسلام بوویەوەو لە ناوچوون و ئەو دەسەڵاتەیان نەما، بەڵام ڕۆمەکان نەفس دریٚژترو بە دەسەڵاترو مەحکمتربوون، بۆیە شەڕو ڕووبەڕووبونەوەیان دریٚژەی خایاند بۆ چەند سەدەیەك، هەر لە سەردەمی پیٚغەمبەرەوە(ﷺ) دەستی پیٚ کرد لە شەڕی تەبوك و موئتەهدا دوای ئەوەش بەردەوام بوو.

بەرگی یەکەم

لە چەند ساڵێکدا، واتە: لە نێوان (٣-٩)ساڵدا ڕۆمەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵ دەبنەوە، دوای (٧) ساڵ ئەم هەواڵەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دی، ئەمەش گەورەترین ڕاستیە بۆ پێغەمبەرمان(ﷺ)، ئیتر لەو ڕۆژەدا کە ڕۆم بەسەر فارسدا زاڵ دەبێتەوە، باوەڕدارەکان خۆشحاڵ دەبن بە تێکشکانی فارسەکان، چونکە هەر کەسێك خودا خۆی بیەوێ یارمەتی دەداو سەری دەخات، هەر ئەویشە خاوەن دەسەڵاتی دلۆڤانە، وە زاڵبوونی ڕۆمەکان بەسەر فارسەکان بەڵێنی خوایە، هەرگیز خوا پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەوە نازانن.. وە خوای گەورە بەڵێنی خۆی دەباتە سەر هەر چەند زۆربەی خەڵکی تەنها ڕواڵەت لە دونیا دەزانن و عەقڵیان لە چاویاندایە، چونکە ئەوانە بێ هەواڵن لە ڕۆژی دوایی، ئەوانە هەر بە ڕواڵەت ژیانی دونیا بەدی دەکەن.

## ئیعجازێکی نوێ:

هەواڵەکانی قورئان لایەنێکی دیاری ئیعجازی قورئانن، بۆ ئەوەی مرۆڤ پێی سەرسام بێت و ئەو بارو زروفەی کە قورئان ئەمەی تێدا ڕاگەیاند بێگومان موعجیزە بوو لە چەند بوارێکەوە:

(١) بارو زروف و ڕووداوەکان بە هیچ جۆرێك ئەوەی لێ نەدەخوێندرایەوە کە ئەو هەواڵە بێتە دی.

(٢) دیاریکردنی ماوەی ( ٣-٩) ساڵ بۆ هەستانەوەی گەلێکی ژێر کەوتوی شپرزەو بێ دەسەڵاتی وەکو ڕۆمەکان لەو سەردەمەدا بە خەیاڵی کەسدا نەدەچوو، لەو ڕۆژەدا ڕۆمەکان لە پەلە قاژی مەرگ و گیانەڵادابوون بە دەست فارسە ئاگر پەرستەکانەوە، چونکە ڕۆمەکان (٥٠٠٠٠) هەزار کەسیان لێ بە دیل گیرابوو لە دوایەمین جەنگیاندا.

لە ئایەتەکەدا خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە لە (بضع سنين)دا سەردەکەونەوە، پێشەوا ئەبوبەکر(ﷺ) گرەوی کرد لەگەل کافرانی مەککە، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: لە (٣) تا (٩) ساڵ دیاری بکە.. بۆیەش هەروا دەرچوو لە (٩)

ساڵەکەدا ڕۆمەکان هەستانەوەو سەرکەوتن کە هیچ ڕاڤەیەکی تر نیە مەگەر ئەوەی کە ئیرادەی خوا بوو کە هەستنەوە، ئەگینا بە هەموو حیساباتێکی دونیایی نەدەکرا لەو ماوە کەمەدا هەستنەوە.

(٣) ئایەتەکە دەفەرموێت: ڕۆمەکان ژێر کەوتن لە نزمترین و نزیکترین ناوچە کە ئەمەش ڕاستە و ڕۆمەکان لای دەریای مردوو کە نزمترین ناوچەیە لە جیهاندا ژێرکەوتن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: [ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ].

(٤) ئایەتەکە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان دەدات شان بە شانی سەرکەوتنی ڕۆمەکان، کە دیارە ئەمەش هەر شتێکی سەیرو ئەستەم بوو، لەو کاتەدا کە موسڵمانان چەوساوە بوون لە مەککەداو کافران لەو پەڕی دەسەڵات و تواناداا بوون، ئەوە بوو لەو ساڵەدا کە ڕۆمەکان سەرکەوتن و هەواڵەکە گەیشتە موسڵمانان، ئەوانیش دڵخۆش بوون بەسەر کەوتنیان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: [وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ ].

دەنگ و باسی سەرکەوتنی فارس بەسەر ڕۆمدا گەیشتە مەککەو کافرانی مەککە کەوتنە پڕوپاگەندەو لاف و گەزاف لێدان لە موسڵمانان، گوایە فارسەکان بە لای ئێوە ئاگر پەرستن و ڕۆمەکانیش خاوەن پەرتوکن، ئەی بۆچی فارسەکان سەرکەوتن بەسەر ڕۆمەکان، کەواتە ئێمەش سەردەکەوین بەسەر ئێوەدا هەر چەندە ئێوە خۆتان بە ڕاست دەزانن و خۆتان بە خاوەنی پەرتوکی ئاسمانی دەزانن.

لە پەڕاوی (انحطاط وسقوط الإمبراطورية الرومية) مێژوونوسی ئینگلیزی ناسراو بە (ئیدورد جیبون) باسی ئەو سەردەمە دەکات و دەڵێت: هەر چەندە ڕۆمەکان لاوازو شپرزەو بێ دەسەڵات بوون، بەڵام لەو ڕۆژگاریدا (کیسرا ئەپرویز خەسرۆ) هێرشی کردە سەر دەوڵەتی ڕۆم و توانی قەڵاکانی ڕۆمەکان داگیربکات و لە ڕووباری فوڕات بپەڕێتەوە بەرەو شام بکەوێتە ڕێ و حەلەب داگیر بکا، پاشان (ئەنطاکیە)ش بگرێ کە پایتەختی دەوڵەتی (بیزنطی) بوو،

ئینجا دیمەشقیان گرت و پاشان خەلیل و ڕۆژهەڵاتی ئەردەن و کەنیسەکانیان سوتاندن و هەرچی ماڵی وەقفی تیابوو کە لە سێ سەدەدا کۆکرابوونەوە هەر هەموویان بە تاڵان برد، تەنانەت خاچی ئەسڵی (true cross)شیان برد بۆ ئێران و نزیکەی (٩٠٠٠٠) هەزار گاوریان کوشت، ئینجا فارسەکان چوون بەرەو میسرو داگیریان کردو سنوری فارسەکان گەیشتە حەبەشەو تەرابلوسی ڕۆژئاواو بەمەش دەستیان گرت بەسەر زۆر ناوچەی ئەفەریقیادا.

وە هۆی هێرشی فارسەکان بۆ سەر ڕۆمەکان، ئەوەبوو کاتی خۆی کیسرا (ئەپرویز خەسرەو) ڕای کرد لە دەست (بەهرام جور) کە هورمزی باوکی لەسەر تەخت هێنایە خوارەوەو چوو بۆ لای ڕۆمەکان و پاشای ڕۆمەکانی ئەو کاتە (موریقس) ڕیزێکی شاهانەی لێگرت و تەنانەت هەندێك دەڵێن: کچی خۆشی دایە، پاشان سوپای لەگەڵ نارد بە سەرکردایەتی جەنەراڵ (نارشز) و تەختی پاشایی باو و باپیریان بۆ سەندەوە لە ساڵی (٥٩٠)ع، ئەمەش وای لە خەسرەو شا کرد کە هەمیشە وەك باوکێك سەیری (موریقس)بکات و هەردەم خۆی بە منەتباری بزانێت، ئینجا لە ساڵی (٦٠٢)ع منقوس کە یەکێ بوو لە جەنەراڵاتی سوپای ڕۆم شۆڕشی کرد دژی (موریقس)و کوشتی و ماڵ و منداڵی لەناو بردو لەسەر تەختی پادشایەتی (قوسطنطنیە) دانیشت.. ئینجا سەفیری خۆی نارد بۆ لای فارسەکان.

کاتێ کیسرا خەسرەو شا بەمەی زانی زۆر ناڕەحەت بوو، دانی نەنا بەم حکومەتە تازەیەدا، و ویستی تۆڵەی (موریقس) بکاتەوە، بۆیە لە ساڵی (٦٠٣) ع هێرشی کردە سەر دەوڵەتی ڕۆم کە ئەمەش (٧) ساڵ پێش هەڵبژاردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ پێغەمبەرایەتی[1].

لەو ڕۆژەدا دەوڵەتی ڕۆم لە گیانەڵا دابوو، (هرقل)یش حاکمی ئەفەریقیا بوو شۆڕشی کرد دژی (فوقس)و لە ساڵی (٦١٠)ع سەرکەوت بەسەریداو کوشتی، هەر ئەوەندە کاروباری گرتە دەست، ئینجا هەواڵی داگیرکردنی (ئینطاکیە)ی

---

(١) المدخل إلى الدراسات القرآنية، أبي الحسن الندوي، ل٨٥ .

بەشی یەکەم

پێگەیشت لەلایان فارسەکانەوە، فارسەکان کۆڵیان نەداو بەردەوام بوون لەسەر داگیرکردن و پەلەماردان و ڕێیان بەم گۆڕانکاریانە نەدا، تا لە ساڵی (٦١٦)ع کە ڕۆمەکان تەواو شکان و زۆر وڵاتیان لە دەستداو نا ئارامی زۆر ڕوویان تێکرد.

بۆیە لە میسرەوە خواردن و دانەوێڵە دەهات بۆ (قوسطنطنیە)ی پایتەختی ڕۆمەکان و ئەم خواردنانەش دابەش دەکرا بەسەر خەڵکی، بۆ ئەوەی خۆش گوزەران بن و لە پایتەختدا بمێننەوەو جێگیربن، کەچی کە ئەو بارو زروفە هاتە پێش و میسر لەلایان فارسەکانەوە داگیر کرا، بۆ یەکەمجار لە ساڵی (٦١٨)ع، ئەو دانەوێڵەو خواردنەی میسر بڕاوو نەهات، کە ئەمەش بووە هۆی برسیەتی و تێکچوونی باری گوزەرانی خەڵك لە پایتەختدا.

مێژوونووسەکان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە (هرقل) لەگەڵ ئەو هەموو دەست درێژیەی فارسەکان بۆ سەر وڵاتەکەی، کابرایەکی ساردو سڕو بەندەی هەواو ئارەزوو بوو، هەروەها خەریکی خوڕافیات و شتانێك بوو کە دورن لە ڕەوشتی پاشایەکی مەزنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەو بەرفرەوان[1].

لەو شەوە زەنگەی ڕۆمەکان لە ساڵی (٦١٦)ع قورئان دابەزیە سەر پێغەمبەری نەخوێندەواری ناو چوار دیواری ماڵێکی قوڕین لە مەککەدا و پێی فەرموو: [الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾].

(جیبون)ی مێژوو نووس دەڵێت: (محمد) ئەم هەواڵەیدا لە کاتێکدا کە فارس لەو پەڕی بەهێزیدا بوو، لە کاتێکدا کە هەستانەوەی ڕۆمەکان بە عەقڵی کەسدا نەدەچوو، بگرە هەر زۆر ئەستەم بوو، چونکە (١٢)ساڵی یەکەمی حوکمی (هرقل) ئەوەی لێدەخوێندرایەوە کە باری دەوڵەتەکە ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبێت.

جا لە گەرمەی ئەو هەموو ناهەمواریەی دەوڵەتی ڕۆمەکان، (هرقل) ویستی (قوسطنطنیە) بەجێ بهێڵێ و بچێت بۆ شاری (قرطاجنە) لە نزیك تونس و بیکاتە پایتەختی خۆی.. جا چەند کەلوپەل و ئاڵتون و هەرچی هەبوو لە کۆشکی



---

(١) المدخل إلى الدراسات القرآنية، لا ٨٦ .

پاشایەتیدا سواری کەشتی کران و لەوەدا بوو بڕۆن، بەڵام یەکێ لە پیاوە ئایینیەکان زۆر هانیداو وورەی بەرزکردەوە کە بجەنگێ و پایتەخت بەجێ نەهێڵێ، لەو کاتیدا (هرقل) قەناعەتی کردو چوو بۆ کەنیسەی (st-sophia) و سوێندی بۆ خواردن کە ژیان و مردنی لەگەڵ گەلەکەی بێت و بەجێیان نەهێڵێ.

بەڵێ.. گۆڕانێکی گەورە بەسەر (هرقل) هات، شەوگاری تاریکی تەمومژاوی گۆڕدرا بە ڕۆژی ڕووناکو بووە پاڵەوان و سوار چاکی مەیدان، هێزەکانی کۆکردەوە لە (کەنداوی ئەسکەندەرۆنە) و بەبۆنەی لابردنی پەردەش لەسەر پەیکەری (عیسا)، وتارێکی ئاگرینی بۆ خەڵکەکەداو داوای لێکردن کە تۆڵە بکەنەوە لە فارسە ئاگر پەرستەکان.

ئینجا (هرقل) کەوتە هێرش کردنە سەر فارسەکان و سەرکەوتنی باشی بە دەست هێنا و توانی دیلە ڕۆمەکان ئازاد بکات و لە هەڵمەتەکانیدا کارێکی وای بە فارس کرد، خەریك بوو بە یەکجاری تەفروتونایان بکات، (هرقل) توانی ئاڵای ڕۆمەکان لەسەر دڵی فارسەکان بچەقێنێ و بەسەریانەوە بشەکێتەوە.. ئەم سەرکەوتنە مەزنەش لەساڵی (٦٢٥)ع دا بوو کە بەرامبەر ساڵی (٢)ی کۆچی، کە موسڵمانان تیایدا لە شەڕی بەدردا سەرکەوتن[١].

هەموو مێژوو نووسەکانی جیهان سەرسامن لە گورج بوونەوەو گۆڕانی (هرقل)و دەڵێن: دەستی قەدەر (هرقل)ی برد بەرەو ئەو کارە کە لە خەیاڵی کەسدا نەبوو، پاشان (هرقل) گەڕایەوە سەر حاڵی جارانی و خەیاڵی دایە کچی برازای کە ناوی (مارتینا) بوو، هەروەك جارانی کەوتەوە سەر ئەو بیرەی کە نابێت ژیانی پاشاو کاربەدەستان هەر لە گۆڕەپانی جەنگدا بێت، ئەم حاڵەتەش درێژەی کێشا تا ڕووبەڕووربوونەوەیان لەگەڵ سوپای ئیسلام[٢].

---

(١) المدخل إلى الدراسات القرآنية، لا ٨٧ .

(٢) المدخل إلى الدراسات القرآنية، أبي الحسن الندوي، لا٨٦، طبعة سنة ٢٠٠٢.

## ئیعجازی قورئان سەبارەت بە شوێنی جەنگ لە نێوان فارس و ڕۆم:

لە زانستی جیۆلۆجی دەبینین، کە چەند موسڵمانێك چوونەتە سەردانی پرۆفیسۆری جیهانی (بالمەر)، کە پسپۆری زانستی جیۆلۆجیە، پێیانگوت: ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە کە نزمترین شوێن لەسەر ڕووی زەوی ئەو شوێنەیە کە سوپای ڕۆمەکان و سوپای فارسەکان خۆیاندا بەیەکدا ئەویش لای (بەیت المقدس) وەیە، بە ئاماژەو بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: [الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾]. ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم ئایەتە خوای پەروەردگار وشەی (أَدۡنَى)ی بەکارهێناوە، (أَدۡنَى)ش لە زمانی عەرەبیدا دوو واتای هەیە، چونکە (زۆربەی وشەکانی قورئان دوو واتایان هەیە) (أَدۡنَى)ش یەکێکە لە واتاکانی: کە نزیکترین خاڵە بۆ دوورگەی عەرەب، ئەو واتایە دەگرێتەوە لە قورئانی پیرۆزو تەفسیری قورئاندا، زۆربەی ڕاڤەکەرانی قورئان ئەو واتایەیان بەکار هێناوە کە نزیکترین شوێنە بۆ دوورگەی عەرەب، واتایەکی تریشی هەیە لە زمانی عەرەبیدا (أَدۡنَى) = (أخفض) واتە: نزمترین شوێن..

پرۆفیسۆر گوتی: نەخێر، چەندین شوێن هەیە لە جیهاندا لەوێ زۆر نزمترە، ئەوانیش گوتیان: نەخێر، کابرای پرۆفیسۆر گوتی: وەرن من ئەتڵەستان بۆ دێنم کە زۆر شوێن هەیە لەوێ نزمترە، ئینجا ئەتڵەسەکەی هێنا، ئەو ئەتڵەسەی کە پرۆفیسۆرەکانی دونیا کۆبونەتەوە لەسەری، ئینجا دروستیان کردووە، سەهمێك هاتووە بۆ ناوچەی (بیت المقدس) لە لای دەریاچەی (طبریە)وە نوسراوە بە (world lowest point) واتە: نزمترین خاڵ لە ڕووی زەویدا.

کابرا گوتی: ئەمە تازە دۆزراوەتەوە ئەم ئەتڵەسە تازەیە بەهۆی ئامێری زۆر زۆر وردەوە دۆزراوەتەوە، کە ئەو ناوچەیە لە فەڵەستین نزمترین شوێنە لە ڕووی زەویدا، ئێوە چۆن زانیتان؟ (محمد) چۆن زانی؟ جیهازی نەبووە، شتی نەبووە، کەواتە خوای گەورە لە پشت (محمد) وەستاوە.

جوگرافیناسەکان ئاستی ناوچە نزمەکانی زەوی لە جیهاندا ڕوون دەکەنەوە، کە نزمترین ناوچە لەسەر ڕووی زەوی ئەو ناوچەیە کە کەوتۆتە نزیك دەریای مردوو لە فەلەستیندا، بە شێوەیەك کە قوڵایی (٣٩٢) مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە نزم دەبێت، لەوێنە گەل و پێوانەکانی مانگە دەستکردەکانیش ئەمە دووپات دەکەنەوە.

ئیبنو عەباس و زانایانی تر دەفەرموون: ئەم جەنگەی لە نێوان ڕۆم و فارسەکان ڕوویدا لە نێوان ئوردن و فەلەستین بوو.

ئەنسکلۆپیدیای بەریتانی دەڵێت: دەریای مردوو شوێنێکی سوێراوی داخراوە لە نێوان (ئیسرائیل) و (ئوردن) کە نزمترین ناوچەی ئاویە لەسەر ڕووی زەوی، نزمیەکەشی دەگاتە (١٣١٢) پێ، واتە: نزیکەی (٤٠٠٠) مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە، بەشی باکوری دەکەوێتە ئوردنەوەو بەشی باشوریشی لە نێوان ئوردن و ئیسرائیل دابەش کراوە، بەڵام لە دوای جەنگی نێوان عەرەب و ئیسرائیل لە ساڵی (١٩٦٧)ع سوپای ئیسرائیلی لە تەواوی بەشی باشوردا مایەوەو دەریای مردووش دەکەوێتە نێوان گردۆڵەکانی (جدیە) لە ڕۆژئاواو بانەکانی ئوردەن لە ڕۆژهەڵاتدا[1].

---

(١) المدخل إلى الدراسات القرآنية، لا ٨٨ .

بۆ زیاتر زانیاریت سەبارەت بە سەرکەوتنی ڕۆم بەسەر فارس بە شێوەیەکی سەردەمیانە تەماشای پەرتوکی (الأرض) نوسەری دکتۆر (زەغلول النجار) بکە، هەروەها تەفسیری (ئیبنو کثیر) کە تیایدا چەند فەرمودەیەکی متەواتری هێناوەتەوە، وا چاکە بگەڕێیتەوە بۆ تەفسیری (في ظلال القرآن)ی سەید قوتب کە تیایدا جەخت لەسەر چەسپاندنی ئەم ڕووداوە دەکات بە سەرنجێکی بانگەوازانەو تێگەیشتنێکی ئیسلامیانەی ڕاست بۆ موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ.

# ئـاخاوتنی درنـدە و
# بێ گیانەکان لەگەڵ مرۆڤ

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، ئاخاوتنی درندەو بێ گیانەکانە لەگەڵ مرۆڤەکان.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الإِنْسَ، وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ عَذَبَةُ سَوْطِهِ وَشِرَاكُ نَعْلِهِ وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا حَدَثَ فِي أَهْلِهِ بَعْدَهُ)[1].

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت هەتا وای لێدێت گیاندارە درندەکان قسە لەگەڵ مرۆڤ دەکەن و پیاو جێ دەستی قامچیەکەیی و قەیتانی پێڵاوەکەی خۆی قسەی لەگەڵ دەکەن، وە ڕانی خۆی پێی دەڵێت: کە لە پاش خێزانەکەی چی کردووە.

پێشەوا ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە موسنەدەکەی لە ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەڵێت:

جارێکیان گورگێك لە ڕانە مەڕێکی داو کاوڕێکی برد، شوانەکەش دوای کەوت و لێی ستاندەوە گورگەکەش لەسەر کلکی هەڵکورماو گوتی: لە خودا ناترسی ئەو ڕۆزیەم لێ دەستێنیت کە خودا بۆی ناردوومە، شوانەکەش گوتی: گورگێگ لە سەر کلکی هەڵکورماو بە زمانی ئادەمیان دەمدوێنێ، گورگەکەش گوتی: شتێکی سەیرت پێ نەڵێم موحەممەد (ﷺ) لە یەثریبەوە هەواڵی ڕابردووان بە خەڵکی دەڵێ، جا شوانەکە یەکسەر مەڕەکانی بە پێش خۆیدا هەتا گەیشتە

---

(١) حسن: أخرجه الترمذي، باب: ما جاء في كلام السباع، (٤/ ٤٦) برقم: (٢١٨١)، قال الإمام الترمذي: وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

ناو شاری مەدینەی پیرۆز، ئینجا چووە خزمەت پێغەمبەرو(ﷺ) بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانیدا بانگ ڕادێرن، پاشان هاتە دەرو بە شوانەکەی فەرموو: بۆیان بگێڕەوە ئەویش حاڵەتەکەی بۆ گێڕانەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: صدق (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الإِنْسَ..)[1].

واتە: ڕاست دەکات سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت، هەتا وای لێدێت گیاندارە دڕندەکان قسە لەگەڵ مرۆڤ دەکەن.

ئەم نیشانەیەی قیامەت لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دی، وە هاوەڵان زۆر ڕاشکاوانە گوێیان لە وتەی کابرای شوان بوو.

تەنانەت زانای پایە بەرز ئیبنو ئەیاس لە کتێبی (بدائع الزهور) دەفەرموێ:

کابرایەك لە گوندێك ماڵی لە بەرزاییەك بوو، هەموو جارێك مانگاکەی دەهێنایە لای دەریا بۆ ئەوەی ئاو بخواتەوە، کاتێك مانگاکە ئاوی دەخواردەوە دەیگوت: (الحمدلله) خاوەنەکەی سەیری پێ دەهات، بۆیە چووە ناو دۆستەکانی خۆی ئەم باسەی بۆ گێڕایەوە کەس باوەڕی پێی نەکرد، بۆ ڕۆژی دواتر مانگاکەی بردەوە لای دەریاو ئاوی خواردەوەو گوتی: (الحمدلله) لە ڕۆژی سێیەم: خەڵکی گوندەکە هەموویان دەرچوون و چونە لای دەریاکە بینیان مانگاکە دەڵێت: (الحمدلله) کە خەڵکیش گوێبیستی بوون یەکێکیان لێی هاتە پێشەوەو گوتی: ئەی مانگا تۆش وەکو مرۆڤەکان قسە دەکەیت، مانگاکە گوتی: خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە[2].

بەندە ڕای وایە کە ئەم نیشانەیەی قیامەت بەردەوام دەبێت هەتا لە کۆتاییدا (دابة الأرض) دەردەچێت..

---

(١) سنن الترمذي، باب: ما جاء في كلام السباع، (٤/ ٤٦) برقم: (٢١٨١)، قال الإمام الترمذي: وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.

(٢) بدائع الزهور (١/ ٣٨٠).

## وەفاتکردنی پێغەمبەر محەممەد (ﷺ)

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی مردنی پێغەمبەرە(ﷺ).

پێشەوا عەوفی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت: لە شەڕی تەبوك چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کە لە ژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو، فەرمووی: (أعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ، مَوْتِي..)[١].

واتە: شەش شتان بژمێرە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی: مردنی من، واتە: پێغەمبەر(ﷺ).

لەم فەرمودەیە بە ڕاشکاوی بۆمان دەردەکەوێت کە مردنی پێغەمبەر(ﷺ) نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

جا یەکەم نەهامەتی کە بەسەر ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) هات وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو.

هەر بە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کە ژمارەیەك لە هۆزو خێلە عەرەبەکان کە هێشتا باوەڕ بە تەواوەتی لە دڵیاندا نەچەسپی بوو، بە هەڵیان زانیو لە ئایینی ئیسلام پاشگەز بوونەوە.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەربارەی ئەو کارە دڵتەزێنە دەفەرمویٚ: (لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) الْمَدِينَةَ، أَضَاءَ مِنَ الْمَدِينَةِ كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، أَظْلَمَ مِنَ الْمَدِينَةِ كُلُّ شَيْءٍ، وَمَا فَرَغْنَا مِنْ دَفْنِهِ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا)[٢].

---

(١) صحيح البخاري، كتاب الجزية والموادعة، باب: ما يحذر من الغدر من حديث عوف بن مالك الأشجعي، برقم: (٣١٧٦) في الجهاد (٦/٢٧٧ - مع الفتح).

(٢) أخرجه الترمذي (١٠/ ٨٧ ـ ٨٨) كتاب: المناقب، برقم: (٣٦١٨). وقال الترمذي: (هذا حديث

واتە: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر(ﷺ) تیایدا هاتە شاری مەدینەوە هەموو شتێك لەو شارەدا ڕووناك بویەوە، وە لەو ڕۆژەشدا کە تیایدا وەفاتی کرد هەموو شتێك لەو شارەدا تاریك بوو، هێشتا دەستمان لە خۆڵی ناشتنی پێغەمبەر(ﷺ) نەتەکاندبوو، سەر قاڵی ناشتنی بووین هەستمان کرد کە دڵمان گۆڕاوە.

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە کە هەستیان بەو گۆڕانکاریە کرد لە دڵەکانیان کە پێشتر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون، هەیان بوو لە دڵ پاکی و خۆشەویستی و هۆگری لەبەر پچڕانیان لە پەروەردەی پێغەمبەر(ﷺ)[1].

پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، ئەم دونیایەش تا سەر بۆ کەس نیە، خوای گەورە دەفەرمووێ: [ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ ][2].

واتە : ئەی موحەممەد(ﷺ) ئێمە پێش تۆ وامان نەکرد مرۆڤێك نەمرێ، ئایا ئەگەر تۆ بمری ئەوانە ژیانی هەتا هەتاییان دەبێ؟ نەخێر، هەرگیز شتی وا نیە، هەموو کەس (نەفس)ێك دەبێ تامی مردن بچێژێ و بمرێ، ئینجا بە خۆشی بێ یان بە ناخۆشی، بە هەژاری بێ یان بە دەوڵەمەندی، بە لەش ساغی بێ یان بە نەخۆشی، خودای گەورەش بۆ خۆی دەزانێ، وە بەمەش ئیقامەی حوجەیان لەسەر دەکات تا کەس بیانووی نەمێنێ، سەرەنجامیش هەر بۆ لای خۆمان دەگێردرێنەوە، ئەوسا بە پێی ڕەفتارو دەرچوونتان لە تاقیکردنەوەکەدا پاداشت و تۆڵە وەردەگرن.

پێشەوا قورتبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: یەکەم کاری مەرگەسات لە ئیسلام مردنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، لە پاشان مردنی عومەر، چونکە بە

---

صحيح غريب) .

(١) فتح الباري (٨/ ١٤٩).

(٢) سورة الأنبياء، الآية: (٣٤ ـ ٣٥).

مردنی پێغەمبەر(ﷺ) وەحی لە ئاسمان پچڕاو پێغەمبەرایەتی نەماوە، بە مردنی عومەر کە بووە هۆی یەکەم خراپەکاری هەڵگەڕانەوەی هەندێ لە عەرەب[١].

شاعیر دەڵێت:

لو كان الدنيا تدوم بالأحدلكان رسول الله(ﷺ) فيها مخلّداً

واتە: گەر دونیا بۆ کەسێك بەردەوام با ئەوا ڕەوانە کراوی خودا تیایدا هەمیشەیی دەبوو

پێغەمبەر(ﷺ) لە دوا ساتەکانی تەمەنی موبارەکی، ڕۆژێك هەستی بەلەش سووکی کرد، بۆ دواجار چووە سەر مینبەرو وتاری بۆ هاوەڵانداو فەرمووی: بەندەیەك لە بەندەکان خوا سەرپشکی کردووە لە نێوان مانەوە لە دونیاداو گەڕانەوە بۆ لای خۆی، ئەویش لای خوای هەڵبژارد، کەس لە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) تێنەگەیشت تەنها ئەبوبەکر (ﷺ) نەبێت، کە زانی پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەجەلی خۆی دەکات و بە جێیان دەهێڵێ، بۆیە هەستایە سەر پێ و بە قوڵپی گریانەوە فەرموی: خۆم و دایك و باوکم بە فیدات بین ئەی پێغەمبەری خودا.



## ئیعجازی وەفاتی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ):

وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ئیعجازێکی سەیری تێدایە لە قورئان، ئاشکرایە کە پێغەمبەرمان موحەممەد(ﷺ) تەمەنی (٦٣) ساڵ بووە، کە سەرنجی (٦٣)یەمین سورەتی قورئان دەدەین، دەبینین کە سورەتی (المنافقون)ە، کە سورەتێکی مەدەنیەو (١١) ئایەتە، پێغەمبەر(ﷺ) لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، کە سەرنجی قورئان دەدەین دەبینین لە کۆتایی (٦٣)یەمین سورەتی قورئان سورەتی (المنافقون)ە کە باسی مردن دەکات، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾][٢].

---

(١) التذكرة لأحوال الموتى والآخرة (لا ٦٢٩ ـ ٦٣٠).

(٢) سورة المنافقون، الآية: (١١).

سورەتەکە وشەی (المدینه)ی تێدا هاتووە کە مەبەست پێی شاری مەدینەیە، سورەتەکەش (مەدەنیە)، پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی (١١)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە، ئایەتی (١١)ی (المنافقون)یش باسی (ئەجل) دەکات و پەیوەندی بە لە دونیا دەرچوونەوە هەیە، سورەتی (المنافقون)یش لە ئایەتی (١١) دا دوایی دێت و تەواو دەبێت، ڕەنووسی (١١) لەگەڵ ساڵی (ئەجل)ەکەدا (تەوافوق) دەکات.

ئاشکرایە کە تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) (٦٣) ساڵ بووە، لە تەمەنی (٦٣) ساڵی وەفاتی کردووە، لە قورئاندا تەنها (٣) جار وشەی (نَتَوَفَّيَنَّكَ) هاتووە، مەبەست پێی کۆچی دوایی پێغەمبەرە (ﷺ)، ئەو (٣) وشەیەی (نَتَوَفَّيَنَّكَ) دەکەوێتە (٣) سورەتەوە، کە یەکەمینیان سورەتی (یونس)ە، دوو سورەتەکەی تریش بریتین لە سورەتی (الرعد) و (غافر).

| ئەو سوورەتانەی کە ووشەی (نَتَوَفَّيَنَّكَ) یان تێدا هاتووە، مەبەستیش لەم ووشەیە وەفاتی پێغەمبەرە (ﷺ) | زنجیرەی سوورەت لە (مصحف)دا |
| --- | --- |
| یونس | ١٠ |
| الرعد | ١٣ |
| غافر | ٤٠ |
| کۆی گشتی | (٦٣) ساڵ تەمەنی پیرۆزی |

دەبینیت کە کۆی زنجیرەی ئەو سورەتانەی کە وشەی (نَتَوَفَّيَنَّكَ) یان تێدا هاتووە = ١٠ + ١٣ + ٤٠ = ٦٣ .

پێغەمبەریش(ﷺ) لە تەمەنی (٦٣) ساڵی وەفاتی کردووە، ئەو ئایەتانەی کە وشەی (نَتَوَفَّيَنَّكَ)یان تێدا هاتووە لە ئایەتی (٤٦)ی سورەتی (یونس) و ئایەتی (٤٠)ی سورەتی (الرعد) و ئایەتی (٧٧) سورەتی (غافر).

خوای پەروەدگار لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: [هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ

رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾].

ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین دەبینین هەر لەسەرەتای ئەم ئایەتەوە کە لە جوزئی (٢٨) دایە تا کۆتای جوزئی (٢٨) ژمارەی ئایەتەکان (٦٣) ئایەتە ئەوەندەی تەمەنی پێغەمبەرمان محەممەد(ﷺ).

## ئیعجازی شەهیدبوونی پێغەمبەر(ﷺ) :

لە ئەنجامی لارو لەوێری پەیمان شکێنی جولەکەوە، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) سوپای کۆکردەوەو چووە سەر قەڵاکانی خەیبەر[1]، ڕۆژی یەکەم ئاڵا بەدەست (ئەبوبەکر)ەوە بوو قەڵاکە ئازاد نەکرا، ڕۆژی دووەمیش بەدەست (عومەر)ەوە بوو هەر ئازاد نەکرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ غَدًا رَجُلاً يُفْتَحُ عَلَى يَدَيْهِ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ فَبَاتَ النَّاسُ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَى فَغَدَوْا كُلُّهُمْ يَرْجُوهُ فَقَالَ أَيْنَ عَلِيٌّ فَقِيلَ يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ فَبَصَقَ فِي عَيْنَيْهِ وَدَعَا لَهُ فَبَرَأَ كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ وَجَعٌ فَأَعْطَاه..)[2].

واتە: بەیانی ئاڵاکە دەدەمە دەست کەسێك کە خواو پێغەمبەری خوایان خۆش دەوێت، ئەو شەوە موسڵمانان هەمووی کەوتنە لێکدانەوە، دەیانگوت: دەبێ بیداتە کێ، هەرکەسەو بەتەمای خۆی بوو وەریبگرێ، کاتێ بەیانی هات پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: کوا عەلی، گوتیان: چاوی دەهێشێت، فەرموی: بەدوایدا بنێرن بابێ کە هات، پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ تفی زاری خۆی لە چاوی عەلیداو لە خوا بۆی پاڕایەوە، چاوی ئێشی نەما ئاڵاکەی دایە دەست.

---

(١) خەیبەر شارێکی گەورەیە، (١٥٠)کم لە مەدینەوە دوورە، زەوی و باغاتێکی زۆرو بەشورەی زۆرو قایم دەور درابوو، جولەکەیەکی زۆری لێ دادەنیشت.

(٢) صحيح البخاري (١٤٤/٦) كتاب: الجهاد، باب: فضل من أسلم عل يديه رجل، برقم: (٣٠٠٩). ومسلم (٧٠/٧) كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل علي بن أبي طالب القرشي الهاشمي أبي الحسن رقم الحديث: (٤٢١٠).

ئینجا ژنێكی جوولەكە بەناوی (زەینەب) كە خێزانی (سەلامی كوڕی مشكم) بوو، مەڕێكی سەربڕیو لێی ناو ژەهری پێوەكرد بەتایبەت دەستەكەی كە زانی پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لێدەكات، پاش ئەوەی كە خواردن دانرا، هاوەڵێك بە ناوی (بیشر كوڕی بەراء) پاروویەكی لێ خواردو پێغەمبەریش(ﷺ) كە خستیە دەمیەوە فەرمویّ: ئەم گۆشت و ئێسقانە دەڵێت: مەمخۆ ژەهرم پێوەكراوە، كاتێك ژنەكەیان هێنا دانینا بە تاوانەكەیداو گوتی: ژەهرم پێوەكردو گوتم: ئەگەر پێغەمبەر بێت خوا دەیپارێزێت، ئەگەر واش نەبێت لە كۆڵمان دەبێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: خوا ناهێڵێ ئەوەت بۆ بچێتە سەرو تۆ ناتوانی من بكوژیت، هاوەڵان گوتیان بیكوژین، پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشت، بەڵام كە (بیشر) مرد درایە دەست كەس و كاریو لە تۆڵەی ئەودا كوشتیان.

هەر چەند پێغەمبەر(ﷺ) گۆشتەكەی نەخوارد، بەڵام هەر زیانی لێداو ساڵانە ئازاری بۆ دەهاتەوە.

پێشەوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێت: كاریگەری ژەهرەكەم دەبینی لەسەر پووك و پێشەوەی زمانی پێغەمبەر(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ) لە دوا ڕۆژەكانی تەمەنی بە عائیشەی دەفەرموو: (مَا زَالَتِ الأُكْلَةُ الَّتِي أَكَلْتُ مِنَ الشَّاةِ تُعَادُنِي حَتَّى كَانَ هَذَا أَوَانَ قَطَّعَتْ أَبْهَرِي)[1].

لە ریوایەتێكی تر دەفەرمویّ: (مَا أَزَالُ أَجِدُ أَلَمَ الطَّعَامِ الَّذِي أَكَلْتُ بِخَيْبَرَ فَهَذَا أَوَانُ وَجَدْتُ انْقِطَاعَ أَبْهَرِي مِنْ ذَلِكَ السَّمِّ)[2].

واتە: بەردەوام هەست بە ئازاری ئەو خواردنە دەكەم كە لە خەیبەر خواردم، ئێستاش كاتی ئەوەیە كە خوێنبەرم بەو ژەهرە دەتەقێت.

---

(١) السنن الكبرى (١٠/ ١٨) بَابُ اسْتِعْمَالِ أَوَانِي الْمُشْرِكِينَ، وَالأَكْلِ مِنْ طَعَامِهِمْ برقم: (١٩٧١٥)، ومعرفة السنن والآثار (٧/ ٢٩٨) باب: ما حرم المشركون على أنفسهم، برقم: (٥٧٧٦).

(٢) صحيح البخاري (٦/ ٩) باب: مرض النبي (S) برقم: (٤٤٢٩).

دکتۆر موجاهید ئەبو مەجد لە میسر سێ کاتژمێر لەگەڵ زانایانی بواری شەریعەو زانایانی بواری پزیشکی تاووتوێی ئەو فەرموودەیان کرد، دواتر گەیشتنە ئەوەی کە موعجیزەیەکی گەورەی تێدایە..

کە زانایان گوتیانە: لە کۆنەوە (زەرنیخ و ڕەصاص) وەك ژەهر بەکار هاتووەو ئەو ژەهرەش سەلماوە کە لە خوێنبەردا دەنیشێ و دەیتەقێنێت، ئینجا ئەم نەخۆشیە (١٤) ڕۆژێك دەخایەنێ و لە نیشانەکانی سەریەشەو ئارەق کردنەوەی زۆرو بێهێزیە، کە هەمووی لە پێغەمبەردا (ﷺ) دیاری داو چواردە ڕۆژێك بەو حاڵەوە مایەوەو ئارەقی زۆری دەکردەوەو سەری دەیەشاو دەچوونە ژێر باڵی..

باشە پێغەمبەر(ﷺ) چۆن زانی کە کاتی ئەوە هاتووە بەهۆی ژەهرەکەوە بۆری خوێنبەری بتەقێت؟ ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردبێت؟

لە کاتێکدا بۆ یەکەم جار لە سەرچاوە پزیشکیەکاندا لە ساڵی (١٨٢٦) ع باسی خوێنبەرو جەڵتەو تەقینی ئیشارەتی پێدراوەو لە ساڵی (١٩٥١) ع زیاتر باسکراوە[1].

کەواتە ئاماژەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەو بابەتە پێش چواردە سەدە موعجیزەیەکی گەورەیەو بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرێتی ئەو زاتە پایە بەرزە، کە بەمەش بێجگە لە پلەی پێغەمبەرێتی پلەی شەهیدیش خوا کردی بە نسیبی.

بۆ زیاتر زانیاریت سەبارەت بە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بڕوانە پەرتوکی (السيرة النبوية) بەڕێز: د.عەلی محەممەد صەلابی، کە بە شێوازێکی زۆر جوان و ڕەنگین باسی وەفاتی پێغەمبەرمان(ﷺ) دەکات.

---

(١) بەرەو ئیسلام، ئەندازیار عوسمان.. www.aleajaz.com.

# ئەبوبەكر لە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبێت بە جێنشین

ئەبوبەكر یەكێكە لە گەورەترین هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ)، ناوی عەبدوڵلای كوڕی باوكی قوحافەی تەمیمی قورەشیە، پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵەتی كردووە، یەكێكە لەو كەسانەی كە زوو باوەڕی بە پێغەمبەر(ﷺ) هێناوە، لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هیجرەتیان كرد بۆ شاری مەدینە، لە هەموو جەنگەكان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو تا كاتی وەفاتی[1].

چاوەكان لە هەمو شوێنێك ئەبلەق مان، لەناو چەند تیرەیەكیشدا چرپە چرپی سەرسام بوون بەرز بویەوە، ئەوەش بە هۆی ئاشكرابوون و دەركەوتنی ئەو ڕق و كینە بوو كە لەوەو پێش لە چەند دڵ و دەرونێكدا بە نهێنی خۆی مەڵاس دابوو.

لە هەموو شوێنێكی خاكی عەرەب گفتوگۆكان توند بوون و ئاڵۆزان، چەند دەنگێك بەرز بویەوە گوتیان: پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی كرد بە وەفاتی ئەویش ئیسلام كۆتایی هات، هیچ كەسێكیش لە توانایدا نیە شوێنی ئەو پڕبكاتەوە، ئەویش گەڕایەوە بۆ لای خودای خۆی دوای ئەوەی باڵیۆزی ئەو بوو لای ئێمە، فەرمان و قەدەغەكراوەكانی پەروەردگاری پێ دەگوتین، پارێزراو بوو لە هەڵەو تاوان، لە هەموو بوونەوەریشدا كەسێكی وا نیە هەڵگری ئەو سیفاتانە بێت، تاكە شتێك بوون بۆ مسۆگەركردنی یەكسانی لە نێوان تیرە جیاوازەكاندا، یەكسانكردنی خەڵك وەكو دەنكی شانە.. جا دەبێ بارو گوزەرانمان چی بەسەر بێت كەسێك بێتە شوێنی ئەو كە بەپێی ئارەزووی خۆی و خزمەكانی هۆزەكەی فەرمان ڕەوایی بكات؟

هەندێك كەسی دیكەش دوای ئەمانە كەوتن و گوتیان: دوور نیە ئەوەی دەبێتە جێنشینی پێغەمبەر(ﷺ) بە هۆی پلەو پایەی جێنشینیەوە پلەو پایەی

---

(١) أسد الغابة (٣/٢٠٥) وفضائل الصحابة (١/٦٥).

تیرەکەی خۆی بەرزبکاتەوەو لە پلەو پایەی تیرەکانی دیکەش کەم بکاتەوە، بەوەش تەرازووی لە نێوان خەڵکاندا لاسەنگ دەبێت.

کۆمەڵێك لە پشتیوانەکان تەماشایەکی دەوروبەری خۆیان کردوو گوتیان: بۆ دەبێت فەرمانڕەوایی بۆ قورەیشیەکان بێت و بێ گوێدانە ئێمە بە تەنها کۆچەرەکان دەستی بەسەردا بگرن، لە کاتێکدا ئەگەر ئێمە نەباین ئیسلام سەر نەدەکەوت.. کۆچەرەکانیش گوتیان: با میرەکان لە ئێمە بن و وەزیرەکانیش لە ئێوە، پشتیوانەکانیش گوتیان: نەخێر با میرێك لە ئێمە بێت و میرێکیش لە ئێوە.. هەندێك لە قورەیشیەکانیش گوتیان: جێنشینی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دراوەتە ئەبوبەکر، ئایا ئێمەی بەنی هاشم کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ئێمەیە شایستە تر نین ئەو پلەو پایەیە وەرگرین.. بەڵام توندترین ئەو ناکۆکیانە لە نێوان چەند تیرەیەکدا سەری هەڵدا کەوا پێغەمبەری تازەیان بۆ هاتووە، هەروەکو ئەو پێغەمبەرایەتیەی لە بەنی هاشم سەری هەڵدا، ئەمەش لەسەر ئەو بنەمایەی چۆن دەبێت لە بەنی هاشم پێغەمبەرایەتی دەرکەوێت؟ بەڵام لەناو تیرەکانی ئەوان و خزم و کەس و کارەکانی ئەواندا ئەو پێغەمبەرایەتیە دەرنەکەوێت، کەوا نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خانەدانی و گەورەیی و جۆرێکیشە لە جۆرەکانی دەسەڵات کە هەر تیمێك دەیەوێت بۆ خۆی بە دەستی بێنێت؟ دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی نەخۆشی وەفاتی پێی فەرمووم: (ادْعِي لِي أَبَا بَكْرٍ، أَبَاكِ، وَأَخَاكِ، حَتَّى أَكْتُبَ كِتَابًا، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَمَنَّى مُتَمَنٍّ وَيَقُولُ قَائِلٌ: أَنَا أَوْلَى، وَيَأْبَى اللهُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَّا أَبَا بَكْرٍ)[1]. پێشەوا (نەوەوی) دەڵێ: ئەم فەرمودەیە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر گەورەیی ئەبوبەکر کە لە دوای وەفاتی خۆی ئەبوبەکر دەبێتە جێنشینی موسڵمانان.

---

(١) صحيح البخاري(١٠/١٢٣) كتاب المرضى، باب ما رخص للمريض، برقم:(٥٦٦٦)، ومسلم (٤/١٨٥٧)، كتاب فضائل الصحابة ، باب: من فضائل أبي بكر الصديق برقم: (٢٣٨٧).

بەرگی یەکەم

لەم فەرموودەیە بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای خۆی پێشەوا (ئەبوبەکر) ی کردە جێنشینی خۆی، زانایانیش ئەمە بە نیشانەیەك لە نیشانە نزیکبووەکانی ڕۆژی دوایی دەژمێرن.

هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لەسەردەمی پێشەوا ئەبوبەکر :

ئەم هەواڵەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دی، ئەمەش پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) کە هۆزێکی زۆر لە عەرەبەکان هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، هەندێکیش داوای پێغەمبەرایەتیان کرد وەکو موسەیلەمەو ..هتد.

ئەو ڕۆژگارانەی لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) بەسەر موسڵمانەکان تێپەڕی هەرگیزاو هەرگیز لەوەو پێش بەسەریاندا تێنەپەڕیبوو.

هەر چەندە پێغەمبەر(ﷺ) بە دەنگێکی بەرز ئەو ئایەتە قورئانیەی پێ ڕاگەیاندوین کە من مرۆڤێکم وەکو ئێوە، بەڵام سروشم بۆ دێت.

ژمارەیەکی زۆر لە شوێنکەوتوانی پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز باوەڕیان بەوە نەدەکرد مردن یەخەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگرێت، چونکە لە دیدی ئەوانەوە زۆر بە پێغەمبەر (ﷺ) سەرسام بوونە عەقڵ نەیدەگرت بمرێت .

پێشەوا ثهوبان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَلْحَقَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي بِالْمُشْرِكِينَ وَحَتَّى يَعْبُدُوا الْأَوْثَانَ..)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا کۆمەڵێك لە ئومەتی من لە هۆزەکان پەیوەندی دەکەن بە هاوبەش دانەرەکان و هەتا وای لێدێت بت دەپەرستن.

هەر چەندە بەندە وای بۆ دەچێت کە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هەتا هاتنی ڕۆژی دوایی کەسانێك هەن لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە.. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە مرۆڤەکان ئازادن لە هەڵگرتنی بیروباوەڕیان.

---

(١) سنن الترمذي (٤/ ٦٩) باب: ما جاء لا تقوم الساعة حتى، برقم: (٢٢١٩).

## دەرکەوتنی ئەو درۆزنانەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن

زانایانی ئیسلام لە دوای سەردەمی هاوەڵەوە تا ئێستا هەموو یەکدەنگن کە پاش پێغەمبەر(ﷺ) هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت، هەرکەسیش لافی پێغەمبەرایەتی پاش پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ) لێبدات ئەوە لە ئاین دەردەچێت و کافر دەبێت و خوێنی حەڵاڵ دەبێت.

پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوین کە لە ئومەتەکەی کەسانێك پەیدا دەبن داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن و ژمارەیان نزیکەی خۆی لە (٣٠) کەس دەدات.

پێشەوا ثهوبان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي ثَلاَثُونَ كَذَّابُونَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي)[١].

واتە: لە ئومەتەکەم کەسانێك پەیدا دەبن کە ژمارەیان نزیکەی (٣٠) کەسە، هەریەك دەڵێ من پێغەمبەرم کەچی من دوایینی پێغەمبەرانم و هیچ پێغەمبەرێکی دیکەش لە دوایی من نایەت.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ، قَرِيبٌ مِنْ ثَلاَثِينَ ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ))[٢].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا لە ئومەتەکەم کەسانێك پەیدا دەبن کە نزیکەی (٣٠) کەس دەبن هەموویان داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن.

---

(١) سنن الترمذي (٨/ ٤٢٦) باب: ما جاء لا تقوم الساعة حتى، برقم: (٢٣٨٠).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٩) كتاب: الفتن، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٨٤).

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ ثَلاَثِينَ دَجَّالاً كَذَّابًا)[1].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی نزیکەی (٣٠) درۆزنی دەجال پەیدا دەبن.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرمویێ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ ثَلاَثُونَ كَذَّابًا آخِرُهُمَ الأَعْوَرُ الدَّجَّالُ)[2].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتاکو (٣٠) درۆزن پەیدا دەبن و داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن، کۆتایی درۆزنانیش دەجالی کۆرەیە.

جا ژمارە کورت و درێژ هەڵهاتن تەنیا هەر لەم سی کەسەدا نیە، هەروەك لە فەرموودەکانی پێشوو باسمان کرد، بەڵکو مەبەست لە ژمارەی سی ئەوەیە کە تەنیا سی لەوان بانگەوازو دەسەڵاتیان شان و شەوکەت پەیدا دەکا و پەیڕەوکاریان زۆر دەبێ و لە نێو خەڵکدا بەناوبانگ دەبن.

ئەگەر ئێمە چاوێك بە مێژووی ئیسلام بخشێنین دەبینین چەندان کەس پەیدابوون کە داوای پێغەمبەرایەتیان دەکرد، وە هەتا ئێستاکەش چەندان کەس هەن کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن.

هێشتا پێغەمبەر(ﷺ): وەفاتی نەکردبوو چەندین کەس پەیدابوون کە داوای پێغەمبەرایەتیان دەکرد..

**کەمێك لەوانەی کە بانگەشەی پێغەمبەراتیان کرد ئەوانە بوون:**

**یەکەم:** ئەسوەدی عەنسی یەکێ بوو لەو کەسانەی داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد، ئەم کابرایە لە شاری (صەنعاء) سەری هەڵدا، لە ڕێگەی سیحرو جادو و زمان

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ١١٧) برقم: (٥٩٨٥). وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(٢) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (١/ ٣٣٠) برقم: (١٢٣٠)، قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ.

لوسیەوە خەڵکێکی زۆری هەڵخەڵەتان، چونکە دوو شەیتانی هەبوون شتی پەنهایان بۆ دەهێنا یەکیان ناوی( سەحیق) بوو ئەوی تریشان ناوی (شەفیق) بوو، وە توانیشی دەست بەسەر یەمەندا بگرێت، تا دواتر (فەیروزی دەیلەمی) بە هاوکاری ژنەکەی کە ئەسوەدی عەنسی لێی داگیر کردبوو توانیان بیکوژن، لەو کاتەدا سوپای ئیسلام گەیشتە سەریان و خەڵکێکی زۆر لە شوێنکەوتووانی کوژران[1].

تەنانەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەربارەی دەفەرموێ: (إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ ثَلَاثِينَ كَذَّابًا مِنْهُمُ الْأَسْوَدُ الْعَنْسِيُّ صَاحِبُ صَنْعَاءَ، وَصَاحِبُ الْيَمَامَةِ)[2].

واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە نزیکەی (٣٠) درۆزن پەیدا دەبن کە یەکێ لەوان ئەسوەدی عەنسیە خاوەنی شاری (صەنعاء)، وە خاوەنی یەمامەش کە موسەیلەمەی درۆزنە.

ئەو ساتەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایی گەڕایەوەو نەخۆش کەوت ئەم هەواڵەی بیست کە ئەسوەدی عەنسی و موسەیلەمەی درۆزن داوای پێغەمبەرایەتی دەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) بەم نەخۆشیەوە جەیشێکی ئامادەکرد بە سەرکردایەتی ئوسامەی کوڕی زەید(ﷺ) بۆ ئەوەی تەمبێیان بکات، بۆیە فەرمووی : (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا، فَأُوحِيَ إِلَيَّ فِي الْمَنَامِ أَنِ انْفُخْهُمَا، فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا، فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ مِنْ بَعْدِي، فَكَانَ أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيَّ صَاحِبَ صَنْعَاءَ، وَالْآخَرُ مُسَيْلِمَةَ صَاحِبَ الْيَمَامَةِ)[3].

واتە: من نوستبووم لە هەردوو دەستا دوو بازنی زێڕم بینی، زۆر غەمگین دەبێ ئینجا لە خەوەکەیدا وەحی بۆ دێ و پێی دەگوترێ: فوویان لێ بکە، کە فوویان لێ دەکات هەردووکیان دەفڕن و با دەیانبات، جا ئەو دوو بازنە پێغەمبەر (ﷺ) بە دوو درۆزن لێکی دایەوە کە پەیدا دەبن.

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٨٢ .

(٢) المعجم الكبير (١٤/ ٢٦٤) برقم: (١٤٩٠٤).

(٣) صحيح البخاري (٤/ ٢٠٣) باب: علامات النبوة في الإسلام، برقم: (٣٦٢١).

بەرگی یەکەم

پێغەمبەر(ﷺ) پێش ئەوەی وەفات بکات بە چەند ڕۆژێك هەواڵی کوشتنی ئەسوەدی بە هاوەڵەکاندا لەو ڕۆژو سەعاتەی کە تیایدا کوژرا بوو، پاش وەفاتکردنیشی بە (١٠) ڕۆژ ڕاستی هەواڵەکەی گەیشت لە شاری مەدینە[١].

دووەم: موسەیلەمەی درۆزن لە یەمامەوە سەری هەڵدا، بۆ یەکەمجار لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لە گەلەکەی کە بڕوایان هێنا بوو هاتن بۆ شاری مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، دەیگوت:

ئەگەر موحەممەد(ﷺ) دوای خۆی کار بە من بسپێرێ شوێنی دەکەوم، پاش قسەکردن پێغەمبەر(ﷺ) پارچە چیلکەیەکی بە دەستەوە بوو پێی فەرموو:

ئەگەر داوای ئەم پارچە چیلکەیەشم لێ بکەی ناتدەمێ چ جای ئەوەی بتکەم بە جێنشینی خۆم، خۆ ئەگەر لە من هەڵگەڕێیتەوە خوا لە ناوت دەبات.. وە من وادەبینم کە تۆ ئەو کابرایەی کە لە خەومدا پێم نیشان دراوی ئەوا من دەڕۆم چ قسەیەکت هەیە (سابت) لە جیاتی من وەڵامت دەداتەوە[٢].

موسەیلەمە دەیگوت: خوا کردوومی بە شەریکی موحەممەد(ﷺ) لە پێغەمبەرایەتیدا، وە لاسایی قورئانی دەکردەوەو دەیگوت: منیش ئایەتم لەلایان خواوە بۆ دێت، پاشان نوێژی لەسەر خەڵکی لابردو عەرەق خواردنەوەو زیناکردنی بۆ حەڵاڵ کردن و خەڵکێکی زۆریش پێی هەڵخەڵەتان و لە دەوری کۆبوونەوە، جا دەیگوت: منیش وەکو موحەممەد (ﷺ) وەحیم بۆ دێت، خەڵکانێك دەهاتنە لای پێیان دەگوت: ئەی موسەیلەمە خودا کەی ئایەتت بۆ دێنێتە خوارەوە ئەویش دەیگوت: ئەمرۆ نا بەیانی جا شەو و ڕۆژ خەریکی دانان و هەڵبەستنی ئایەت بوو،بەڵام نەیدەتوانی، هەتا لاسایی سورەتی (القارعة)ی دەکردەوەو دەیگوت: (الفيل مالفيل وما أدراك مالفيل).. یان دەیگوت: (ئەی بۆقی کچی دوو بۆقەکە[٣]، بڵێ ئەوەی دەیڵێ نیوەت لە ئاو دایەو نیوەت لە قوڕدایە، نە ئاوەکە

---

(١) أدعياء النبوة الكاذبة، (٢٦ ـ ٢٧). و١٠٠ قصة من نهاية الظالمين، (١٥٠ ـ ١٥١).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، (لا ٨٢ ـ ٨٣) .

(٣) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، محمد بيومي، (لا ٣٠).

شلۆی دەكەیت، نە ڕێگریش لە ئاو خۆرەكان دەكەیت).. یان دەیگوت: (سوێندم بە تۆو چێنەرانی كشتوكاڵ، سوێندم بەو دروێنەرانەی دروێنە دەكەن، سوێندم بەوانەی گەنم گێرە دەكەن، سوێدنم بەو ئاشەوانانەی دانەوێڵە دەهاڕن، سوێندم بەوانەی هەویر دەكەن، سوێندم بەوانەی نان دەكەن، بەوانەی وورده وورده ئاو دەخۆنەوە، سوێندم بەوانەی پارو دەخەنە دەمیانەوە، پاروی بچوك و قەڵەو، ئێوە گەورە كراون لەسەر خاوەن ئاژەڵان، وە دانیشتوانی سەر زەوی لە گەورەییدا پێش ئێوە نەكەوتوون، لادێكەتان بپارێزن، بێ دەسەڵاتان بحەوێننەوە، بەربەرەكانی زۆرداران بكەنەوە[1].

سێیەم: تولەیحەی كوڕی خوەیلیدی ئەسەدی لە سەردەمی پێشەوا ئەبوبەكر لە خێڵی بەنی ئەسەد لە ناوچەی خەیبەر (تولەیحەی كوڕی خوەیلیدی ئەسەدی) كە كاهینێكی بەنی ئەسەد بوو گەلەكەی دوای كەوتبوون و دەیگوت: منیش پێغەمبەرم، ئەو كەسەی كە سروشی بۆ دەهێنایە خوارەوە - وەكو بۆ خۆی دەیگوت - فریشتەیەكەو ناوی (ذا النون) بوو، ئینجا گوتی: (ذا النون) نیە، بەڵكو جوبرائیلە، سەبارەت بە قورئانەكەی (تولەیحە) نەزانراوە، بەڵام ئەو لە نوێژكردنی موسڵمانانداا ڕەخنەی لە كڕنوش بردن دەگرت و دەیگوت: بە پێوە نوێژ بكەن، چونكە پەروەردگار نایەوێت ئێوە ڕووتان بخەنە سەر زەوی، جا خالیدی كوڕی وەلید بە خۆی و سوپاكەیەوە پەلەماری داو شكاندی ئەویش هەڵات و پەنای بردە بەر پاشاكانی (غەسان) لە وڵاتی شام، بەڵام دواتر تەوبەی كردو گەڕایەوەو موسڵمانێكی زۆر باشی لێ دەرچوو[2].

چوارەم: سەجاحی كچی سوەید لە سەردەمی پێشەوا ئەبوبەكر ئافرەتێك بەناوی (سەجاحی كچی سوەید) لە خێڵی (تەغلوب) سەری هەڵدا كە لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدا، وە عەشیرەتی (تەمیم) هەمووی شوێنی كەوتن و دواتر لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن ڕێكەوتن و شووی پێكرد، مارەییەكەشی ئەوە بوو

---

(١) الجزاء من جنس العمل (١/ ٢٨٣ ـ ٢٨٥) و١٠٠ قصة من نهاية الظالمين (١٥٢ ـ ١٥٤).

(٢) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، محمد بيومي، (لا ٣٣).

کە نوێژی عەسری لەسەر خەڵکی هەڵگرت، بەڵام لە سەردەمی موعاویەدا گەڕایەوەو تەوبەیەکی جوانی کردو موسڵمانێکی باشی لێ دەرچوو.

پێنجەم: موختاری کوڕی ئەبو عوبەیدەی ثەقەفی لە سەردەمی (عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر) لە عەشیرەتی (ثەقیف) پیاوێك پەیدا بوو ناوی (موختاری کوڕی ئەبو عوبەیدەی ثەقەفی)بوو، ئەم کابرایە فیتنەیەکی گەورەی نایەوەو دەیگوت: من پێغەمبەرم و نامەکانیشی بە ناوی (موختار پێغەمبەری خوا) مۆر دەکرد، وە پێغەمبەر(ﷺ) ئومەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لەو کەسانەی کە دەڵێن: ئێمە موختارین[1]، کە دەفەرموێ: (يَخْرُجُ فِي ثَقِيفٍ كَذَّابٌ وَمُبِيْرٌ...)[2].

واتە: کەسانێك لە هۆزی ثەقیف دەردەچن کە درۆزن و موبیرن، درۆزنەکە ئەوانە بوون کە داوای پێغەمبەرایەتیان دەکرد وەکو (موختار)، موبیرەکەش حەجاجی کوڕی یوسفی ثەقەفی بوو.

موختار یەکێ بوو لە درۆزنە گەورەکان، تەنانەت پێشەوا ئەبوداود لە ئیبراهیمی نەخەعی دەگێڕێتەوە کە بە عوبەیدەی سەلمانی دەڵێت: وا نابینیت کە موختار یەکێ بێ لە سی درۆزنەکان، جا عوبەیدە دەڵێت: موختار لەسەرە گەورەکانیانە[3].

شەشەم: شاعیری ناوداری عەرەب (موتەنەبی) لە سەرەتای ژیانی لافی پێغەمبەرایەتی لێدا، بەڵام دواتر تەوبەی کردو لە قسەکەی پەشیمان بوویەوە[4].

حەوتەم: بەهبود لە سەردەمی (موعتەمەد) خەلیفەی عەباسی فیتنەی زەنجەکان ڕوویدا کە دەستیان گرت بەسەر باشووری عێراق و خراپەکاریەکی گەلێك زۆریان ئەنجامدا، تەنانەت سەرکردەکەیان کە ناوی (بەهبود) بوو دەیگوت: خودا منی کردووە بە پێغەمبەر، بەڵام من قەبوڵم نەکردووە.

---

(١) فتح الباري (٦/ ٦١٧).

(٢) المعجم الكبير (٢٤/ ١٠٠) برقم: (٢٧١).

(٣) سنن أبي داود (١١/ ٤٨٦) مع عون المعبود.

(٤) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٨٥ .

**هەشتەم:** یەحیای کوڕی زکرویەی قەرمەتی لە سەردەمی (موکتەفا) خەلیفەی عەباسی فیتنەی (قەرامیتە) ڕوویدا، هەتا وای لێهات خەڵکێکی زۆریان گومڕا کردو خراپەکاری و فەسادیەکی زۆریان نایەوە، قەرامیتەکان بیرو باوەڕەکانیان زۆر لە شیوعیەکانی ئەمڕۆ دەچوو، وە یەکێك لە سەرکردەکانیان ناوی (یەحیای کوڕی زکرویەی قەرمەتی)بوو، یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەداو لە دوای خۆشی (حوسەین)ی برای بە هەمان شێوە، وە خاڵێك بە دەم و چاویەوە بوو دەیگوت: ئەمە نیشانەو مۆری پێغەمبەرایەتیە، لە دوای ئەوانیش کوڕە مامەکەیان کە ناوی (عیسای کوری مەهرەویهی) بوو کە لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەداو دەیگوت: (مدثر) کە لە قورئاندا هاتووە ئەوە خودا باسی من دەکات، وە خزمەتکارێکی هەبوو ناوی (المطوق بالنور) بوو، واتە: داپۆشراو بە نور، وە توانی دەست بەسەر بەشێکی زۆری وڵاتی شام بگرێت و خراپەکاریەکی زۆری نایەوە تا لەسەر ئەم ئەقلیەتەی کوژرا[1].

**نۆیەم:** ئەبو تاهیری قەرمەتی لە سەردەمی (موقتەدیر) خەلیفەی عەباسی سەرکردەیەکی تری (قەرمەتی) بە ناوی (ئەبو تاهیری قەرمەتی) بە هەمان شێوە خراپەکاریەکی گەورەی نایەوەو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، تەنانەت لە ساڵی (٣١٧)ی کۆچی پەلاماری کەعبەی داو بەردە ڕەشەکەشی لە شوێنی خۆی هەڵکۆڵی و قەتل و عامێکی زۆری خەڵکی مەککەو حاجیەکانی ئەو ساڵیشی کرد[2].

**دەیەم:** ئیبنو ئەبی عێراق لە سەردەمی (راضی) خەلیفەی عەباسی (موحەممەدی کوڕی عەلی) کەسێك سەری هەڵدا بە ناوی (ئیبنو ئەبی عێراق) کە لافی خوایەتی و زیندووکردنەوەی مردووی لێ دەدا تا دواتر خۆی و کۆمەڵێکی زۆر لە شوێنکەوتوانی کوژران.

**یانزەهەم:** پەیدابوونی کوڕێکی گەنجلە سەردەمی (موطیع) خەلیفەی عەباسی کۆمەڵێك پەیدابوون پێیان دەگوترا (تناسخیە) کوڕێکی گەنجیان تێدا بوو

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٨٥ .

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دەیگوت: ڕۆحی پێشەوا عەلی هاتۆتە لەشم و ژنەکەشی دەیگوت: منیش ڕۆحی (فاطیمە)م کراوە بە بەرداو یەکێکی تریشیان دەیگوت: من جوبرائیلم، دواتر گیران و زۆریان لێدرا تا بە فەرمانی (معز الدولە) ئازاد کران.

دوانزەهەم: پیاوێکی نەهاوەندی لە سەردەمی (مستظهر) خەلیفەی عەباسی لە ساڵی (٤٩٩)ی کۆچی پیاوێك لە دەوروبەری نەهاوەند پەیدا بوو، لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدا، هەندێك خەڵك شوێنی کەوتن بەڵام دواتر گیراو کوژرا[١].

سێنزەهەم: پیاوێك ناوی خۆی کردووە بە (لا) پیاوێك پەیدابوو کە لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەداو ناوی خۆی نابوو (لا) چونکە دەیگوت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي ثَلاَثُونَ كَذَّابُونَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي)[٢].

جا دەیگوت: (لاَ نَبِيَّ بَعْدِي) ئەو لایە بۆ نەفی نیە، بەڵکو مەبەستی لە ناوی منە، واتە: لە دوای من (لا) دەبێت بە پێغەمبەر، چونکە دەیگوت: (لا) مبتدأ (نبي)ش خەبەرەکەیەتی[٣].

چواردەهەم: پەیدابوونی ئافرەتێك لە سەردەمی عەباسیەکان ئافرەتێك لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدا، بەڵام خەڵکێکی زۆر پێیان گوت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (لا نبي بعدي) واتە: لە دوای من هیچ پێغەمبەرێك نایەت، باشە تۆ چۆن ئیعلانی پێغەمبەرایەتی دەکەی؟ ئەویش دەیگوت: نەیفەرمووە: (لا نبية بعدي) واتە: مەبەستی لە پێغەمبەری پیاو بووە نەك ئافرەت[٤].

پێشەوا غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئوممەتی ئیسلام لە ڕێگەی ئیجماعەوە لەوە گەیشتووە کە واتای (لا نبي بعدي) بەڵگەی ئەوەیە

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٨٦ .

(٢) سنن الترمذي (٨/ ٤٢٦) باب: ما جاء لا تقوم الساعة حتى، برقم: (٢٣٨٠).

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٨٦ .

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەشی یەکەم

که هەرگیز هیچ پێغەمبەرێك و هیچ پەیامدارێك دوای ئەو نایەت، ئەمەش نە (تەئویل) و نە (تەخصیص) هەڵناگرێت، ئەوەی نکوڵی لەمەش بکات نکوڵی لە ئیجماعی ئوممەتی ئیسلامی دەکات.

**پانزەهەم:** ئیبنو سەبعین ئەم پیاوە دەیگوت: دەرگای پێغەمبەرایەتی کراوەیەوەو ناکرێت دابخرێت، وە دەیگوت: دەستەواژەی (لا نبی بعدی) هاتووە، نەك (لا نبی عربی بعدی)، بەمە دەیویست ببێ بە پێغەمبەر، باسیش لەوە دەکات کە چووە بۆ ئەشکەوتی حەڕا تا سروشی بۆ دابەزێت[1].

**شانزەهەم:** میرزا غولام ئەحمەد لە کۆتایی سەدەی ڕابردوو چەند کۆمەڵێکی سەر لێ شێواو پەیدا بوون کە سەرکردەکانیان لافی پێغەمبەرایەتیان لێ دەدا، وەکو قادیانییەکان کە سەرکردەکەیان ناوی (میرزا غولام ئەحمد)[2] بوو، خەڵکی وڵاتی هیند بوو دەیگوت: من پێغەمبەرم و لە لایان خواوە وەحیم بۆ دێت و مزگەوتەکەشی ناو نابوو (مسجد الأقصی)، وە گوندەکەشی ناونابوو (مکە المسیح) تا لە ساڵی (١٣٢٦)ی کۆچی خوای گەورە بە دەردی سکچوون لەناوی بردو لە سەر ئاو ڕۆحی دەرچوو[3]..

قادیانیەکان پێیان وایە (میرزا غولام ئەحمەد) یەکێکە لە نوێکەرەوەکان، وە لە خواوە ئیلهامی بۆ دێت، پاشتر ڕایگەیاند مەسیح و مەهدی چاوەڕوان کراوە، پاش ئەوەی بۆی نەچووە سەر کە خۆی بکات بە پێغەمبەر عیسا یان مەهدی،

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) (میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی) لەساڵی ١٢٦٥ی کۆچی لە قادیان لە دایك بووە، لە گوندێکی (بنجاب) لە وڵاتی هندستان، خەڵکی هیندستان شۆڕشیان کرد دژی ئینگلیز، وە موسڵمانان لە پشت شۆڕشەکەوە بوون، ئینگلیز لە ساڵی ١٨٥٧عیسایی شۆڕشەکەی کپ کردەوە، پاشان لە ساڵی ١٨٦٩ عیسایی حکومەتی بەریتانی کۆمەڵێ شارەزای ناردە هیندستان کە دیراسەی باروزروفەکە بکەن، ئەوانیش دیراسەیەکی باشیان کردو پاشان راپۆرتیان نوسی کە چارسەر ئەوەیە کەسێك دروست بکەن بەناوی ئیسلامەوە کاریان بۆ بکات، بۆ ئەمەش پاش گەڕانی زۆر (میرزا غولام ئەحمەد)یان دۆزیەوە کە بەو کارە هەستێت و هەموو هاوکاریەکیشیان کرد.

(٣) صحیح أشراط الساعة الصغری والکبری، لا ٦١.

ڕایگەیاند کە خوا پێغەمبەر موحەممەد جارێکی تر لە کەسایەتی میرزا غولامدا ناردۆتەوە[١].

بانگەشەیان دەکرد بۆ نەهێشتنی جیهادو گوێڕایەڵی کوێرانە بۆ حکومەتی ئینگلیز کە لەو کاتەدا هیندیستانیان داگیر کردبوو، گوایە ئینگلیز وەلی ئەمری موسڵمانانە[٢].

زانایانی ئیسلام لە هیندستان ڕووبەڕووی بونەوە وەك شێخ (ئەبو وەفا) کە مونازەرەی کرد لەگەڵ (میرزا غولام) داو ئیقامە حوججەی لەسەر کرد، دواتر میرزا غولام داوای موباهەلەی[٣] کرد کە خوا ئەوەی درۆزنە لەناوی بەرێت، خوای گەورەش میرزا غولامی دوای چل ڕۆژ بە نەخۆشی کولێرە لەسەر ئاو کوشت، ئەمەش لە ساڵی ١٩٠٨ عیسایی[٤].

---

(١) ئەم کۆمەڵە سەرگەردانە، بیرو ڕایان وایە( تەناسوخ الارواح) هەیەو بیرو ڕایان لە بارەی خواوە نادروستەو هاوەڵانی خۆی بە (صەحابە) دادەناو دەیگوت: حەجی گەورە ئەوەیە کەسێك بچێت بۆ قادیان و ئەمە بێجگە لەوەی عەرەق و تلیاك و گۆشتی بەرازی حەڵاڵ کردبوو.

(٢) أنوار خلافت، بشیرەدین، لا ٦٥.

(٣) موباهەلە: واتە داواکردنی نەفرەت و سزای خوا بۆ سەر درۆزنان.. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە وەفدی نەجرانی مەسیحیەکان کاتی خۆی هاتن بۆ مەدینەو پێیان دادەگرت لەسەر بیروباوەڕە هەڵەکان لەبارەی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێ بێت).

(٤) میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی لەگەڵ سەرۆکی زانکۆی دیوبەندی (شێخ موفتی محمود الحسن) ڕوبەڕوو بوونەوە بە ئامادەبوونی لایەنگرانی هەردوولا، میرزا غولام جەختی کردە سەر ئەوەی کە (خاتم النبیین) واتە: چاکترین پێغەمبەرو واتای وانیە کە کۆتایی هاتووەو خەتم بووە، هەر چەندە شێخ موفتی محمود حەسەن فەرمودەی هێنایەوە بۆ وەڵامدانەوەی، میرزا غولام بە فەرموودەکە قایل نەدەبوو بە بیانووی ئەوەی ئەو فەرموودەیە خاتوو عائیشە ریوایەتی کردووەو ئەویش لەبەر ئەوەی ئافرەتە شایەتیەکەی بە یەکێك حسابە.. هەرچی لەگەڵ وت سوودی نەبوو، بۆ شەو زانایانی زانکۆی دیۆبەند کۆبونەوەو راوێژیان کرد کە کێ باشە بۆ دەمکوتکردنی ئەو تاوانبارە درۆزنە؟!

ڕایان هاتە سەر ئەوەی کە شێخ ثناءالله باشە، کە کاتی خۆی لای ئەمان قوتابی بووەو لەبەر زۆر موناقەشەکردن و جورئەتی زۆری لە زانکۆ دەریان کردبوو، وە بڕوانامەیان نەدابوویە.

میرزا بەشیرەدین مەحمودی کوری میرزا غولامی ئەحمەدی قادیانی کە لەپاشاندا بوو بە خەلیفەی دووهەمی باوکی لە کتێبەکەیدا بەناوی (أنوار خلافت) دەڵێ: ئەگەر خەڵکی شمشێریش بخەنە سەر گەردنم و داوای ئەوەم لێ بکەن بڵێم: دوای موحەممەد هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت، دەڵێم ئێوە درۆزنن، نەك ئەوە دروست نیە پێغەمبەری تر نەیەت، بەڵکو دەبێ چەندان پێغەمبەری تریش بێت[1].

---

شیخ ثناء الله دەڵێت: سەرۆکی زانکۆ ناردی بەدوامدا بۆ ئەوەی ڕوو بەڕووی میرزا غولام ببمەوەو ئیقامە حوججەی لەسەر بکەم، منیش گوتم باشە، بەڵام بەو مەرجەی کە ئەگەر سەرکەوتم بەسەریا بڕوانامەی زانکۆکەتانم بدەنێ، ئەویش ڕازی بوو، بۆ بەیانی فیلێکیان هێناو ویستیان جەنابی موفتی سەرکەوێ، وە هەموو ئەوانی تریش بەدەوریا بن و بەیەکەوە بڕۆین بۆ شوێنی موناقەشەکە، وەك ڕێزلێنانێك لەو زانایە، من قایل نەبووم، گوتم: من سواری فیلەکە دەبم، بەو جۆرە من لەسەر فیلەکە بوم و موفتی و هەموو زانایانیش لەدەورم بوون و چووین بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەکەو هەموانیش هوتافیان دەکێشا بۆ هاندان و تەشجیع کردنم.

ئینجا کەوتینە موناقەشە لەسەر (خاتم النبيين) ئەو هەمان قسەی کردو منیش هەمان فەرموودەکانم پێگوت کە خاتوو عائیشە ڕیوایەتی کردووە، ناوبراو قەناعەتی نەکرد؟! بۆیە گوتم: کەوایە پرسیارێکت لێدەکەم؟ گوتی: فەرموو! گوتم: تۆ کوڕی باوکت نیت؟! تووڕە بوو گوتی: چۆن گومان لە نەسەبم دەکەیت و دایکم تاوانبار دەکەی؟ گوتم: من تاوانبارت ناکەم، بەڵام بەڵگەیەکم بەرێ کە تۆ کوڕی باوکتی!؟ گوتی: دایکم دەڵێ من کوڕی باوکمم، گوتم: دایکت تاقە ئافرەتێکەو بەو پێو دانگەی تۆش بێت شەهادەتەکەی یەکێکەو وەرناگیرێ، ئینجا گوتم: ڕەوایە دایکت ڕاست بکات و عائیشەی دایکی موسڵمانان ڕاست نەکات! بەمە میرزا غولام دەمکوت بوو نەیدەزانی چۆن ڕزگاری بێت، ئیتر بوو بە (الله اکبر)، بەو جۆرە خوا شکاندی و ڕیسوای کرد، دوای ئەوەش لەو گۆڤارەی کە هەفتانە دەرمان دەکرد هەموو قسەو بیرو بۆچونە سەقەتەکانی ناوبراوم هەڵدەوەشاندەوە، بەمەش میرزا غولام بێتاقەت بوو، نەیدەتوانی وەڵامم بداتەوە، ناچار نامەیەکی بۆ ناردم لە (١٩٠٨/٤/١٥)و داوای موباهلەی کرد، شێخ ثناءالله ش بەمە ڕازی بوو کە خوا درۆزن لەناو بەرێ، خوا دوعاکەی گیرا کردو پاش چل ڕۆژ لە (١٩٠٨/٥/٢٥) میرزا توشی نەخۆشی کولێرە بوو لەسەر ئاو گیانی دەرچوو، دوای ئەویش شێخ ثناء الله چل ساڵی تر ژیاو خزمەتی ئیسلامی کردو لە ساڵی (١٩٤٨) وەفاتی کرد.

(١) أنوار خلافت، بەشیرەدین، لا ٦٥.

بەرگی یەکەم

حەڤدەهەم: حوسەینی کوڕی عەلی کوری میرزا عەبباس لە ساڵی (١٢٣٣) ی کۆچی لە تارانی ئێران لە دایك بووە، ئەم کابرایە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد کە بە (بهاءالله) دەناسرا، وە شوێن کەوتوانیشی پێیان دەوترێ بەهائی، تا لە ساڵی (١٣٠٩) ی کۆچی لە شاری عەککای فەڵەستین مرد[١].

هەژدەهەم: محەممەد مەحمود طە لە سەرەتای هەشتاکان پیاوێك لە سودان بەناوی (محەممەد مەحمود طە) بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکردو بە هۆی نوسین و وتارەکانیەوە خەڵکێکی زۆری گومرا کرد، تا لە ساڵی (١٩٨٥) عیسایی حکومەتی سودان لە سێدارەی دا[٢].

نۆزدەهەم: سەهرەوەری دەڵێت: نامرم تا پێم بوترێت (قم فأنذر) کاتێك قسەی بۆ تەلمەسانی کرد کە وتەی ئیبنو عەرەبی لە (فصوص الحکم)دا پێچەوانەی قورئانە، پێیگوت: هەموو قورئان شیرکەو یەکتاپەرستی لە قسەی ئێمە دایە، کاتێکیش پێی گوترا ئەوەی لە کتێبی (موافق النضري) هاتووە پێچەوانەی قورئان و سوننەت و ئیجماعە، وەڵامی دایەوەو گوتی: ئەگەر ئەوەی دەتەوێ بێتە دی واز لە قورئان و سوننەت و ئیجماع بهێنێ.

بیستەم: پیاوێکی سوودانی لە پەنجاکان کابرایەك لافی پێغەمبەرایەتی لێدا لە سودان، زانایان کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵیداو گوتیان: چۆن تۆ دەڵێی من پێغەمبەرم و قورئانیش دەفەرموێ: [ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ] کابرا گوتی: من (نبی) نیم، بەڵکو من (رسول)م! گوتیان: کەس نابێتە (رسول) تا پلەی (نبی) نەبرێت، وەك چۆن قوتابییەك تا قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی نەبرێت ناچێتە زانکۆ، لەگەڵ ئەوەشدا باشە تۆ کە (رسول)ی چیت بۆ هاتووە؟ ئەگەر ئیسلامە ئەوە تۆ ئەم ئایەتە بەدرۆ دەزانی کە دەفەرموێ: [ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ

---

(١) أشراط الساعة، ماهر أحمد الصوفي، لا ١١٦.

(٢) أشراط الساعة، ماهر أحمد الصوفي، لا ١١٥ .

ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا ][1]. خۆ ئەگەر ئەو شتەش بۆت هاتووە، دینێکی ترە جگە لە ئیسلام ئەوە خوای گەورە دەفەرموێ: [ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ]. یەکێك لەو زانایانەی کە موناقەشەی ئەم کابرایەی کرد (شێخ عبدالحمید کوشك) بوو کە ساڵی ١٩٩٦ کۆچی دوایی کرد، ئینجا کابرا بەخۆیدا چوویەوەو پەشیمانی دەربڕی[2].

بیست و یەك: پیاوێکی میسری لە هەشتاکان کابرایەك لە میصر بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، زانایانی زانکۆی ئەزهەریش بانگیان کرد بۆ موناقەشەکردن لەگەڵیدا کەوتنە گفتوگۆ، سەیریان کرد کابرا نیوە شێتێکەو هەروا سواری سەری خۆی دەبێت و گوێ بۆ بەڵگەو موناقەشە ناگرێت و گاڵتەی بە شەرع و عەقڵ دێت، بۆیە زانایەکیان گوتی: بیخەنە ئەو حەوزەو دارکارییەکی باشی بکەن، کە خستیانە ناو حەوزەکەو بەدار هاتن پیایدا تۆبەی کردو پەشیمان بوویەوە و داوای لێبوردنی لێدەکردن[3].

پێشەوا تەحاوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) کۆتا پێغەمبەرەو پێشەوای خواناسانەو سەرداری پێغەمبەرانەو خۆشەویستی خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەو هەر کەس لافی پێغەمبەرایەتی دوای ئەو لێبدات ئەوە ڕێگەی گومگردووەو شوێن ئارەزووی خۆی کەوتووە[4].

پێشەوا ئیبنو حەزمی ئەندەلوسی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: وەحی کۆتایی پێهاتووە لەو ڕۆژەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کردووە، بەڵگەش ئەوەیە کە وەحی بۆ سەر پێغەمبەران دێت، خوای گەورە دەفەرموێ: [ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ] .

---

(١) سورة المائدة.

(٢) قادیانیەت، ئیکرام کەریم، (لا ١٧٩ ـ ١٨٠).

(٣) قادیانیەت، ئیکرام کەریم، (لا١٨٠).

(٤) شرح العقيدة الطحاوية، أبي العز الدمشقي، (لا ١٣٩ ـ ١٦٧).

پێشەوا ئیبنو جەریری تەبەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) کۆتایی بە پێغەمبەران هێناوە، خەتمی نبوەتی کردووەو مۆری لێداوەو دوای ئەو ناکرێتەوە بۆ هیچ کەسێکی تر تا ڕۆژی دوایی دێت.. وە ئەگەر (خاتِم) بە (ژێر) بخوێنرێتەوە یانی ئەو خەتمی کردوون، ئەگەر بە (سەر) بخوێنرێتەوە یانی خۆی کۆتا پێغەمبەرە[1].

پێشەوا شەوکانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: تێکڕای زانایان وشەی (خاتم) بە (ژێر) دەخوێننەوەو (عاصم)یش بە (سەر) دەیخوێنێتەوە، واتای خوێندنەوەی یەکەمیان ئەوەیە کە: ئەو کۆتایی پێ هێناون و لە دوای هەموویانەوە هاتووە، واتاو خوێندنەوەی دووەمیش ئەوەیە وەك موسیلەی دەستی پێغەمبەران وایە مۆری شتی خۆیانی پێ دەکەن و شانازی بەوە دەکەن کە ئەویش (واتە: پێغەمبەری ئیسلام) لە ئەوانە.

پێشەوا عەلائەددینی بەغدادی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: [وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـنَ] واتە: خوا پێغەمبەرایەتی مۆرکردووە دوای ئەو ئیتر پێغەمبەری تر نایەت.. [وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمًا]. واتە: ئەم پێغەمبەر نەناردنەش دوای ئەو لەناو زانستی خوا دایە[2].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم ئایەتە دەقێکی صەریحە کە دوای پێغەمبەر(محمد) پێغەمبەری تر نایەت، کەواتە باشترە کە پەیامدارێکیش نەیەت، چونکە پلەی پەیامداری تایبەتترە لە پلەی پێغەمبەری، چونکە هەموو پەیامدارێك پێغەمبەرەو پێچەوانە نابێتەوە[3].

مەلا عەلی قاریء (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: [وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـنَ] کە (عاصم) بە (سەر) خوێندوویەتیەوە واتاکەی دەبێتە (کەرەسەی مۆرکردن و کۆتایی پێهێنانەکە) واتە: بەو مۆرە کە کراوە وەك چۆن مۆر ئەدەی لە شتێك کە کۆتایی پێدێنی، مەبەستەکەش ئەوەیە: پێغەمبەر(محمد) کۆتا پێغەمبەرەو بە ئەو کۆتایی هێنراوە بە پێغەمبەران، هەندێکی تر بە (ژێر) وشەی (خاتم) دەخوێننەوە، واتە: ئەو کارەکەی کردووەو کۆتایی بە پێغەمبەران هێناوە.. ئیتر

---

(١) مختصر تفسير الطبري، ندوة الشباب الإسلامي، (لا ٤٢٣١).

(٢) تفسير الخازن، (لا٤٧١ ـ٤٧٢).

(٣) تفسير القرآن العظيم، (٣/٤٩٣).

زانایانی ئوممەتەکەی بوونەتە میراتگری پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕووی دەسەڵاتەوەو میراتی پێغەمبەرایەتی کۆتایی هاتووە بە خەتمکردنی ئەو، ئەوەش زیان ناگەیەنێ کە ئەو چۆن کۆتایی پێغەمبەرەو عیساش دوای ئەو دادەبەزێ، چونکە واتای (دوایەمین پێغەمبەر) هەڵناوەشێتەوە، لەبەر ئەوەی دوای ئەو کەس نابێتە پێغەمبەر، وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) بە عەلی فەرمووی: (أَنْتَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى، إِلَّا أَنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي)[١]، عیساش پێش ئەو بووەتە پێغەمبەرو کە دێتە خواریش بۆ جێبەجێکردنی شەریعەتی (محمد) دادەبەزێت، لە نوێژدا ڕوو دەکاتە قیبلەکەی ئەو وەك ئەندامێکی ئوممەتەکەی ئەو هەڵسوکەوت دەکات و نە (وەحی) بۆ دێت و نە یاسای تازە دادەمەزرێنێت، بەڵکو دەبێتە خەلیفەی پێغەمبەری خوا (محمد).

پێشەوا جەلالەددینی سیوتی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: خوا ئاگادارە بەوەی دوای (محمد) پێغەمبەری تر نایەت و پێغەمبەر عیساش (سەلامی خوای لێ بێ) کە دێتە خوارەوە بە شەریعەتەکەی ئەو کاردەکات[٢].

پێشەوا فەخرەددینی ڕازی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: واتە: کۆتایی بە پێغەمبەران هێناوە، چونکە ئەو پێغەمبەرەی دوای پێغەمبەرێکی تر دێت بۆ ئەوە دێت ئامۆژگاریەك و ڕوونکردنەوەیەك کە پێغەمبەری پێش خۆی نەیکردووە ئەم بیکات، بەڵام ئەو پێغەمبەرەی کە دوای ئەو پێغەمبەری تر نایەت ئەوە دیارە لە هەموو کەسێکیتر بەرەحمەتترو بەرچاوو ڕوونترە[٣].

سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەر خوایە هەرچی شەریعەت هەیە دایدەبەزێنێتە سەر پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی ئیتر دوای ئەم مرۆڤایەتی هەموو لەسەر ئەوە بڕۆن و پەیڕەوی لە کۆتایی پەیامی ئاسمان بکەن کە هاتووەتە سەر زەوی، ئەو پەیامەی کە نەگۆڕانکاریی تێدا دەکرێت و نەبەدیلیشی دەبێت[٤].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٨٧٠) باب: من فضائل علي بن أبي طالب، برقم: (٢٤٠٤).
(٢) تفسير الجلالين، (لا٧٦٨).
(٣) التفسير الكبير (٥٨١/٦).
(٤) في ظلال القرآن، سيد قطب (٥/ ٢٧٨٠).

بەرگی یەکەم

دکتور وەهبە زوحەیلی دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (محمد) باوکی شەرعی و ڕاستەقینەی زەید نیەو زەیدیش کوڕی ئەو نیە تا حەڵاڵ نەبێت بۆی ژنەکەی بخوازێت.. ئەو ڕاستیەش دەسەلمێنێ کە (محمد) پێغەمبەری خوایەو کۆتاییشی بە پێغەمبەران هێناوە.. ئەم بەڵگەیەش ئەوە دەسەلمێنێ کە نە پێغەمبەرو نە پەیامبەری تر دوای (محمد) نایەت، بۆ پتەوکردنی زیاتری ئەمەش چەندین فەرمودەی (موتەواتیر) لە پێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە.. (پاشان پێنج شەش فەرموودە دێنێت لە بوخاری و موسلیم و ئەحمەد).. ئەمەش وەڵامێکی کاریڕە بۆ هەموو ئەوانەی لافی پێغەمبەرایەتی لێدەدەن.

پێشەوا ئالوسی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەبەست بە پێغەمبەر گشتی ترە لە پەیامبەر، کە پێغەمبەر(ﷺ) کۆتایی بە پێغەمبەران هێنابێ، ئەو دیارە کۆتاییشی بە پەیامبەرانیش هێناوە، ئامانجیش لەوەدا کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆتا پێغەمبەرە، وە سیفەتی پێغەمبەرایەتی بچڕاوەو ئیتر دوای ئەو هیچ کەسێك لە (ئینس و جن) بۆی نیە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات، لەبەر ئەوەی سیفەتی کۆتا پێغەمبەر بڕاوە بە باڵای پێغەمبەر(محمد).. مەسەلەی کۆتا پێغەمبەری (محمد) شتێکە قورئان بە ئاشکرا دەفەرموێت و فەرمودەش بە ڕوونی دەریبڕیوەو ئوممەتی ئیسلامیش یەکدەنگن، هەرکەسیش پێچەوانەی ئەمە ڕابگەیەنێت کافر دەبێت و دەکوژرێت ئەگەر بەردەوام بێت لە پڕوپاگەندەکانی[1].

هەر کەسێك سەیری ئەم زانایانە بکات بۆی دەردەکەوێت کە هەریەکەیان خەڵکی شوێنێك و خەڵکی سەردەمێکن و هەر هەموشیان پێش سەردەمی میرزا غولام بوون و کەسیان ئاگایان لە میرزا غولام و هاوشێوەکانی نیە تا بوترێت لە وەڵامی ئەودا گوتویانەو نکوڵی کردووە لە پێغەمبەرایەتیەکەی ئەو، زیادکردنی قسەی شەهید سەید قوتب و دکتۆر وەهبە زوحەیلیش هەر بۆ ئەوە بوو کە دەربیخەین کە زانایانی ئیسلام لەسەدەی یەکەمەو تا سەدەی چواردەهەم لە هەموو سەردەمەکان و لەهەموو هەرێمەکانیشدا گشت ئیجماعیان لەسەر ئەوە هەیە کە واتای [وَخَاتَمَ

---

(١) روح المعاني، (٢٢/ ٣٢ ـ ٣٩).

ٱلنَّبِيِّـنَ ] بریتیە لەوەی پێغەمبەر (محمد) ئەو پێغەمبەرەیە کە هیچ پێغەمبەرێکی تر بەدوایدا نایەت و ئەم عەقیدەی خەتمی نبوەتەش بەڵگە نەویستە لای هەموو موسڵمانێك و دوانیان نیە لەوەدا جیاوازییان هەبێت، لەسەر ئەوەش هەموو یەکدەنگن کە هەر کەسێك لافی پێغەمبەرایەتی لێبدات و بڕوای پێ بکات و شوێنی بکەوێت دوای پێغەمبەری ئیسلام ئەوە کافرەو لە دینی ئیسلام دەچێتە دەرەوە.

پێشەوا شەهرستانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەر کەسێك بڵێ پاش موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەرێکی تر جگە لە عیسای کوڕی مەریەم دێتە ناو خەڵکی ئەوە دوو کەس نیە جیاوازییان هەبێت لە کافری ئەو کەسەدا[1].

پێشەوا زەمەخشەری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر بڵێی باشە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) کۆتا پێغەمبەرە کەچی دوای ئەویش پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) دێتە خوارەوە، دەڵێم: کە ئەوتریّ کۆتا پێغەمبەرە، واتە: دوای ئەو کەس نابێت بە پێغەمبەر، عیساش پێش ئەو بووەتە پێغەمبەرو کاتێکیش دێتە خوارەوە کار بە شەریعەتی موحەممەد (ﷺ) دەکات و ڕوو دەکاتە قیبلەی ئەو لە نوێژداو وەك یەکێکی ئوممەتی ئیسلام هەڵسوکەوت دەکات[2].

پێشەوا بەغەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: خوای گەورە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆتایی بە پێغەمبەرایەتی هێناوە، ئەو دوایین پێغەمبەرە.. لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە ڕیوایەت کراوە کە خوای گەورە بڕیاری داوە دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێك نانێرێت[3].

پێشەوا قازی عیاز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: هەر کەسێك لافی پێغەمبەرایەتی لێبدات بۆ خۆی یان لای وابێت ئەتوانرێت پێغەمبەرایەتی دەست بخرێت بە ڕێگەی پاككردنەوەی دڵ وەك فەیلەسوفەکان دەیڵێن، هەر

---

(١) الملل والنحل، (٣/٣٤٩).

(٢) الكشاف، الزمخشري (٣/ ٤١٥).

(٣) معالم التنزيل، (٣/١٥٨).

کەسێك لافی ئەوەی لێدا کە (وەحی) بۆ دێت با لافی پێغەمبەرایەتیش لێنەدا.. هەموو کافرن و پێغەمبەر(ﷺ) بە درۆزن دەزانن لەوەدا کە هەواڵی داوە کە فەرمویەتی: تۆ دوایەمین پێغەمبەری و تۆم بۆ هەموو خەڵکی دونیا ناردووەو ئیّ خۆ ئوممەتی ئیسلامیش مانای ئەم قسەیە بەوە دەکەن کە لەڕاستیدا وەهایەو چەمك و مەبەستی ئەو قسەیە ئەوەیەو نە (تەئویل) و نە (تخصیص) هەڵناگرێت، بۆیە گومان لە کافرێتی هەموو ئەوانەدا نیە کە باسمان کردن و بەڵگەش ئیجماع و دەفقەکانی شەریعەتە[١].

پێشەوا بەیزاوی (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) دەڵێت: واتە: کۆتایینی پێغەمبەرانە کە بە ئەو کۆتاییان هاتووە، وە هاتنە خوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم جارێکی تر دوای خۆی ئەم مەسەلەیە ناخاتە ژێر پرسیار، چونکە عیسای کوڕی مەریەم کە دێتەوە لەسەر دینی ئەو دەڕوات[٢].

پێشەوا ئیبنو نەجیم (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ) دەڵێت: هەرکەسێك دان بەوەدا نەنێت کە پێغەمبەر(محمد) دوایەمین پێغەمبەرە ئەوە موسڵمان نیە، چونکە ئەمە یەکێکە لە شتە پێویستەکان.

لە (الفتاوی العالمکیریە) کە ژمارەیەکی زۆر لە گەورە زانایانی هیندستان دایانناوە لە سەدەی (دوانزەی کۆچیدا) دەڵێت: ئەگەر کەسێك گوتی: (من پێغەمبەرم) واتە: من پەیام دەهێنم ـ ئەوە کافر دەبێت.

پێشەوا ئەبو ئەعلای مەودودی (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) دەڵێت: هەموو خوێنەوارێك کە چاوی ببێت بۆی ڕۆشن دەبێتەوە کە تا چەندێك دروستە کە واتای [وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ] بە پێچەوانەی بنەماکانی ڕێزمانی عەرەبی و زاهیری دەستەواژە قورئانیەکەو سیاقی ئایەتەکەو هەموو ئەو فەرموودانەی پێغەمبەرە(ﷺ)، هاوەڵانی بەڕێزیش هەموو یەکدەنگن لەوەداو لەناو زانایانی ئیسلامیش دوانیان دوو قسە ناکەن و هەموو یەك قسە دەکەن لە هەموو پارچەکانی زەوی و هەموو سەردەمە

---

(١) الشفاء (لا ٢٧٠ ـ ٢٧١).

(٢) أنوار التنزيل، (٤/ ١٦٤).

جیاوازەکانیش، ئیتر چۆن دروستە یەکێك لەولاوە بێت و دەرگای پێغەمبەرایەتی بکاتەوەو لافی پێغەمبەرایەتی لیٚ بدات[1].

شێخ (ئیحسان الهی ظهیر) دەڵێت: هەموو ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە پێغەمبەری خوا (محمد) کۆتا پێغەمبەرەو دوای ئەو پێغەمبەرێکی تر نایەت و هەر کەسیش لافی پێغەمبەرایەتی لێبدات لە دوای ئەو ئەوە یان درۆزنە یان شێتە،چونکە لەم مەسەلەیەدا نە لەناو (سلف) نە لەناو (خلف)دا دوو کەس جیاوازییان نیە[2].

کاك ئەحمەدی موفتی زادە(ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەڵێت:

خوای موتەعال کە قورئانی کردووەتە کۆتا پەیام بۆ بەشەرییەت تەواوی ئیمکاناتە ڕۆحیەکانی تێدا داناوە وەك چۆن زەوی خستۆتە ئیختیاری ئەم بەشەرەو تەواوی ئیمکاناتە مادییەکانی ئەم بەشەرەی تێدا داناوە، بۆیە نە ئیحتاج بە پەیامێکی تری ئاسمانی هەیەو نە ئیحتاج بە پێغەمبەرێکی تریش هەیە.. وە ئەم پێغەمبەرە لەندەنیانە (مەبەست پێی میرزا غولامی قادیانی و بەهائوڵای ئێرانیە) تەنیا بۆ ئەوە دانراون تا جیهاد نەهێڵن لەناو موسڵماناداو دوژمنانی دین جێگەی خۆیان گەرم بکەن لەناو وڵاتانی ئیسلامی و کەس لێیان تێك نەدات[3].

بەم شێوەیە ژمارەی ئەو درۆزنانەی کە لافی پێغەمبەرایەتی لێدەدەن و ناوبانگ دەردەکەن خۆی لە (٣٠) کەس دەدات و، وە کۆتاییەکەشی مەسیحی دەجالە.

---

(١) القادياني والقاديانية، أبو الحسن الندوي، ل١٣٩.

(٢) القادياني والقاديانية، احسان الهي ظهير، ل ٤٤٦ .

(٣) قادیانیەت، ئیکرام کتریم، ل ١٧٦ ـ ١٧٧.

بەرگی یەکەم

# ئازادکردنی مزگەوتی (ئەقصا)

لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئازادکردنی مزگەوتی ئەقسایە لە ژێر ستەمی جوولەکەو خاچ پەرستەکان..

پێشەوا عەوفی کوری مالیك (ﷺ) دەڵێت: لە شەڕی تەبووك چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کەوا لە ژێر خێوەتێکی چەرمدا بوو، فەرموی: (اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَوْتِي ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ..)[1].

واتە: شەش شتان بژمێرە لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی: مردنی من، واتە: پێغەمبەر(ﷺ) پاشان ئازادکردنی بەیت و لمەقدیس.

مزگەوتی (بيت المقدس) دوو جار ئازاد کراوە تاوەکو ئێستا:

**یەکەم:** لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ).

**دووەم:** لەسەردەمی صەلاحەدینی ئەیوبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

## یەکەم: لە سەردەمی عومەڕی کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ)

شاری قودس ئازاد کرا لە ساڵی (١٦)ی کۆچی لە سەردەمی عومەری کوری خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ).

ئەو کاتەی کە عومەری کوری خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) چەند سەرکردەیەکی سوپای موسڵمانانی نارد بۆ لای (بتریارك سەقەر یوس) پادشای شاری قودس بۆ ئەوەی کلیلی ئەو شارە بداتە دەست موسڵمانەکان، بەڵام

---

(١) صحيح البخاري (٤/ ١٠٢) كتاب: الجزية والموادعة، باب: ما يحذر من الغدر، برقم: (٣١٧٦).

(بتریارك سەقەر یوس) کە سەیری ئەو سەرکردانەی وەکو (عەمرِی کوری عاص) و (شەرحەبیلی کوڕی حەسەنە) و (ئەبا عوبەیدەی جەراح)و چەندانی دیکەشی کرد گوتی: من کلیلی شاری قودس نادەمە دەست ئێوە، چونکە ئێمە لە کتێبی پیرۆزی خۆماندا خوێندومانەتەوە کە شاری قودس ئازاد دەکرێ و کلیلی شار دەدرێتە سەرکردەی موسڵمانان، کە چەند نیشانەیەکی پێوەیە، بەڵام وەکو سەیر دەکەم ئێوە هیچتان ئەو نیشانانەتان پێوە نیە، بۆیە ناتوانن کلیلی ئەو شارەمان لێ وەربگرن[١].

دوای ئەوەی کە ئەو سەرکردانە بۆیان دەرکەوت کە پادشای قودس وا بە سادەیی و ئاسانی کلیلی شاریان ناداتێ، بە ناچاری نامەیەکیان بۆ پێشەوا عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) نوسی: ئەمەش دەقی نامەکەیە:

ئەی خەلیفەی موسڵمانان لەبەر ئەوەی کە فەرمانی تۆمان پێ نەبوو بۆ ئەوەی جەنگ و شەڕ بەرپا بکەین، پادشای شاری قودسیش کلیلی شاری نەداینێ، هیواداریین بە گەیشتنی ئەو نامەیە فەرمانی جەنگمان پێ بدەی بۆ ئەوەی بە جەنگ شاری قودس وەربگرین، یان تەشریفت بفەرمووی بۆ لامان بێیت..

کاتێك نامە گەیشت و خوێندرایەوە پێشەوا عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) خۆی ئامادەی سەفەر کردو لەگەڵ غولامێکیدا، تەنها حوشترێکیان پێ بوو کەوتنە ڕێ سەرۆکی موسڵمانان و خزمەتکار بە نۆبە سواری حوشترەکە دەبوون، نۆبەیەکی پشوویان دەدایە حوشترەکە بە بەتاڵی ڕایان دەکێشا هەتا گەیشتنە نزیك سنووری شام، کاتێك گەیشتن (ئەبو عوبەیدە) و چەندانی دیکەش لە هاوەڵەکان پێشوازیان لێکردن، لە دوای ماوەیەك ڕۆیشتن کەوتنە ناو قوڕو زەلکاوێکەوە، لەو کاتەدا نۆبە سواری غولامەکە بوو پێشەوا عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێ) ڕێشمەی حوشترەکەی ڕادەکێشا (ئەبا عوبەیدە)ش گوتی: ئەی خەلیفەی موسڵمانان تۆ لێپرسراوی ئەو میللەتەی؟ چۆن دەبێ بە پێخواسی بەناو ئەو

---

(١) البداية والنهاية (١٣/ ١٣٣).

بەرگی یەکەم

قورِو ئاوەدا برِۆی، بەراستی من بە جوانی نازانم، پێشەوا عومەر(ڕەزای خوای لیێ بیێ) فەرموی: خوای گەورە ئێمەی بە هۆی ئایینی ئیسلامەوە بەرزکردۆتەوە، لە چەوسانەوەو دەست بەسەری رِزگاری کردووین، چونکە ئێمە پێش ئایینی ئیسلام نەوەیەکی چەوساوەو دەست بەسەر بووین، ئێستاش هەر کاتێك داوای گەورایەتی بکەین بەبیێ پەیرِەوی کردنی ئایینی ئیسلام خودا سەر شۆرِو دەست بەسەرمان دەکاتەوە، ئێستاش نۆبەی سواری غولامەکەیە، نەوەك ئەمن ئەوی دابەزێنم و خۆم سواری ولاغەکە ببم ئەوە بە رِاستی ستەمم لیێ کردووە ئەوەش بۆ موسڵمانان نابیێ و کارێکی نارِێك و نەگونجاوە.

بەڵیێ.. هەر بەو شێوەیە بە نۆبە سواری حوشترەکە دەبوون سەرکردەکانی موسڵمانان زۆر لەوە دەترسان کە لەو کاتەی دەگەنە لای (بتریارك سەقەر یوس) پادشای قودس نۆبە سواری غولامەکە بێت، بەلاّم خوای گەورە وای هێنا کە خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لیێ بیێ) گەیشتە لای پادشای قودس نۆبە سواری غولامەکە بوو، خەلیفە عومەر بە پێیان دەرِۆیشت، ڕیشمەی حوشترەکەی ڕادەکێشا (بتریارك سەقەر یوس) ماوەیەك سەیری پێشەوا عومەری کردو لێی ووردبۆوە، ئەو ڕەوشتانەی کە لە کتێبی پیرۆزی خۆیاندا چاوی پیێ کەوتبوو لە خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لیێ بیێ) بەدی دەکرا، بۆیە بەبیێ هیچ قسەیەك یەکسەر کلیلی شاری قودسی بە پێشەوا عومەر(ڕەزای خوای لیێ بیێ) بەخشی، ئینجا گوتی: بەراستی ئەو نیشانانەی کە لە کتێبی پیرۆزماندا هەبوو کە ئادەمیزادێك کلیلی ئەو شارە وەردەگرێت خەلیفەی موسڵمانانەو بە پێیان دێتە ناو شارو غولامەکەی بە سواریەو پۆشاکەکەی بەری حەفدە پینەی پێوەیە، ئەوەی کە منیش سەیری دەکەم ئەتۆی و ئەو کلیلەش شایەنی تۆیە، ئەنجا خەلیفە عومەر(ڕەزای خوای لیێ بیێ) لە دوای وەرگرتنی کلیلەکە کرِنۆشی بۆ خودا بردو ماوەیەك لە کرِنۆشدا مایەوە، ئەو شەوی زۆر گریا فرمێسکی چاوی وشك نەدەبویەوە، پرسیاریان لیێ کرد ئەی خەلیفەی موسڵمانان دەبوو کەیف و خۆشی دەربرِی، بەلاّم هەر دەگرێی هۆی چیە[1]؟

---

(١) البداية والنهاية (١٣/ ١٣٤).

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: ئەمن لەوە دەترسێم خوای گەورە بە دەستی ئێوە جیهان ئازاد دەکاو لە ژێر باری زۆرداری ڕزگارتان دەبێ، بەڵام هەندێکتان مل ملانەی یەکتر دەکەن و لە بەرامبەر یەکتردا دەوەستن و ئاژاوە دروست دەکەن، ئەو کاتەش خودای گەورە فریشتەکانی ئاسمانمان بەسەردا زاڵ دەکات و دوژمنایەتی و بەرهەڵستیمان دەکەن و بە ناخۆشی و ئاژاوە ژیان دەبەینە سەر بە ڕاستی من بۆ ئەوە دەگریم[1].

## دووەم: لەسەردەمی صەلاحەدینی ئەیوبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)

پلانی دوژمنان کێو لە بن دەردەهێنن بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام، بۆ ئەوەی مزگەوتی ئەقصا داگیر بکەن، بەڵام خوای گەورە چەند سەرکردەیەکی نارد بۆ ئەوەی بەرپەرچی دوژمن بدەنەوەو مەرامەکانیان پوچەڵ بکەنەوە، وەکو (عیمادەدین زەنکی) و (نورەددین زەنکی) و (سەلاحەددینی ئەیوبی) و (ظاهر بیبریس).. هتد، جا بە هەوڵی ئەم سەرکردانەو بە گشتی و (سەلاحەددین) بە تایبەتی، قودس ڕزگار کرا، پاش (٨٨) ساڵ کە بانگی تێدا نەدرابوو، بانگی (الله أکبر) و دەنگی زوڵاڵی بانگ بێژی تێدا بەرزبویەوە، (سەلاحەددین)یش لێبڕاو بوو بۆ جیهاد کردن، تەنانەت بواری ئەوەشی نەبوو حەجی ماڵی خوا بکات کە فەرزە، کاتێ عەرەب نەیانتوانی قودس ئازاد بکەن، خوای گەورە کوردێکی قارەمانی وەکو سەڵاحەددینی هێنایە مەیدان و قودسی پێ ڕزگار کرد، تەنانەت سەڵاحەددین خۆی دەیزانی کە خوا هەڵی گرتووە بۆ کارێکی گەورەو مەزن، بۆیە لە شەڕی (الرملە)دا شکا، کاغەزێکی نارد بۆ خەلیفە لە بەغدا و تیایدا نوسی بوی: (لقد أشرفنا علی الهلاك غیر مرة وما أنجانا إلا الله لأمر یریده هو سبحانه)[2].

واتە: بە ڕاستی چەندەها جار هەق بوو تیا بچومایە خوا نەیهێشت تیا بچم بۆ کارێك کە خۆی دەیەوێت و هێشتومیەوە بۆ شتێك کە خۆی دەیزانێت.

---

(١) البدایة والنهایة (١٣/ ١٣٥).

(٢) الکامل في التاریخ، ابن الأثیر (٥/ ١٤٠).

ئەوەبوو خوا هێشتیەوە بۆ ڕزگارکردنی قودس و پاش نزیکەی ساڵێك لە ڕزگارکردنی قودس کۆچی دوایی کرد.

قسەیەکی زۆر جوانی پێشەوای کورد دەخەمە ڕوو کە پێوستە بە ئاوی زێڕ بنوسرێتەوە:

کاتیٚ سەلاحەدین ئەیوبی ویستی شاری قودس ئازاد بکات لە ژێر دەستی خاچ پەرستەکان، هەندێك لە سەرکردەکانی سوپاکەی هەرچەندە عەرەب بوون، سارو سەختەیان هەبوو لەگەڵ دوژمندا، بۆیە ئایەتەکانی سوڵحیان بۆ سەلاحەدین خوێندەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ دوژمندا ڕێك بکەویٚ و ئاوی ڕووی خاچپەرستەکان پارێزراوبێت، ئەویش تووڕە بوو داواکەی دانە دواوەو گوتی: (أنا كردي أفهم القرآن أكثر منكم). واتە: من کوردم لە ئێوە باشتر لە قورئان تێدەگەم، قودسیش ئازاد دەکەم و بە یەکجاری خاچ پەرستەکان دەردەکەم.

جەمالەددینی کوری مەتروح دەڵێت:

المَسجـدُ الأقصـى لـهُ عـادةٌ ... سـارتْ فصارَتْ مَثـلا سائرا
إذا غـدا للكُـفرِ مُستوطـنـا ... أنْ يبعَثَ اللهُ لـهُ نـاصـرا
فنـاصرُ طهـرِهِ أوّلا ... ونـاصرُ طُهرِهِ آخـرا

لە پێشتردا قودس لە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان بوو، هەتا بەلفۆر دای بە جولەکەکان لە ساڵی ١٩١٧ عیسایی، وە دەوڵەتیان ڕاگەیاند لە ساڵی ١٩٤٨ی عیسایی[١].

بۆیە جاری سێیەمیش قودس ئازاد دەکرێت لە لایان موسڵمانەکانەوە بە سەرکردایەتی محەممەدی مەهدی و پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لیٚ بیٚ)..

دکتۆر ئەحمەد کوبەیسی (خودای گەورە بیپارێزێت) دەڵێت: ئەوانەی ئازادی دەکەن کوردن..

---

(١) علامات الساعة الصغرى والكبرى (لا ٢١).

# ئازادکردنی دوورگەی عەرەبی

لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە کە ڕۆژێك دێت موسڵمانان دوورگەی عەرەبی دەکەوێتە ژێر دەستیان.

پێشەوا نافیعی کوڕی عوتبە (ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللَّهُ)[1].

واتە: غەزای دوورگەی عەرەبی دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات، پاشان وڵاتی فارس خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات، پاشان غەزای ڕۆم دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات ، پاشان غەزای دەجال دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات.

ئەم فەرموودەیە هەواڵدانە بە ئازادکردنی ئەو سێ شوێنە، وە خاڵێکی گرنگ هەیە بۆ نیوە دوورگەی عەرەب و فارس کە دەفەرمووێ:

خودا بۆتانی ئازاد دەکات (فیفتحها الله لکم)، چونکە ئەم دوانە لەسەر دەستی هاوەڵان دابووەو (خیطاب)ەکەش بۆ ئەوان بووە، بەڵام بۆ ئازادکردنی ڕۆم کە شاری (قوسطنطنية)یە دەفەرمووی: (فیفتحها الله) خوا ئازادی دەکات و وشەی (لکم) بەکار ناهێنێ، چونکە لە سەردەمی هاوەڵاندا نەبووە، هەر چەندە لە سەردەمی پێشەوا موعاویە (ڕەزای خوای لێ بێت) هەوڵ درا، بەڵام ئازادکردنی ئەو شارە گەیشتە سەردەمی (موحەممەد فاتیح).

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٥) باب: ما يكون من فتوحات المسلمين، برقم: (٢٩٠٠).

بەرگی یەکەم

## ئازادکردنی هەردوو وڵاتی فارس و ڕۆم

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردووینەتەوە کە ڕۆژێك دێت موسڵمانان هەردوو زلهێزی ئیمپراتۆری ڕۆم و فارس تێك دەشکێنن و ئازادی دەکەن.

پێشەوا نافیعی کوڕی عوتبە (ﷺ) دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ لكم، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللَّهُ)[1].

واتە: غەزای دوورگەی عەرەبی دەکەن خوای گەورە ئازادی دەکات، پاشان وڵاتی فارس خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات، پاشان غەزای ڕۆم دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات ، پاشان غەزای دەجال دەکەن خوای گەورە ئەویش ئازاد دەکات.

ئەم فەرموودەیە هەواڵدانە بە ئازادکردنی ئەو سێ شوێنە، وە خاڵێکی گرنگ هەیە بۆ نیوە دوورگەی عەرەب و فارس کە دەفەرمووێ: خودا بۆتانی ئازاد دەکات (فيفتحها الله لكم)، چونکە ئەم دوانە لەسەر دەستی هاوەڵان دابووەو (خیطاب)ەکەش بۆ ئەوان بووە، بەڵام بۆ ئازادکردنی ڕۆم کە شاری (قوسطنطنية)یە دەفەرمووی: (فيفتحها الله) خوا ئازادی دەکات و وشەی (لكم) بەکار ناهێنێ، چونکە لە سەردەمی هاوەڵاندا نەبووە، هەرچەندە لە سەردەمی موعاویەش هەوڵ درا، بەڵام ئازادکردنی ئەو شارە گەیشتە سەردەمی (محەممەد فاتح) کە لە مەوپێش باسمان لێوە کرد.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٢٥) باب: ما يكون من فتوحات المسلمين، برقم: (٢٩٠٠).

پێغەمبەر(ﷺ) باسی پەرەسندنی ئیسلام دەكات تەنانەت لە وڵاتانی كیسراو قەیسەریش كە دەفەرموێ: (إِذَا هَلَكَ كِسْرَى فَلا كِسْرَى بَعْدَهُ، وَإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلا قَيْصَرَ بَعْدَهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُما فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى)[1].

واتە: هەر كاتێك كیسرا لەناو چوو كیسرای تر بەدوای نایەتەوە، وە ئەگەر قەیسەریش لەناوچوو قەیسەری تر بە دوای نایەتەوە، سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە ئێوە گەنجینەكانی ئەوان لە پێناو خوادا دەبەخشن.

بەڵێ... ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دی، ئەمەش دوا بە دوای كوژرانی كیسرا ئیتر نەدەوڵەتی كیسراو نە كیسرایەتی بۆ هەتا هەتایە نەما، وە دەوڵەتی قەیسەری ڕۆمیش كە زیاتر لە دوو هەزار ساڵ بەردەوام بوو، ئەویش نەما بۆ هەتا هەتایی.

وە نەمانی ئەم دوو دەوڵەتە زلهێزەش لە سەردەمی پێشەوا (ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان) وورده وورده بەرەو داڕوخان چوو، بە تایبەتی دەوڵەتی كیسرا، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) دوعای لێكرد لەو كاتەی نامەی بۆ پاشاكان نارد، یەكێ لەوان پاشای كیسرا بوو، كە وەرەقەكەی پێغەمبەری پارچە پارچە كردو باوەڕی نەهێنا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: خودایە مادەم وەرەقەكەی پارچە پارچە كردو باوەڕی نەهێنا تۆش دەوڵەتەكەی پارچە پارچە بكەیت.

بێگومان ئەمەش وەك موعجیزەیەكی ئاشكراو ڕوون هاتۆتە دی و لە دوای ئەوان كیسراو قەیسەرێكی دی نەهاتۆتە جێگایان و ئیسلام وڵات و مەملەكەتی هەردووكیانی بە میرات گرت.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ اللهَ زَوَى لِي الْأَرْضَ، فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا، وَإِنَّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا، وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ الْأَحْمَرَ وَالْأَبْيَضَ..)[2].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٢٢٣٧) باب: لا تقوم الساعة حتى يمر، برقم: (٢٩١٨).

(٢) صحيح مسلم (٤/ ٢٢١٥) باب: هلاك هذه الأمة، برقم: (٢٨٨٩).

واتە: خودا زەوی بۆ وێك هێنامەوە ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاواکانم دیت، وە موڵکی ئوممەتی منیش هەموو ئەو شوێنانە دەگرێتەوە کە من دیتم، وە هەردوو گەنجینەی سوورو سپیشم پێ بەخشراوە.

جا پێغەمبەر(ﷺ) چۆنی فەرموو: ئاوا هاتە دی و بەردەوامیشە، مەبەستیش لە گەنجینەی سوورو سپی سەروەت و سامانی فارس و ڕۆمە کە خودای گەورە بەم ئوممەتەی بەخشی.

پێشەوا عەدی کوڕی حاتەم (ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بووم پیاوێك هاتە لای و باسی دەستکورتی خۆی بۆ کرد، پاشان یەکێکی تر هات باسی چەتەو ڕێگری بۆ کرد، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەمووی:

(يَا عَدِيُّ هَلْ رَأَيْتَ الْحِيرَةَ قُلْتُ لَمْ أَرَهَا وَقَدْ أُنْبِئْتُ عَنْهَا قَالَ فَإِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتَرَيَنَّ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الْحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ لاَ تَخَافُ أَحَدًا إِلاَّ اللَّهَ - قُلْتُ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ نَفْسِي فَأَيْنَ دُعَّارُ طَيِّئٍ الَّذِينَ قَدْ سَعَّرُوا الْبِلاَدَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتُفْتَحَنَّ كُنُوزُ كِسْرَى قُلْتُ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ قَالَ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتَرَيَنَّ الرَّجُلَ يُخْرِجُ مِلْءَ كَفِّهِ مِنْ ذَهَبٍ، أَوْ فِضَّةٍ يَطْلُبُ مَنْ يَقْبَلُهُ مِنْهُ فَلاَ يَجِدُ أَحَدًا يَقْبَلُهُ مِنْهُ وَلَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ يَلْقَاهُ وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ يُتَرْجِمُ لَهُ فَيَقُولَنَّ أَلَمْ أَبْعَثْ إِلَيْكَ رَسُولاً فَيُبَلِّغَكَ فَيَقُولُ بَلَى فَيَقُولُ أَلَمْ أُعْطِكَ مَالاً وَأُفْضِلْ عَلَيْكَ فَيَقُولُ بَلَى فَيَنْظُرُ عَنْ يَمِينِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ جَهَنَّمَ وَيَنْظُرُ عَنْ يَسَارِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ جَهَنَّمَ قَالَ عَدِيٌّ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقَّةِ تَمْرَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ شِقَّةَ تَمْرَةٍ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ قَالَ عَدِيٌّ فَرَأَيْتُ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الْحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ لاَ تَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ وَكُنْتُ فِيمَنِ افْتَتَحَ كُنُوزَ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكُمْ حَيَاةٌ لَتَرَوُنَّ مَا قَالَ النَّبِيُّ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ) يُخْرِجُ مِلْءَ كَفِّهِ)[1].

واتە: ئەی عەدی شاری حیرەت[2] دیوە؟

---

(١) صحيح البخاري ، كتاب الزكاة، باب الصدقة قبل الرد، رقم: (٣٥٩٥) .

(٢) شارێکە لە عێراق سێ میل لە کوفەوە دوورە.

گوتم: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەمدیوە، بەڵام باسیان بۆ كردووم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر تەمەنت درێژ بێ، دەبینیت ئافرەتی نێو كەژاوە لە حیرەوە سەفەر دەكات تا دەگاتە كەعبە، بێجگە لە خوا لە كەسی تر ناترسێت، عەدی دەڵێت: لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەی ئەو كاتەی بەدڕەوشتانی خەڵكی (طهی) لە كوێن، ئینجا فەرمووی:

ئەگەر ژیان مەودات پێ بدات گەنجینەی كیسرا وە دەست دێنن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) كیسرای كوڕی هورمز، فەرمووی:

بەڵێ.. كیسرای كوری هورمز، ئەی عەدی ئەگەر تەمەنت درێژ بێت دەبینیت پیاو پڕ بە چەنگی زێڕ یان زیو دەردەهێنێ و داوا دەكات لە یەكێك كە لێی وەربگرێت، جا كەس لێی وەرنا گرێت، وە هەر یەكێكیشتان لە ڕۆژی دواییدا خودا دەبینێت، هیچ وەرگێڕێكیش لە نێوان بەندەو خوادا نیە؟

ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەی پێغەمبەرم بۆ نەناردی تا پەیامت پێ بگەیێنێت؟

دەڵێ: بەڵێ.. دەفەرمووی:

ئەی ماڵ و بەهرەم پێ نەبەخشیت، دەڵێ: بەڵێ.. جا تەماشای لای ڕاستی دەكات دۆزەخ دەبینێت، تەماشای لای چەپی دەكات هەر دۆزەخ دەبینێت، جا عەدی دەڵێت: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو: بە دەنكە خورمایەكیش بێت خۆتان لە ئاگر بپارێزن، جا ئەوەی ئەم دەنكە خورمایەشی نەبوو با بە وشەیەكی باش و شیرین خۆی بپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، عەدی دەڵێت: جا كەژاوەكەم دیت لە حیرەوە دەهات تا دەگەیشتە كەعبەو تەوافی ماڵی خوای دەكرد، جگە لە خودا لە كەسی تر نەدەترسا، وە منیش یەكێ بووم لەوانەی كە گەنجینەی كیسرای كوڕی هورمزمان دەكردەوە، ئەگەر ئێوەش تەمەنتان درێژ بێت ئەوەش دەبینن كە پێغەمبەر(ﷺ) باسی فەرمووە كە پیاو پڕ چەنگی زێڕو زیو دەردێنێت.

## ئازادکردنی وڵاتی یەمەن

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر ئازادکردنی وڵاتی یەمەنە..

پێشەوا سوفیانی کوری ئەبی زوهەیر (ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو:

(تُفْتَحُ اليَمَنُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يُبِسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ..)[1].

واتە: شاری یەمەن ئازاد دەکرێت، ئینجا کەسانێك دێن سوارەکانیان ئاو دەدەن و بۆیان دەرازێننەوە داوا دەکەن لە شارەکانیان بمێننەوە خۆیان و ماڵ و منداڵیان، چونکە ئەم شارە باشترە بۆ ئەوان ئەگەر بیزانن..

ئەم فەرموودەیە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی محەممەد(ﷺ) کە بۆ گەیاندنی پەیامی خوای گەورە بڵاوبوونەوەی ئیسلام هاوەڵان خۆیان کردە قوربانی..

وە خاکی یەمەن لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) ئازاد کرا.. وە بە یەکێك لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی هەژمار دەکرێت.

---

(١) صحيح البخاري، كتاب: فضائل المدينة ، برقم: (١٧٧٦)

# ئازادکردنی وڵاتی شام

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر ئازادکردنی خاکی شامە..

پێشەوا سوفیانی کوری ئەبی زوهەیر (ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو:

(تُفْتَحُ الشَّامُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يُبِسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ..)[1].

واتە: شام ئازاد دەکرێ و کەسانێك دێن سوارەکانیان ئاو دەدەن و بۆیان دەرازێننەوەو داوا دەکەن لە شارەکانیان بمێننەوە خۆیان و ماڵ و منداڵیان، چونکە ئەم شارە باشترە بۆ ئەوان ئەگەر بیزانن..

ئەم فەرموودەیە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی محەممەد(ﷺ) کە بۆ گەیاندنی پەیامی خوای گەورەو بڵاوبوونەوەی ئیسلام هاوەڵان خۆیان کردە قوربانی.

وە خاکی شام و عێراق لەسەردەمی پێشەوا ئەبوبەکری سدیق ئازاد کرا.. هەم نیشانەی هاتنی ڕۆژی دوایی بەخۆیەوە بینی..

---

(١) صحيح البخاري، كتاب: فضائل المدينة ، برقم: (١٧٧٦)

## ئازادکردنی وڵاتـی عێراق

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر ئازادکردنی خاکی عێراقە..

پێشەوا سوفیانی کوری ئەبی زوهەیر (ﷺ) دەڵێت:

گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو:

(..تُفْتَحُ العِرَاقُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يُبِسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ ، وَالمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ)[1].

واتە: خاکی عێراق ئازاد دەکرێت و کەسانێك دێن سوارەکانیان ئاو دەدەن و بۆیان دەرازێننەوەو داوا دەکەن لە شارەکانیان بمێننەوە خۆیان و ماڵ و مناڵیان، چونکە ئەم شارە باشترە بۆ ئەوان ئەگەر بیزانن.

لەم فەرموودەیە باسی خاکی عێراق کراوە بەرامبەر بە (یەمەن و شام)...

ئەم فەرموودەیە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی محەممەد(ﷺ) کە بۆ گەیاندنی پەیامی خوای گەورەو بڵاوبوونەوەی ئیسلام هاوەڵان خۆیان کردە قوربانی.

وە خاکی شام و عێراق لەسەردەمی پێشەوا ئەبوبەکری سدیق ئازاد کرا.. هەم نیشانەی هاتنی ڕۆژی دوایی بەخۆیەوە بینی..

---

(١) صحيح البخاري، كتاب: فضائل المدينة ، برقم: (١٧٧٦)

# ئازادکردنی وڵاتی هیندستان

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر، موسڵمانان چەندین جار شەڕی وڵاتی هیندستان دەکەن..

یەکەم کەس کە غەزای هیندی کرد لە نێو موسڵمانان (محەممەدی کوڕی قاسمی سەقەفی) بوو، کە دەکاتە کوڕی برای حەجاجی کوری یوسفی سەقەفی، لەو کاتەدا تەمەنی (١٧) ساڵان بوو، لە دوای ئازادکردنی ئەم وڵاتە بتی (البد)ی شکاندو پادشای ئەو شارەش کە ناوی (داهر) بوو کوژرا..

پێغەمبەر (ﷺ) موژدەی ئازادکردنی وڵاتی هیندیستان بە موسڵمانان دەدات و دەفەرموێ:

(عِصَابَتَانِ مِنْ أُمَّتِي أَحْرَزَهُمَا اللَّهُ مِنَ النَّارِ، عِصَابَةٌ تَغْزُو الْهِنْدَ، وَعِصَابَةٌ تَكُونُ مَعَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ)[1].

واتە: دوو کۆمەڵ لە ئومەتەکەم خودای گەورە لە ئاگر پارێزراوی کردوون:

کۆمەڵێك کە غەزای هیند دەکەن.

وە کۆمەڵەکەی تر لەگەڵ عیسای کوری مەریەمدا دەبن.

بەڵێ.. بۆ یەکەمجار سوپای ئیسلام لەسەردەمی ئومەویەکان گەیشتە وڵاتی هیندستان و ئایینی ئیسلامیان بەم وڵاتە گەیاند، وە بەشێکی زۆریشی وڵاتی هیندیستانیان ئازاد کرد.

بە پشتیوانی خودا جارێکی تر لە سەردەمی (موحەمەدی مەهدی) ئەو وڵاتە لەسەر دەستی موسڵمانان ئازاد دەکرێتەوە.

---

(١) سنن النسائي (٦/ ٤٢) باب: غزوة الهند، برقم: (٣١٧٥).

ئازادکردنی وڵاتی (هیند)و گەیشتنی ئایینی ئیسلام بۆ ناوچەکە، نیشانەیەك بوو لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يَكُونُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ بَعْثٌ إِلَى السِّنْدِ وَالْهِنْدِ)[١].

لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) وشەی (يكون) هاتووە، واتە: بە کاری ڕانەبردوو، ئەمەش سوودی نویَ بوونەوەو بەردەوامیەت دەبینێت، واتە: بە بەردەوامی ئازادبوونی بە خۆیەوە دەبینێت.

وە وولاتی (هیند)یش ئازاد کرا لە ساڵی (٤٤)ی کۆچی، لە سەردەمی پێشەوا موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خوای لیَ بێت)، لەسەر دەستی مەلیك (سەعید مەحمود سبکتکین) خاوەنی شاری غزنە، کاتیَ چووە هیندەوە یەکسەر بتە گەورەکەی شکاند کە ناوی (بسومنات) بوو.

---

(١) أخرجه الإمام أحمد في (المسند) (٢/ ٣٩٦) برقم: (٨٨٠٩).

# ئازادکردنی وڵاتانی پاکستان و بەنگلادش

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئازادکردنی هەردوو وڵاتی پاکستان و بەنگلادشە..

ئازادکردنی هەردوو وڵاتی (پاکستان و بەنگلادش) بوو لە ڕێگای (کراتشی)، وە وڵاتی هیندیستانیش دارولئیسلام بوو، هەتا ئەو کاتەی تەیموری لەنگ ئەو وڵاتەی خاپوور کردو پیاوە بە غیرەتەکانی هەموو کوشتن، دواتر لە ڕێگای ئینگلیز بە یارمەتی جولەکەکان توانیان دەست بەسەر ئەم وڵاتەدا بگرن، وە ژمارەی موسڵمانان بەهۆی ڕەشە کوژیەوە گەیشتە ( ٪ ١٠) وە ئێستاش دار الکفرە، وە ئەوانەی باڵادەستن بوزیەکان و بتپەرستەکانن، وە ئازادکردنی ئەم وڵاتانەش بە نیشانەیەکی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر دادەنرێت.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (يَكُونُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ بَعْثٌ إِلَى السِّنْدِ وَالْهِنْدِ)[1].

شاری (هیند)یش ئازاد کرا لە ساڵی (٤٤)ی کۆچی، لە سەردەمی (موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)، لەسەر دەستی مەلیك (سەعید مەحمود سبکتکین) خاوەنی شاری غزنە، کاتێ چووە هیندەوە یەکسەر بتە گەورەکەی شکاند کە ناوی (بسومنات) بوو، پاش ئازادکردنی وولاتی هیند بە خۆی و سوپاکەیەوە گەڕانەوە بە دەستکەوتێکی باشەوە، پاشان بەرەو (پاکستان) ڕۆیشت و لەگەڵ تورکەکان جەنگان..

ئەم فەرموودەیەش وەڵامە بۆ هەموو حاڵەتێك کە موسڵمانان تیایدا تووشی ناڕەحەتی و نەهامەتی دەبن، وە خودای گەورە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای هێناوەتە پێش چاوی پێغەمبەر(ﷺ)، وە هەواڵی داوەتێ کە بە دڵنیایی موڵکی ئیسلام و قەڵەم ڕەوی ئیسلام ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا دەگرێتەوە .

---

(١) مسند الإمام أحمد (٢/ ٣٩٦) برقم: (٨٨٠٩).

## ئازادکردنی وڵاتی میسر

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی کۆتایی بونەوەر، وڵاتی میسرِ ئازاد دەکرێت..

پێشەوا ئەبو زەر (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

(إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ مِصْرَ وَهِيَ أَرْضٌ يُسَمَّى فِيهَا الْقِيرَاطُ، فَإِذَا فَتَحْتُمُوهَا فَأَحْسِنُوا إِلَى أَهْلِهَا، فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِمًا أَوْ قَالَ ذِمَّةً وَصِهْرًا..)[1].

واتە: ئێوە لە داهاتوو میسر ئازاد دەکەن، ئەم شارە خاکێکە بە قیرات ناسراوە، هەر کاتێك ئەم وڵاتەتان ئازاد کرد باشبن لەگەڵیاندا، چونکە ئەوان مافیان بەسەرتانەوە هەیەو هاجەری دایکی پێغەمبەر ئیسماعیل لەوێ بووە، یان وتی: ماریەی دایکی ئیبراهیمی کوری پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکی ئەوێیە..

ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی پێکردووە وەکو ڕۆژی ڕووناك موعجیزەکان دەرکەوتن.. بەڕاستی ئەوەی فەرموو بووی وەکو خۆی هاتە دی.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٧٠) باب: وصية النبي (ﷺ) برقم: (٢٥٤٣).

# ئازادکردنی شاری مەدائین لە عێراق

یەکێ لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ڕزگارکردنی شاری مەدائینە، کە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لە فەرمودە شیرنەکانی باسی کردووە.

پێشەوا عەدی کوری حاتەم (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ , حَتَّى يُفْتَحَ الْقَصْرُ الْأَبْيَضُ الَّذِي بِالْمَدَائِنِ...)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا کۆشکی سپی لە مەدائین ئازاد نەکرێت.

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی بە عەدی کوڕی حاتەم(رضي الله عنه) دا کە بە چاوی خۆی دەبینێت چۆن شاری مەدائین ئازاد دەکرێت، لە هەمان کاتدا ئازادکردنەکەشی نیشانەیەك بوو لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

ئەو کاتەی کیسرای پادشای فارس ناوی (یەزدجر)بوو دەستی بەسەر کۆمەڵێك لە خەڵکی داگرتبوو دەیویست هەموو موسڵمانان لە ئاین پاشگەز بکاتەوەو بیانکات بە ئاگر پەرست، چونکە ئەو کاتە خودایان نەدەناسی تەنها ئاگر نەبێت، چونکە بێگومان ئاینی ئیسلام ڕێگەی دیکتاتۆری و خوێن ڕێژی و ستەمکاری نادات، هەموو ئەو فەرمانڕەوایانەی کە زەبرو زەنگ بەسەر گەل و نەتەوە هەژارەکان بەکاردەهێنن، ئەوە شتێکی ڕاستە لەسەر ڕێبازو بەرنامەی خودا لایان داوە، بۆیە دڵ سۆزی و میهرەبانیان لێ بەدی ناکرێت، تەنها بیر لە کورسی بەرزو پاروی چەورو زەبرو زەنگی زۆر دەکەنەوە، دەیانەوێ بەو زەبرو زەنگە خۆیان بسەپێنن لە نیشتیماندا، ئەو کاتەی کە کیسرای ئاگر پەرست ئەو زەبرو زەنگەی دەکێشا لە سەردەمی خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوری خەتاب(رضي الله عنه).

---

[1] ترتيب الأمالي (٢/ ٣٧٦) رقم: (٢٨١٣).

پێشەوا عومەر(ﷺ) فەرمانێکی دەرکرد لە شاری مەدینەی پایتەختی موسڵمانان کێ خۆی فیدا دەکات لە پێناوی نەهێشتنی کوفرو بێ باوەڕی، لەگەڵ دەرکردنی فەرماندا لەناو موسڵمانانی خۆشەویستدا (٣٠٠٠) هەزار موسڵمانی جەنگاوەر هاتنە مەیدان، پێشەوا عومەریش(ﷺ) ویستی بۆ خۆی ببێتە سەرکردەی سوپاو بڕوا بۆ جەنگ، بەڵام ئیمامی عەلی(ﷺ) ڕازی نەبوو گوتی: نابێ تۆ بچێت بەڵکو یەکێك لە جێگەی خۆتدا بنێرە تۆ خەلیفەی موسلمانانی نابێ پایتەختی موسڵمانان چۆل بکرێ، ئینجا پێشەوا عومەر(ﷺ) کەوتە ڕاوێژ تا لە کۆتاییدا یەکێك لەو (١٠) کەسەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵێنی بەهەشتی پێدابوون هەڵبژارد ئەویش سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس (ﷺ) بوو.

ئینجا لێپرسراوی سوپای درایە دەست خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون لە شاری مەدینە بەڕێ بکەون بۆ وڵاتی فارس، کە ئەو کاتە ئیمپراتۆریەتی کیسرا ئێران و عێراقی داگیر کردبوو، بە ڕاستی ئەم جەنگەش بە گەورەترین جەنگ دادەنرا، چونکە هیچ کەس لە مەوپێش نەیتوانیوە بەرەنگاری جەنگێکی وا گەورە ببێتەوەو بەرگری بکات، بەڵام وا ئێستا سوپای ئیسلام بە بڕوای تەواوە بەرەو مەیدانی جەنگێکی وا گەورە دەڕوات، جا سەرکردەی موسڵمانان پێشەوا عومەر(ﷺ) لە پێشوازی بەڕێکردنیاندا فەرمووی: بەناوی خوداو لەسەر پیرۆزی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس (ﷺ) نەکەی فێڵ و تەڵەکەی بێباوەڕان لە خشتەت ببات، بێگومان تۆ خاڵی پێغەمبەری (ﷺ) هاوەڵی ئەویشی، هەموو کۆمەڵانی خەڵك بە گەورەو بچوکەوە لەلایان خوداوە وەکو یەکە بەبێ جیاوازی، تەنها جیاوازیان لە ژیان و خۆشیدایە بە هۆی یادی خوداوە دەگەنە ئەو شتەی کە خودا بڕیاری داوە بۆیان، ئەی سەعد (ﷺ) ئامۆژگاری تۆ و ئەو موسڵمانانە دەکەم کە لەگەڵ تۆ دان، خۆپارێز بن و یادی خودا بکەن، چونکە ئێمە ئەگەر تاوان و نا فەرمانی بکەین وەکو دوژمنانمان لێدیت لە تاوان و خراپەدا، ئەی سەعد (ﷺ) من لەبەر زۆری دوژمن ناترسم لە ئێوە، بەڵام لەبەر ئەوە دەترسێم تاوان و نا فەرمانی خودا بکەن[1]؟

---

(١) البداية والنهاية (٤/ ١٣٠).

ئینجا بە پشتیوانی خودا بۆ بەرەنگاری و سەركەوتن بڕۆن ئەی سەعد، بەو شێوەیە سەعد لەگەڵ سوپای باوەڕدارو بەهێز كەوتە ڕێ و دەشت و بیابانیان بڕی بۆ شاری (قادسیە)، وە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی فارس لە شاری مەدائین بوو.

بەڵێ.. كاتێ گەیشتنە قادسیە پادشای فارس فەرمانێكی بۆ ڕۆستەم دەركرد كە سەركردایەتی بگرێتە دەست و ڕوویەروویان ببێتەوە، جا ڕۆستەم پێش ئەوەی بجەنگێت لەگەڵ موسڵمانان نێردراوێكی نارد بۆ لای سەعدی كوڕی ئەبی وەقاس (ﷺ) گوتی: ئەی سەعد(ﷺ) نێردراوێكمان بۆ بنێرە بۆ وتوێژو ڕێككەوتن، سەعدی كوری ئەبی وەقاسیش چەند كەسێكی لە پیاوە ناودارەكانی موسڵمانان هەڵبژارد بۆ وتوێژو ڕێككەوتن، ئەو موسڵمانانەش ئەوانە بوون (نوعمانی كوڕی مەقرون) و (موغەیرەی كوڕی شەعب) و (عاصمی كوڕی عەمر) و (شەعسی كوڕی قەیس) ئەو موسڵمانە خۆنەویست و بە جەرگانە ڕۆیشتن بۆ كۆشكی سپی كیسرا، كە تا ئێستاش مێژوو شتی وای بە خۆوە نەدیوە لە شێوەی هونەرو ئەندازیاری و فەرشی ڕاخراو، دوای دانیشتن وتووێژ دەستی پێكرد، كیسرا گوتی: بۆچی هاتونەتە وڵاتەكەمان و چیتان دەوێ؟ موسڵمانەكان گوتیان: ئەی كیسرا ئێمە هاتووین بانگتان بكەین بۆ یەكتاپەرستی؟ بەو وتەیە كیسرا تووڕە بوو دەمارەكانی گرژ بوو گوتی: ئەگەر وەڵامتان نەدەمینەوە؟ گوتیان: دەبێ سەرانە بدەن[1].

بەو قسەیە كیسرا ئەوەندەی تریش تووڕە بوو.

گوتی: ئەگەر سەرانە نەدەین، گوتیان جەنگ دەكەین و شمشێرمان لە نێواندایە، جا دوای ئەو وتووێژە كیسرا بە پاسەوانەكانی گوت: ئەوانە بە زەلیلی دەربكەن، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە كە نێردراو ناكوژرێ ئەوا هەموویانم دەكوشت، ئینجا پێی گوتن: كامەتان گەورەكەتانە؟

گوتیان: بۆچی؟

---

(١) البداية والنهاية (٤/ ١٣١).

گوتی: بۆ ئەوەی کۆلیك خۆڵ بەسەر سەر هەڵگرێ و لەگەڵ خۆی بیباتەوە ئەگەر هەڵی نەگرێ لێرە دەیکوژم عاصمی کوڕی عەمر(ﷺ) بۆ ئەوەی ئەو کۆڵە خۆڵە بۆ خۆی هەڵبگرێ لە جیاتی هاوڕێکانی گوتی: من گەورەکەیانم، بەو جۆرە عاصم کۆڵە خۆڵەکەی هەڵگرت و بەرەو سوپای موسڵمانان کەوتنە ڕێ، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس (ﷺ) لێی پرسین: ئەنجامی وتوێژ چی بوو، پێشەوا عاصم (ﷺ) هاتە وەڵام و گوتی: من کلیلی کیسرام هێناوە، لە دوای ئەوە سوپای فارس بە سەرکردایەتی (ڕۆستەم) هاتە مەیدانی جەنگ، ئینجا (ڕۆستەم) لەناو خێمەی جەنگدا لە پێش هەڵگیرسانی شەڕ نێردراوێکی نارد بۆ لای سەعد پێی گوت: پێی بڵێ پیاوێکی بە هۆش و زیرەکم بۆ بنیرێ چەند وتووێژێکی لەگەڵ دەکەین، بەو شێوەیە وتووێژی ڕێککەوتن لە پادشای وڵاتەوە بۆ سەرکردەی سوپا دابەزی، لە (کیسرا)وە بۆ (ڕۆستەم)، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسیش (ﷺ) موسڵمانێکی لێهاتووی بە ناوی (رەبیعی کوڕی عامر)ی نارد، نێردراو گەیشتە لای خەیمەی سەرکردەی گشتی سوپای فارس، ئەوەی لەناو خەیمەکەدا دیتی لە ژیانیدا چاوی بە شتی وانەکەوتووە فەرشی بە نرخ و قەنەفەی ڕازاوەو تەختی ڕەنگاو ڕەنگ و.. هتد، هەرچی بتەوێ لە شتی بە نرخ تێیدا هەبوو بە هەر جۆرێك بوو موسڵمانی چاو نەترس بە خۆی و ڕمەکەیەوە لە بەرامبەری ڕۆستەم دانیشت، ڕۆستەم لێی پرسی: چۆن بوو ئێوە هاتن بۆ ئێرەو لەبەرچی؟

(رەبیع) گوتی: خوای گەورە ئێمەی ناردووە بۆ ئەوەی ئێوە لە بەندایەتی بەندەکان بگێڕینەوە بۆ بەندایەتی خوای گەورەو میهرەبان، وە لە ستەمی ڕێچکە دروست کراوەکاندا بیانگێڕینەوە بۆ ڕاستە ڕێگای دادگەری ئیسلام، وە لە تەنگەبەری ئەم دونیایەوە بیانگێڕینەوە بۆ فرەوانی ئەو دونیا واتە: (بەهەشت)، بەو جۆرە ڕۆستەم سوودی لە وتەکانی (رەبیع) نەدیت و نامەیەکی نوسی و دایە دەست (رەبیع) کە بیبات بۆ لای سەعدی کوری ئەبی وەقاس (ﷺ) داوای لێکرد کە ئەو نێردراوە زۆر توندو تیژو داخ لە دڵە، نێردراوێکی ترم بۆ بنێرە تا وتووێژی لەگەڵدا بکەم، ئینجا سەعدی کوری ئەبی وەقاس (موغەیرەی کوری

شوعبە)ی نارد، ئینجا چوە لای ڕۆستەم و دانیشتن بۆ وتوێژ، ڕۆستەم گوتی: هۆی چیە ئێوە هاتونەتە ئێرە؟ موغەیرە گوتی: بۆ ئەوە هاتووین لە تاریکی کوفرو نەزانین دەرتان بهێنین بۆ ڕووناکی و یەکتاپەرستی (لا إله إلا الله) ڕۆستەم گوتی: ئەگەر وانەکەین؟[1]

پێشەوا موغەیرە(ﷺ) گوتی: دەبێ سەرانە بدەن، دووبارە ڕۆستەم گوتی: ئەی ئەگەر ئەویش نەکەین، موغەیرە گوتی: شیرمان لەسەر ئەستۆتانە، ڕۆستەم هاتە قسەو گوتی: بێگومان ئێمە سوپامان زۆرە لە بەرامبەری ئێوە، ئێستاش تۆ بڕۆ بۆ لای هاوەڵەکانت پێیان بڵێ ڕۆستەم گوتویەتی: ئەگەر واز نەهێنن و شەڕمان لەگەڵ هەڵگیرسێنن هەموویان لە خاکی قادسیە لە گۆڕ دەکەم، ئەوەش کۆتایی وتووێژی ئاشتی بوو لە نێوان موسڵمانان و بێباوەڕاندا، ئینجا موسڵمانان خۆیان ئامادە کرد بۆ مەیدانی جەنگ ژمارەی سوپای موسڵمانان (٣٠٠٠) هەزار سەربازی جەنگاوەر بوو، وە ژمارەی سوپای بێباوەڕ (١٢٠٠٠٠) هەزار سەربازی جەنگاوەر بوو (٣٣) فیلیان پێ بوو بۆ شەڕو جەنگ.

بەڵێ... هەردوو سوپا ئامادەی جەنگ بوون سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسیش (ﷺ) فەرمانی بە بانگدەری سوپادا کە لە هەموو پارچەکانی سوپا بانگ بدرێ، بەو جۆرە ئەو ڕۆژە لەناو هەموو سوپای جەنگاوەران بانگیانداو نوێژی بە جەماعەتیان کرد، ئینجا جەنگ لە نێوان موسڵمانان و بێباوەڕان بەرپا بوو لەبەر ئەوەی موسڵمانەکان تەنها حوشتریان پێ بوو شپرزە بوون، چونکە حوشتر کە چاوی بە فیل کەوت ڕادەکات.

لەو کات قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی(ﷺ) گوتی: بۆ ئەوەی حوشترەکانمان بەسەر فیلەکاندا سەرکەوێ تاکتیك بەکار بهێنن، پەچەو ڕووپۆش بەسەر دەم و چاوی حوشترەکاندا بدەین بۆ ئەوەی فیلەکان وابزانن ئەوە جنۆکەن و بەسەریاندا سەرکەوین، لە دوای ئەوەی کە ڕووپۆشیان بەست بە فەرمانی خودای گەورە فیلەکان ڕایان کردو توانای مانەوەیان نەما، بەو جۆرە سێ ڕۆژ

---

(١) البداية والنهاية (٤/ ١٣٠).

بەرگی یەکەم

جەنگ بەردەوام بوو لە کاتی خۆرئاوابوونی رۆژی سێهەم، یەکێك لە موسڵمانان بە فیداکاری و چاونەترسی بە ناوی هیلالی کوڕی عەلقەمە (ﷺ) خۆی گەیاندە خێمەکەی ڕۆستەم و شێرانە شیرێکی لە ڕۆستەم داو بەرەو دۆزەخی ڕەوان کردو دەنگی (الله أكبر) بەرز بۆوە (الله أكبر) وا ئەمڕۆ دوژمنی خودا ڕۆستەمم کوشت و بە دۆزەخم سپارد، کاتێ دەنگ و باسی کوشتنی ڕۆستەم لەناو سوپای بێباوەڕاندا بڵاوبویەوە، ورەیان نەماو بەرەو دواوە گەڕانەوە، موسڵمانەکانیش بە دوایان کەوتن و لە کۆتاییدا موسڵمانەکان سەرکەوتن بەسەر بێباوەڕەکان.

پێشەوا عومەریش(ﷺ) لە شاری مەدینە بەردەوام لە خودا دەپاڕایەوە کە سوپای ئیسلام بەسەر کوفردا سەربخات[1].

مێژوونووسان دەڵێن: لە ماوەی جەنگدا پێشەوا عومەر(ﷺ) خەو لە چاوانی نەکەوتووە بە شەو و بە ڕۆژ زۆربەی کاتەکان دەڕۆیشتە دەرەوەی شاری مەدینە یان لەسەر ڕێگاکانی شار دادەنیشت و چاوەڕوانی دەکرد کەی نێردراوێك لە مەیدانی جەنگەوە بێت و هەواڵی موسڵمانەکانی پێ بێت، خەلیفەی موسڵمانان هەردوو چاوەکانی لەبەر بێ خەوی سورو ئەستوور هەڵگەڕابوون، هەر بەو جۆرە پێشەوا عومەر (ﷺ) چاوەڕوانی ڕێگای دەکرد، هەتا ڕۆژێك چاوی بە سوارێك کەوت کە دەهاتە شاری مەدینە، خەلیفەی موسڵمانان پرسیاری لێکرد ئەی برام بارودۆخی موسڵمانان چۆنەو لەچی دان؟

کابرا نەیزانی ئەوە عومەری کوڕی خەتابە(ﷺ)، وەڵامی دایەوەو گوتی: مزگێنی بێ ئەی برای موسڵمان بەڕاستی موسڵمانان سەرکەوتن بەسەر سوپای فارسەکان، کابرای نێردراویش زۆر بە تالوکە بوو بگاتە شوێنی سەرکردە، بۆیە پێشەوا (عومەر)ی بەجێ هێشت، پێشەواش لە دوای کابراوە کەوتە ڕێ، کابرای نێردراو هەر دەڕۆیشت و پرسیاری دەکرد تا گەیشتە کۆمەڵێك لە موسڵمانان ڕایانگرت و گوتیان: وا سەرکردەی موسڵمانان لە دواتەوەیە، کابرای نێردراو کە

---

(١) البداية والنهاية (٤/ ١٣٢).

سەیری کرد ئەوە ئەو پیاوەیە کە لە ڕێگا پرسیاری حاڵی موسڵمانانی کردووە پێشەوا عومەر(ﷺ) بووە، کابراش زۆر بە شەرمەزاریەوە لە وڵاخەکەی دابەزی و داوای لێبوردنی لێکرد، بەڵام پێشەوا (عومەر) دڵی کابرای دایەوەو گوتی: هیچ شتێك نەبووەو پێویست بە خەجاڵەتی ناکات، بەس پێم بڵێ بارودۆخی موسڵمانەکان لە چیدایە؟

کابرا گوتی: مزگێنی بێ موسڵمانەکان سەرکەوتن و ئەوەش نامەیەکە لە مەیدانی جەنگەوە بۆم هێناوی، پێشەوا عومەریش (ﷺ) نامەکەی وەرگرت و کردیانەوە نووسرابوو لە سەعدی کوری ئەبی وەقاسەوە (ﷺ) بۆ سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانی موسڵمانان لە مەیدانی جەنگی فارسەکانەوە بۆ سەرکردەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) مزگێنی بێ بە یارمەتی خودا دوژمنانی ئیسلامەمان تێك و پێك شکاند، وە سەرکەوتنی ئێمە بەسەر دوژمنانمان بە هۆی ئەوەوە بوو کە موسڵمانان بە ڕۆژ وەکو شێر لە مەیدان دەجەنگان، لە شەویشدا قورئان و زیکرو یادی خوایان دەکرد، ئەی سەرکردەی موسڵمانان چەند موسڵمانێکمان لێ شەهید بوون پێش ئێمە کەوتن بۆ خزمەتی خوای گەورە، ئێمەش داوامان لە خودای گەورە ئەوەیە بە پلەی ئەو شەهیدانە بگەین، کاتێ پێشەوا عومەر (ﷺ) لە خوێندنەوەی نامەکە بویەوە یەکسەر سوجدەی شوکری بردو سوپاسی خوای گەورەی کردو دەستی بە گریان کرد، گوتیان: ئەی سەرکردەی موسڵمانان تۆ لە ڕۆژی سەرکەوتندا دەگریت؟

پێشەوا عومەر (ﷺ) فەرموی: من لەوە دەترسێم کە ئێوە هەموو جیهان بە فەرو پیرۆزی بەسەرتاندا بڕژێ و دەرگای تەواوتان لە ڕوودا بکرێتەوەو بهێننە ژێر ڕکێفی ئیسلامەوە، بەڵام هەندێ لە ئێوە واتە: مرۆڤەکان ململانێی هەندێکتان بکەن و ئەو کاتە دانیشتووانی ئاسمانیش ململانێی ئێوە بکەن و لە بیرتان بەرنەوە[١].

---

(١) البداية والنهاية (٤/ ١٣٣).

# بڵاوبوونەوەی ئەمن و ئاساییش

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەمن و ئاسایش بڵاودەبێتەوەو، خراپەكاری و جەردەیی نامێنێت..

پێشەوا عەدی كوڕی حاتەم (ﷺ) دەڵێ:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (..لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَسِيرَ الضَّغِينَةُ مِنَ الْحِجَازِ إِلَى الْعِرَاقِ آمِنَةً لَا تَخَافُ شَيْئًا)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا كەسانێك لە حیجازەوە دەچنە عێراق كەوا ئەمینە لە هیچ شتێك ناترسێت.

پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی بە عەدی كوڕی حاتەمدا (ﷺ) كە بە چاوی خۆی دەیبینێت، ئەم فەرموودەیەش هاتە دی لەسەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەش لەو كاتە بوو كە ئیسلام و دادپەروەری هەموو ئەو شوێنانەی گرتەوە كە موسڵمانان ڕزگاریان كردبوو.

عەدی كوری حاتەم(ﷺ): كوری ئەو حاتەمە بەناو بانگەیە كە لە مێژوو ناسراوە بە نان دەر، هەردەم میوانداری خەڵكی كردووەو بە هاواری داماو و لێ قەوماوانەوە چووە، هەر شتێكی داوایان لێ كردبێ دەستی كەسی نەگێڕاوەتەوە، عەدی كوڕیشی پیاوێكی مەسیحی بووە، لە هەموو كەسیش زیاتر ڕقی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە، ئەو كاتەی عەدی هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: ئەی عەدی سوێند بەخوا گوێت لێ دەبێت ئافرەتان لە شاری قادسیەوە بە سواری حوشتر دەچنە حەج بێ ئەوەی پێویستی بە پاراستنی كەس هەبێت، باش بزانە ئەی عەدی هێندەی نەماوە كۆشك و تەلاری سپی كیسرای كوڕی هورمز بكەوێتە ژێر دەستی موسڵمانان.

---

(١) ترتيب الأمالي (٢/ ٣٧٦) رقم: (٢٨١٣).

ئینجا عەدی موسڵمان بوو لەسەر دەستی پێغەمبەر(ﷺ)، عەدی سوێند دەخوات و دەڵێت: هێندەی پێ نەچوو ئەو نیشانانەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی کرد هەمووی هاتە جێ وە لەساڵی (١٦) کۆچی کۆشك و تەلاری (کیسرای کوری هورمز) کەوتە ژێر دەستی موسڵمانەکان.

پێشەوا عەدی کوری حاتەم (ﷺ) دەڵێت:

رۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بووم پیاوێك هاتە لای و باسی دەستکورتی خۆیی بۆ کرد، پاشان یەکێکی تر هات باسی چەتەو رێگری لێ کرد، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەمووی:

(يَا عَدِيُّ هَلْ رَأَيْتَ الْحِيرَةَ قُلْتُ لَمْ أَرَهَا وَقَدْ أُنْبِئْتُ عَنْهَا قَالَ فَإِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتَرَيَنَّ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الْحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ لاَ تَخَافُ أَحَدًا إِلاَّ اللَّهَ - قُلْتُ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ نَفْسِي فَأَيْنَ دُعَّارُ طَيِّئٍ الَّذِينَ قَدْ سَعَّرُوا الْبِلاَدَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتُفْتَحَنَّ كُنُوزُ كِسْرَى قُلْتُ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ قَالَ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتَرَيَنَّ الرَّجُلَ يُخْرِجُ مِلْءَ كَفِّهِ مِنْ ذَهَبٍ، أَوْ فِضَّةٍ يَطْلُبُ مَنْ يَقْبَلُهُ مِنْهُ فَلاَ يَجِدُ أَحَدًا يَقْبَلُهُ مِنْهُ وَلَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ يَلْقَاهُ وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ يُتَرْجِمُ لَهُ فَيَقُولَنَّ أَلَمْ أَبْعَثْ إِلَيْكَ رَسُولاً فَيُبَلِّغَكَ فَيَقُولُ بَلَى فَيَقُولُ أَلَمْ أُعْطِكَ مَالاً وَأُفْضِلْ عَلَيْكَ فَيَقُولُ بَلَى فَيَنْظُرُ عَنْ يَمِينِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ جَهَنَّمَ وَيَنْظُرُ عَنْ يَسَارِهِ فَلاَ يَرَى إِلاَّ جَهَنَّمَ قَالَ عَدِيٌّ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقَّةِ تَمْرَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ شِقَّةَ تَمْرَةٍ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ قَالَ عَدِيٌّ فَرَأَيْتُ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنَ الْحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ لاَ تَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ وَكُنْتُ فِيمَنِ افْتَتَحَ كُنُوزَ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ وَلَئِنْ طَالَتْ بِكُمْ حَيَاةٌ لَتَرَوُنَّ مَا قَالَ النَّبِيُّ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ) يُخْرِجُ مِلْءَ كَفِّهِ)[١].

واتە: ئەی عەدی (ﷺ) شاری حیرەت[٢] دیوە؟ گوتم: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەمدیوە، بەڵام باسیان بۆ کردووم، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی: ئەگەر تەمەنت درێژ بێ، دەبینیت ئافرەتی نێو کەژاوە لە حیرەوە سەفەر دەکات تا

---

(١) صحيح البخاري ، كتاب الزكاة، باب الصدقة قبل الرد، رقم: (٣٥٩٥) .

(٢) شارێکە لە عێراق سێ میل لە کوففەوە دوورە.

دەگاتە کەعبە، بێجگە لە خوا لە کەسی تر ناترسێت، عەدی (ﷺ) دەڵێت: لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەی ئەو کاتەی بەدڕەوشتانی خەڵکی (طهی) لە کوێن، ئینجا فەرموی: ئەگەر ژیان مەودات پێ بدات گەنجینەی کیسرا وە دەست دێنن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کیسرای کوڕی هورمز، فەرمووی:

بەڵێ.. کیسرای کوڕی هورمز، ئەی عەدی (ﷺ) ئەگەر تەمەنت درێژ بێت دەبینیت پیاو پڕ بە چەنگی زێڕ یان زیو دەردەهێنێ و داوا دەکات لە یەکێك کە لێی وەربگرێت، جا کەس لێی وەرناگرێت، وە هەر یەکێکیشتان لە ڕۆژی دواییدا خودا دەبینێت، هیچ وەرگێڕێکیش لە نێوان بەندەو خوادا نیە؟ ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەی پێغەمبەرم بۆ نەناردی تا پەیامت پێ بگەینێت؟ دەڵێ:

بەڵێ.. دەفەرمووی: ئەی ماڵ و بەهرەم پێ نەبەخشیت، دەڵێ:

بەڵێ.. جا تەماشای لای ڕاستی دەکات دۆزەخ دەبینێت، تەماشای لای چەپی دەکات هەر دۆزەخ دەبینێت، جا عەدی (ﷺ) دەڵێت: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست دەیفەرموو: بە دەنکە خورمایەکیش بێت خۆتان لە ئاگر بپارێزن، جا ئەوەی ئەم دەنکە خورمایەشی نەبوو با بە وشەیەکی باش و شیرین خۆی بپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، عەدی (ﷺ) دەڵێت:

جا کەژاوەکەم دیت لە حیرەوە دەهات تا دەگەیشتە کەعبەو تەوافی ماڵی خوای دەکرد، جگە لە خودا لە کەسی تر نەدەترسا، وە منیش یەکێ بووم لەوانەی کە گەنجینەی کیسرای کوڕی هورمزمان دەکردەوە، ئەگەر ئێوەش تەمەنتان درێژ بێت ئەوەش دەبینن کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی فەرمووە کە پیاو پڕ چەنگی زێڕو زیو دەردێنێت.

# وەفاتکردنی هاوەڵە بەڕێزەکان (ڕەزای خوایان لی بێت)

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) چاکترینی ئەم ئوممەتەن لە پاش پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(.. النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ، وَأَنَا أَمَنَةٌ لِأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ، وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ)[١].

واتە: ئەستێرەکان پارێزەری ئاسمانن، هەر کاتێك ئەستێرەکان نەمان ئەوەی بەڵێنی خوا کە تێکچونی ئاسمانە دێتە دی، منیش پارێزەرم بۆ هاوەڵانم، بە ڕۆیشتنی من یارانیش دووچاری ئەو بەڵێنە دەبنەوە کە دراوە واتە: ئەوانیش نامێنن، هاوەڵانیشم پارێزەرن بۆ ئوممەتەکەم، ئەگەر هاوەڵانم ڕۆیشتن ئوممەتەکەشم دووچاری ئەو بەڵێنە ئەبنەوە کە دراوە.

لەم فەرموودەیە پێغەمبەر(ﷺ):

- نەمانی هاوەڵانی بەستووە بە نەمانی دوو نیشانە لە نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر، نەمانی ئەستێرەکان و مردنی پێغەمبەر(ﷺ).
- جێگیر بووە لە فەرموودەکاندا کە پیاوچاکان لەناو دەچن بەدوا یەکتردا کۆتایی بونەوەریش لەسەر خراپترین خەڵك هەڵدەستێت.

---

(١) صحیح مسلم (٤/ ١٩٦١) باب: بیان أن بقاء النبي(ﷺ)، برقم: (٢٥٣١).

شەهید کردنی پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب :

یەکێ لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی شەهید کردنی پێشەوا عومەری کوڕی خەتابە (ﷺ).

خیلافەتی پێشەوا عومەر(ﷺ) بەربەستێکی توندو تۆڵ بوو بەرامبەر ئاشوب، خودی خۆی دەرگایەکی داخراو بوو بەڕووی ئاشوب و ئاشوب گێڕەکان، لە ژیانی پێشەوا عومەردا نەیانتوانی بێنە ناویەوە، ئاشوبیش لە سەردەمی ئەودا نەیتوانی سەر بڵند بکا بەڵام هەر کە پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) شەهید بوو بەربەستی ئاشوب لاچوو، ئەو دەرگایەی بەربەستی فیتنەچیانی دەکرد لە تێکدانی ژیان و کاروباری موسڵمانان بە یەکدا شکاو والابوو.

با گوێبیستی ئەم گفتوگۆیە سەیرەی نێوان (عومەری کوڕی خەتاب و حوزەیفەی کوری یەمان) بین، چونکە زانستی چاکمان لەو ڕوداوە دەست دەکەوێت.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: (كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ حَدِيثَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي الْفِتْنَةِ كَمَا قَالَ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: أَنَا، قَالَ: إِنَّكَ لَجَرِيءٌ، وَكَيْفَ قَالَ؟ قَالَ: قُلْتُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَنَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ، يُكَفِّرُهَا الصِّيَامُ، وَالصَّلَاةُ، وَالصَّدَقَةُ، وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ، فَقَالَ عُمَرُ: لَيْسَ هَذَا أُرِيدُ، إِنَّمَا أُرِيدُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَوْجِ الْبَحْرِ، قَالَ: فَقُلْتُ: مَا لَكَ وَلَهَا، يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا، قَالَ: أَفَيُكْسَرُ الْبَابُ أَمْ يُفْتَحُ؟ قَالَ: قُلْتُ: لَا، بَلْ يُكْسَرُ، قَالَ: ذَلِكَ أَحْرَى أَنْ لَا يُغْلَقَ أَبَدًا، قَالَ: فَقُلْنَا لِحُذَيْفَةَ: هَلْ كَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ مَنِ الْبَابُ؟ قَالَ: نَعَمْ، كَمَا يَعْلَمُ أَنَّ دُونَ غَدٍ اللَّيْلَةَ، إِنِّي حَدَّثْتُهُ حَدِيثًا لَيْسَ بِالْأَغَالِيطِ، قَالَ: فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَ حُذَيْفَةَ: مَنِ الْبَابُ؟ فَقُلْنَا لِمَسْرُوقٍ: سَلْهُ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: عُمَرُ)[1].

واتە: ڕۆژێکیان لە خزمەت عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) بووین، گوتی: کامتان فەرموودەی پێغەمبەری (ﷺ) لە بارەی ئاشوب؟

(١) صحيح مسلم (٨/ ١٧٣) باب: في الفتنة التي تموج كفتنة البحر، برقم:(٧٤٥٠).

بەرگی یەکەم

حوزەیفەی کوری یەمان(ﷺ) دەڵێت: گوتم: من !

پێشەوا عومەر (ﷺ) گوتی: دە بۆمان بڵێ بە ڕاستی چاو نەترسی، گوتم: گوێبستی پێغەمبەری خوابووم(ﷺ) دەیفەرموو: مرۆڤ بە هۆی ماڵ و منداڵ و نەفس و دراوسێوە توشی ئاشوب دەبێ، ڕۆژو نوێژو سەدەقەو فەرمان بە چاکەو بەربەستی لە خراپە دەیانسڕێتەوە.

پێشەوا عومەر(ﷺ) گوتی: ئەی حوزیفە مەبەستم ئەوە نیە، مەبەستم ئەو فیتنانەیە کە وەکو دەریا شەپۆڵ دەدەن، گوتم: ئەی ئەمیری بڕواداران تۆ ئەوەت بۆ چیە؟ لە نێوان تۆ و ئەو فیتنانەدا دەرگایەکی داخراو هەیە؟

پێشەوا عومەر (ﷺ) گوتی: باشە دەرگاکە دەشکێندرێ یان دەکرێتەوە، گوتم: نا بەڵکو دەشکێنرێ، ئەبو وائیل (ﷺ) دەڵێت: بە حوزەیفەم گوت: ئایا عومەر دەیزانی دەرگاکە کێیە؟

پێشەوا حوزەیفە(ﷺ) گوتی: بەڵێ دەیزانی، هەروەك چۆن دەیزانی لە دوای شەو ڕۆژە ئاواش دەیزانی فیتنەکە مەبەستی کێیە؟

پێشەوا مەسروق(ﷺ) دەڵێ:

بە حوزەیفەم گوت: دەرگاکە کێیە؟ گوتی: پێشەوا عومەرە، واتە: پاش شەهید کردنی پێشەوا عومەر دەرگای فیتنە دەکرێتەوە.

لە ڕاستیدا حوزەیفەی کوری یەمان(ﷺ) لە زانستی فیتنەدا پسپۆر بوو.

پێشەوا عومەریش(ﷺ) دەیزانی بە شەهید بوونی خۆی دەرگاکە دەشکێ و فیتنە بڵاو دەبێتەوەو تا ڕۆژی دوایی داناخرێ.

پێشەوا عوسمانی کوڕی مەضعون (ﷺ) دەڵێت:

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) بە دەست ئاماژەی بۆ عومەر(ﷺ) کردو فەرمووی: ئەوە داخەری دەرگای فیتنەیە، پاشان فەرمووی: تا ئەمەتان لەناودا بێت دەرگای فیتنەتان لەسەر داخراوە.



بەرگی یەکەم

کاتێك پێشەوا عومەر (ﷺ) چوو بۆ حەج لە مینا دەستەکانی بەرز کردەوەو گوتی: پەروەردگار وا پیرو لاواز بووم و فەرمان بەردارو رەعیەتەکەم بڵاو بوونەتەوە، بمبەرەوە بۆ لای خۆت بێ ئەوەی پێشڵی مافێکم کردبێ، پەروەردگارم داوای شەهیدیت لێ دەکەم و پێم ببەخشە.

پێشەوا ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) دەڵێت:

شەوێکیان خەوێکم بینی، لە خەوەکەمدا چەند ڕێگەیەك لە پێش خۆمەوە بینی، پاشان هەموو ڕێگاکان ون بون و لاچوون، تەنها ڕێگەیەکیان ماوە منیش پێیدا ڕۆیشتم تا گەیشتمە شاخێك بینیم وا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەرەوەی شاخەکەدایە، لە تەنیشتیەوە پێشەوا ئەبوبەکر (ﷺ) بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاماژەی بە پێشەوا عومەر(ﷺ) دەکردو دەیفەرموو: وەرە بۆ لامان ئینجا بە خەبەر هاتم یەکسەر زانیم پێشەوا عومەر(ﷺ) شەهید بووە.

## شەهید کردنی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفان :

پێشتر ڕوونمان کردەوە کە پێشەوا عومەر (ﷺ)دەرگایەکی داخراوی فیتنەو ئاشوب بوو، لە دوای نەمانی ئەو دەرگای فیتنە بویەوە، یەکێك لە فیتنە هەرە مەزنەکان کە یەکێکە لە نیشانەی دوا ڕۆژ شەهید کردنی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفانە (ﷺ)، کە بە هۆیەوە ئومەتی ئیسلامی لێك ترازاو پەرتەوازەیی تووش بوو، جەنگ و شەڕ لە نێوان هاوەڵان بەرپا بوو، جیاوازی دروست بوو خوێنی پاکی زۆر لە هەردوو لایەن ڕژا.

پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ساڵەی دیاری کرد بوو کە فیتنەی تێدا ڕوودەدات، لە فەرموودەی پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(ﷺ) هاتووە:

کە ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

(تَدُورُ رَحَى الْإِسْلَامُ بَعْدَ خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ أَوْ سِتّ وَثَلَاثِينَ، فَإِنْ يَهْلِكُوا فَسَبِيلُ مَنْ هَلَكَ، وَإِنْ بَقَوْا بَقِيَ لَهُمْ دِينُهُمْ سَبْعِينَ عَامًا)[١].

---

(١) معجم ابن الأعرابي (٢/ ٧٢٥) برقم: (١٤٧٠).

واتە: ئاشی ئیسلام تا سی و پێنج ساڵی تر دەگەڕێ، جا ئەگەر بە هیلاك چوون ئەوا دەچنە ڕێی فەوتان، ئەگەر دینەکەشیان بەرپا بێت حەفتا ساڵی تر بەرپا دەبێ.

پێشەوا عومەر(ﷺ) گوتی: لەوەی ماوە یان لەوەی تێپەڕیوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لەوەی تێپەڕیوە.

پێغەمبەر(ﷺ) لەم فەرموودەیە بە ئاشی ناو بردووە، چۆن ئاش دانەوێڵە ئەهاڕێ ئەویش بۆ جەنگاوەران وایە، لە کۆتایی فەرموودەکەشدا پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بە ماوەی فەرمان ڕەوایی بەنی ئومەییە کردوە کە حەفتا ساڵ بوو.

خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ جار وەسیەت بۆ پێشەوا عوسمان (ﷺ) دەکات، کە ئەگەر ڕۆژێك کاروباری موسڵمانانی گرتە دەست و دووڕووەکان ویستیان ئەو کارەی لەبەردا بماڵن با بە گوێیان نەکات، وەکو دەفەرموێ: (يا عُثْمَانُ إِنَّهُ لَعَلَّ اللَّهَ يُقَمِّصُكَ قَمِيصًا، فَإِنْ أَرَادُوكَ عَلَى خَلْعِهِ فَلاَ تَخْلَعْهُ لَهُمْ)[١].

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) باسی فیتنەیەکی کرد کە لە دوای خۆی ڕوودەدات، پاشان ئاماژەی بۆ عوسمان کردو فەرمووی: (يُقْتَلُ فِيهَا هَذَا مَظْلُومًا لِعُثْمَانَ)[٢]. واتە: لە فیتنەیەکدا ئەو پیاوە بە ستەم لێکراوی دەکوژرێت.

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەڵێت:

جارێکیان پێغەمبەرو(ﷺ) ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان لەسەر کێوی ئوحد بوون، کێوەکەش هاتە لەرزین پێغەمبەریش(ﷺ) فەرموی:

---

(١) سنن الترمذي، (٦/ ٦٩) باب: في عثمان بن عفان (رضي الله عنه)، برقم: (٣٧٠٥). وقال الترمذي: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

(٢) سنن الترمذي، (٦/ ٧٥) باب: مناقب في عثمان بن عفان (رضي الله عنه)، برقم: (٣٧٠٨). وقال الترمذي: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ.

(أَثْبُتْ أُحُدُ مَا عَلَيْكَ إِلَّا نَبِيٌّ، وَصِدِّيقٌ، وَشَهِيدَانِ)[١]. واته: خۆڕاگر بە ئەی ئوحد ئەوەی لەسەرت ڕاوەستاوە تەنها پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و دوو شەهیدە.

بەڵێ.. پێغەمبەر(ﷺ) زوو پێشەوا عوسمانی(ﷺ) ئاگادار كردۆتەوە بەوەی كە توشی نەهامەتیەكی گەورە دەبێت و دەبێ ئارامیشی هەبێت لەسەر ناخۆشیەكان، بۆیە ڕێگەشی نەدا بە هیچ لە هاوەڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ) كە دەست بدەنە چەك بۆ پارێزگاریكردنی بەڵكو سوور بوو لەسەر ئەوەی كە نابێت لەسەر ئەو یەك دڵۆپە خوێن بڕژێ.

پێشەوا حوزەیفەی كوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: (أَوَّلُ الْفِتَنِ قَتْلُ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْهِ، وَآخِرُ الْفِتَنِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يَمُوتُ رَجُلٌ وَفِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ حُبِّ قَتْلِ عُثْمَانَ إِلَّا تَبِعَ الدَّجَّالَ إِنْ أَدْرَكَهُ، وَإِنْ لَمْ يُدْرِكْهُ آمَنَ بِهِ فِي قَبْرِهِ)[٢].

واته: یەكەم فیتنە شەهید كردنی عوسمانە

كۆتاییەكەشی دەرچوونی دەجالە

سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ كەسێك نامرێت ئەگەر بە قەد تۆزقاڵێك حەز بكات بە كوشتنی عوسمان ئیلا شوێن دەجال دەكەوێت ئەگەر پێی بگات، ئەگەر پێی نەگات ئەمین دەبێت لەناو گۆڕ.

لەم فەرمایشتانەی ڕابردوو بۆمان دەركەوت كە شەهیدبوونی پێشەوا عوسمان ئاشوێكی گەورەیەو نیشانەیەكی ڕوونە لە نیشانەكانی نزیك بوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی.

---

(١) صحيح البخاري، (٥/ ١٥)، باب: مناقب عثمان بن عفان (رضي الله عنه)، برقم: (٣٦٩٩).

(٢) المجالسة وجواهر العلم، (٢/ ١٦٤)، برقم: (٢٨٦).

## ڕووداوی جەنگی (جەمەل)

یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی جەنگی (جەمەل)ە لە نێوان لەشکری پێشەوا عەلی و(ﷺ) لەشکری عائیشە (ڕەزای خوایان لێ بێ).

پێش ئەوەی باس لەم بابەتە بکەم، پێم باشبوو چەند هەڵوەستەیەك بەرامبەر ئەو ڕووداوانە بکەین.

هەڵوێستی موسڵمان دەبێ چۆن بێ بەرامبەر بە (فیتنە)و ئاشوبی نێوان هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

خودای کار بەجێ پێدا هەڵگوتنی هاوەڵەکانی لە قورئانی پیرۆز تۆمار کردووە، جا چ کۆمەڵ کۆمەڵ وەکو کۆچکەران (موهاجرین) بەجیاو پشتیوانان (ئەنصار) بەجیا یان بە گشتی و هەموویان بەیەکەوە جا قسە پێ گوتن و سوکایەتی پێکردن و بێ ڕێزی کردن لەگەڵیان دەبێتە مایەی ئازاردانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەشیان قەدەغە کراوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿٥٨﴾ ][1].

واتە: بەڕاستی کەسانێك کە ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن خوا نەفرینی لێکردوون لە دونیاو ئاخیرەتدا، وە سزای ڕیسواکەری بۆ ئامادەکردوون، وە کەسانێ ئازاری پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار دەدەن، بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێ ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوختان و تاوانێکی ئاشکرایان گرتۆتە ئەستۆ.

---

(١) سورة الأحزاب، الآية: (٥٧ - ٥٨).

هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە پێش و سەروی بڕواداران گەر بۆ بڕواداران بە گشتی لە ڕەگەزی نێرو میێ تاوانی گەورەو ئاشکراو بوهتانی پێ ئازاردان و قسە پێگوتنیان و بێ ڕێزی لەگەڵ کردنیان بێت ئەوە بۆ هاوەڵان حەوت جار تاوانترو قەدەغەیە.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویێ: (لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلاَ نَصِيفَهُ)[١].

واتە: جنێو بە هاوەڵەکانم مەدەن سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر یەکێك لە ئێوە هاو نمونەی چیای ئوحد لە ئاڵتون ببەخشێ ناگاتە مستێکی یەکێك لە هاوەڵانم وە ناگاتە نیوەشی.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرمویێ: (مَنْ سَبَّ أَصْحَابِي فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ)[٢].

واتە: هەر یەکێك جنێو بە هاوەڵانم بدا، نەفرینی خودای لەسەرە.

لەم فەرموودانەوە دەردەکەوێت کە موسڵمان دەبێ زۆر بەڕێزو خۆشەویستەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بکات، بۆیە دەبێ زمانمان بگرین لە قسەی ناشیاو بەرامبەریان.. ئەوەی بێ ڕێزیان لەگەڵدا بکات با بزانێ دووچاری تاوانی گەورە بووە، وە بەر نەفرینی خوداو فریشتەو خەڵکی دەکەوێت و پێغەمبەری(ﷺ) ئازار داوە..

پێشەوا ئەحمەدی کوری حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: لە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراو زاندراو ئەوەیە کە باشیەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەمویان تێکرا باس بکرێت، واز بێنن لە باس کردنی خراپەکانیان، هەر یەکێك جنێو بدا بە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) یان بە یەکێکیان لەوان یان لە پلەو پایەیان کەم بکاتەوە یان تانەو تەشەرەیان لێ بدا، یان کەم و کورتیەکانیان بخاتە ڕوو، یان عەیبداری یەکێکیان بکات، ئەوە داهێنەرێکی شیعەی پیسەو خودا هیچی لێوەرناگرێت[٣].

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ١٩٦٧) باب: تحريم سب الصحابة، برقم: (٢٥٤٠).

(٢) المعجم الكبير (١٢/ ١٤٢) برقم: (١٢٧٠٩).

(٣) السنة: الإمام أحمد بن حنبل لا ٧٨.

پاش شەهید کردنی پێشەوا عوسمان بە دەستی فیتنە گێڕان، موسڵمانانی شاری مەدینە پێشەوا عەلیان کرد بە خەلیفەو بەیعەتیان پێدا، بەڵام ژمارەیەك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەوانە (طلحة) و (زوبەیر) کە زۆر دڵ پڕ بوون بە شەهید کردنی پێشەوا عوسمان(ﷺ)، داوایان کرد کە دەست و برد تۆڵە بستێننەوە لە بکوژانی پێشەوا عوسمان(ﷺ)، بەڵام پێشەوا عەلی گوتی: ئەم کارە بە پەلە ناکرێت هەتا تەواو بۆمان یەك لا نەبێتەوە، کێ بوون ئەوانەی کە کوشتیانەو دەبێت کەس و کاری عوسمانیش داوای خوێنەکەی بکەن، بەڵام (طلحەو زوبەیر) بەوە قایل نەبوون و بە ناوی عومرە کردنەوە لە شاری مەدینە دەرچوون، لە شاری مەککەدا چاویان بە عائیشە دایکی بڕواداران کەوت کە هێشتا لە سەفەری حەج نەگەڕابویەوە، قەناعەتیان پێ کرد کە دەبێت داوای خوێنی عوسمان بکرێت و تۆڵە لە بکوژانی دەبێ بسەندرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دەستیان کرد بە وتاردان و حەماسەت کردن بە بەری خەڵکدا تا توانیان بە هاوکاری یەعلای کوڕی ئومەیە(ﷺ) کە پێشەوا عوسمان (ﷺ) کردبووی بە ئەمیری (صەنعاء) لە یەمەن لەشکرێکی گەورە کۆ بکەنەوە، حوشترێکیشی پێشکەش کرد بە دایکمان عائیشە کە ناوی (عەسکەر) بوو، کە دواتر شەڕەکە بە ناوی حوشترەکە ناونرا، ئەمەو لەشکرەکە بەرەو شاری بەسرە کەوتنە ڕێ، کە نزیکەی (٦٠٠) کەس لەوانەی بەشداریان کردبوو لە کوشتنی پێشەوا عوسماندا پەنایان بردبووە بەر ئەو شارە، لەلایەکی تریشەوە پێشەوا موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان(ﷺ) کە ئەمیری وڵاتی شام بوو ڕازی نەبوو بەیعەت بدات بە ئیمامی عەلی هەتا تۆڵە لە بکوژانی پێشەوا عوسمان نەکاتەوە کە هێشتا ژمارەیەکی زۆریان لە شاری مەدینەدا مابوون[1].

پێشەوا عەلیش (ﷺ) هەردوو هەڵوێستەکەی موعاویەو(ﷺ) (طلحەو زوبەیر)ی بە دەرچوون لە فەرمان و سەرپێچی کردن لە فەرمانی خەلیفە لە قەڵەمدا، بۆیە لەشکرێکی سازداو بڕیاریدا یەکەمجار (طلحەو زوبەیرو عائیشە) بگێڕێتەوە ژێر فەرمانی خەلیفە، پاشان ڕوو بکاتە موعاویە.

---

(١) فتح الباري (١٣/ ٢٦) .

هاوەڵەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) لە ئاست ئەو ڕووداوە بوون بە سێ بەشەوە، کۆمەڵێکیان پشتگیری هەڵوێستی پێشەوا عەلییان(ﷺ) دەکرد، وە کۆمەڵێکیان پشتگیریان لە هەڵوێستی (طلحەو زوبەیر) کرد، کۆمەڵی سێەمیشان مەسەلەکە بە فیتنەیەکی گەورە تێدەگەیشتن کە بۆنی خوێن ڕژانێکی گەورەی لێ دەهات، بۆیە پشتگیری هیچ لایەنێکیان نەکردو پێیان وابوو کە نابێت کێشەکە بە شەڕ چارەسەر بکرێت، لەوانەش (عەبدوڵلای کوڕی عومەرو عەبدوڵلای کوڕی عەباس و ئەبو موسای ئەشعەری) و ژمارەیەکی تر لە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێ).

پاش ئەوەی سوپاکەی دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) گەیشتە شاری (بەسرە)، عوسمانی کوڕی حونەیف(ﷺ) کە ئەمیری شاری بەسرە بوو عیمرانی کوری حوصەینی(ﷺ) نارد کە یەکێك بوو لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ لای سوپاکە تا بزانێت مەبەست لە هاتنیان چیە؟ پاش وتوێژو هاتووچۆیەکی زۆر لە نێوان هەردوولا نەگەیشتنە هیچ ئاکامێك، پاشان هەندێك پێیان هەڵپژان لە نێوان سوپاکەی ئەمیری بەسرەو لەشکرەکەی عائیشە کە بووە هۆی گرتنی عوسمانی کوڕی حونەیف(ﷺ) ئەمیری بەسرە لەلایان لەشکری عائیشەوە، دواتر ڕەوانەی لای پێشەوا عەلی(ﷺ) کرا، ئیتر هیچ بەربەستێك نەما لە نێوان لەشکرەکەی عائیشەو بکوژانی پێشەوا عوسماندا(ﷺ)، بکوژانی پێشەوا عوسمانیش(ﷺ) کە زانیان چوار دەوریان گیراوەو چاریان ناچارە هەموویان کۆبوونەوە کە ژمارەیان لە (٣٠٠)کەس زیاتر بوو، بە سەرۆکایەتی حەکیمی کوری جبلە پەلاماری لەشکرەکەی عائیشەیاندا، لە ئاکامدا هەر هەموویان کوژران تەنها یەك کەسیان نەبێت کە توانی هەڵبێت و پەنای دایە بەر خێڵی (بەنی سەعد)[١].

پاشتریش بانگەواز کرا بەناو شاری بەسرەو هەموو خێلەکانی چوار دەورەدا کەوا کێ بەشداری کردووە لە فیتنەی کوشتنی پێشەوا عوسمان(ﷺ) با تەسلیم بکرێت، دواتر هەمویان تەسلیم کران و کوژران، بەم شێوەیە هەموو ئەوانەی کە دەستیان هەبوو لە پیلانی کوشتنی پێشەوا عوسمان و(ﷺ) پەنایان بۆ شاری

---

(١) فتح الباري (١٣/ ٢٧) .

بەسرە بردبوو تۆڵەیان لێ سەندرایەوە ، تەنها ئەوانە مابوون کە لە شاری مەدینەدا مابونەوەو لەگەڵ سوپاکەی ئیمامی عەلی دا خۆیان تێهەڵکێش کردبوو[١].

پاشان سوپاکەی پێشەوا عەلی گەیشتە شاری ( زیقار) لە نزیك بەسرەوە، لەوێوە قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی(ﷺ) کە یەکێك بوو لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، وەك نێرداوی خۆی ڕەوانەی بەسرە کرد، بەڵکو بتوانێت قەناعەت بە عائیشەو طلحەو زوبەیرو سوپاکەی بکات کەوا بگەڕێنەوە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی خەلیفە، ئەویش لە پاش وتووێژێکی زۆر لەگەڵیاندا پێی گوتن: ئێوە لەو (٦٠٠) نەفەرەی کە بەشدار بوون لە پیلانی کوشتنی پێشەوا عوسمانداو(ﷺ) پەنایان بردبۆوە بەر شاری بەسرە هەموویانتان کوشتن تەنها یەك نەفەریان دەرباز بووە، ئەوانەشی کە هێشتا ماون لە شاری مەدینەو شوێنەکانی تر یاخود خۆیان تێکەڵکێش کردووە لەگەڵ سوپاکەی پێشەوا عەلی(ﷺ)، ئەگەر ئێوە ڕێ بکەونەوە لەگەڵ خەلیفەو بگەڕێنەوە ژێر ڕکێفی ئەو، ئەوا بە هاوکاری هەردوولا بژار دەکرێن و بە سزای خۆیان دەگەیەنرێن، ئەگەریش بەوە ڕازی نەبن ئەوا ئوممەتی ئیسلام دووچاری فیتنەیەك دەکەن کە بیدایەتی دیارەو کۆتاییەکەشی خودا نەبێت کەس نازانێت، لە دوای ئەم قسانە عائیشەو طلحەو زوبەیر قەناعەتی تەواویان کردو بە قەعقاعیان(ﷺ) فەرموو: ئێمە ئامادەی سوڵحین هەرکاتێ پێشەوا عەلی هات و هەمان قەناعەت و هەڵوێستی تۆی هەبوو، ئێمەش ئامادەین بگەڕێینەوە ژێر ڕکێفی و لە فەرمانی دەرنەچین، کاتێ کە قەعقاع هەڵوێستی ئەوانی بە پێشەوا عەلی (ﷺ) گەیاند، ئەویش زۆری پێ خۆش بوو بە کارێکی ئاقڵانەی زانی و بە ئاکامێکی دڵخۆشکارانەی لە قەڵەمدا، بە خۆی و سوپاکەیەوە بەرەو شاری بەسرە بە ڕێکەوتن هەتا لەگەڵ عائیشەو طلحەو زوبەیر پێکەوە کۆببنەوەو کۆتایی بە کێشەکە بهێنن، بەڵام کاتێك ئەو پیلان گێڕانەی بەشداربوون لە کوشتنی پێشەوا عوسمان(ﷺ) خۆیان تێهەڵکێش کردبوو لەگەڵ سوپاکەی پێشەوا عەلی(ﷺ) بەم گۆڕانکاریە تازەیان زانی، دڵنیابوون کە هەر ئاشتیەك لە نێوان ئەم دوو لایەنەدا ڕوویدات

---

(١) فتح الباري (١٣/ ٢٧ ـ ٢٨) .

لەسەری ئەماندا دەشكیٚ و عاقیبەت بە دەردی كۆمەڵەكەی بەسرە دەچن، بۆیە بە پەلە كەوتنە خۆیان لە نێوان خۆیاندا كۆبوونەوەو بڕیاریاندا كە تاكە چارەسەر ئەوەیە كە بە هەر شێوەیەك بێت نەهێڵن ئەو سوڵحە ڕووبدات، بۆ ئەم مەبەستەش لەسەر ئەوە ڕێكەوتن هەر كاتێك گەیشتنە بەسرە پێش ئەوەی سوڵحەكە ئەنجام بدرێت ئەوان تێك هەڵپژان دروست بكەن و ئاگری شەڕ لە نێوان هەردوولا هەڵبگیرسێنن، ئەوەبوو پیلانەكەیان بۆ چووە سەرو پێش ئەوەی وتوێژی ئاشتی و سوڵحەكە بە ئاكام بگات ئەمان ئاگری شەڕیان لە نێوان هەردوولا هەڵگیرساندو هەر لایەنەو وایزانی لایەنەكەی تر فێڵی لیٚ كردووەو غافلاندیەتی و پەلەماری داوە، شەڕەكە لە ناوچەی (زابوقە)ی نزیك بەسرە لەبەرە بەیانی ڕۆژی جومعەی ڕێككەوتی شازدەی جەمادی دووەمی ساڵی (٣٦)ی كۆچی دەستی پێكرد، وە تا درەنگانێكی شەو بەردەوام بوو، شەڕەكە هێندە گەرم بوو كە هەر چەند سەركردەكانی هەردوولا هاواریان دەكرد بۆ خاتری خودا شەڕەكە ڕاگرن، بەڵام كەس بە قسەی نەدەكردن، وە لە گەرمەی شەڕەكە پێشەوا عەلی و زوبەیر بە سواری ئەسپەكانیانەوە بە یەك گەیشتن، پێشەوا عەلی(ﷺ) بە زوبەیری فەرموو: زوبەیر ئەم لەشكرە گەورەتان ئاوا سازداوە بەڵام هیچ عوزرێكتان بۆ ڕۆژی دوایی ئامادەكردووە، زوبەیر سوێندت دەدەم بە خوا لە بیرتە كە پێغەمبەر(ﷺ) پێی گوتی: ڕۆژێك دێت و شەڕ لەگەڵ عەلی دەكەیت و تۆش ستەمی لیٚ دەكەیت، كاتیٚ زوبەیریش ئەو فەرمودەیەی بیر كەوتەوە گوتی: بەڵیٚ، بەڵام سوێند بە خوا ئێستا بیرم دەكەوێتەوە، ئەگەر لە بیریشم بوایە هەرگیز شەڕم لەگەڵ نەدەكردیت و ڕووبەڕووت نەدەوەستام[1]، هەر بۆیە زوبەیر گۆڕەپانی شەڕەكەی بەجیٚ هێشت و دووركەوتەوەو لە بن دارێكدا لێی ڕاكشا، هێندە هیلاك و خەفەت بار بوو یەكسەر خەوی لیٚ كەوت، بەڵام یەكێك لە پیلان گێڕەكان كە ناوی (عەمری كوری جەرموز)بوو چاوی لیٚ بوو بە تەنها ڕۆیشت شوێنی كەوت و لە بن دارەكەدا فرسەتی هێناو شەهیدی كرد، پاشان بە خۆشیەوە گەڕایەوە بۆ لای پێشەوا عەلی و پێی گوت: مژدەم بەریٚ

---

(١) المستدرك (٣/ ٣٦٦) برقم: (٥٥٧٣).

زوبەیرم کوشت، پێشەوا عەلیش(ﷺ) بە بیستنی هەواڵەکە دەستی کرد بە گریان و پێی گوت: نەفرەتی خوات لێ بێت، ئەی نازانیت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: موژدەی ئاگر بدەن بەو کەسەی زوبەیری کوڕی صەفیە(ﷺ) دەکوژێت.

پێشەوا طەلحەش(ﷺ) لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا بە خەستی بریندار بوو، پاشان بردیانە ماڵێکەوە لە بەسرە لەوێ وەفاتی کرد، عائیشەش (ڕەزای خوای لێبێ) بە سواری حوشترەکەیەوە بەناو شەڕکەرەکاندا هاواری دەکرد کە شەڕەکە ڕابگرن، داوای لە (کەعبی کوڕی سور)کرد کە قازی شاری بەسرە بوو قورئان بەرز بکاتەوە لە نێوان هەردوولا بەڵکو شەرم بیانگرێت و شەڕەکە ڕابگرن، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەویشیان کوشت، شەڕەکە لە دوای نیوەڕۆدا لە بەردەم حوشترەکەی عائیشەدا گەیشتە ئەو پەڕی توندی و لە ئەنجامدا حوشترەکەی عائیشە کوژراو کەژاوەکەی عائیشە کەوتە سەر زەوی، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی کە سوپای عائیشە ورەیان بڕوخێت و بشکێن و شەڕەکە کۆتایی بێت[1].

پاشان (محەممەدی کوڕی ئیمامی ئەبوبەکر) کە برای عائیشە بوو، لە لەشکرەکەی ئیمامی عەلی بوو لەگەڵ پێشەوا عەلی گەیشتنە سەر کەژاوە کەوتوەکەی عائیشە، بەڕێزەوە هێنایەنە دەرەوەو پێشەوا عەلی سەلامی لێ کردو پێی فەرموو: دایە گیان خودای گەورە لە ئێمەو ئێوەش خۆش بێت، عائیشەش وەڵامی دایەوەو فەرموی: بەڵێ کوڕم خودای گەورە لە ئێمەو ئێوەش خۆش بێت، پاشان گواستیانەوە بۆ ماڵی (عەبدوڵلای کوڕی خەلەفی خوزاعی) دوای چەند ڕۆژێك بەو پەڕی ڕێزەوە بە هاورێیەتی(٤٠) ئافرەتی ناوداری شاری بەسرە بەرەو شاری مەککەی بەرێ کرد.

پاشان پێشەوا عەلی نوێژی مردووی لەسەر کوژراوەکانی هەردوو لەشکرەکە کردو دۆعای خێری بۆ هەموویان کرد.

پاش شەڕەکە پێشەوا عەلی(ﷺ) چەند ڕۆژێك لە بەسرە مایەوەو کاروباری ڕێکخستەوەو هێمنی و ئارامی بۆ شارەکە گێڕایەوەو پاشان بەرەو شاری کوفە

---

(١) فتح الباري (١٣/ ٢٨) .

کەوتە ڕێ و لەوێ نیشتەجێ بوو کردی بە پایتەختی خیلافەتی ئیسلام ئەو پایتەختەی کە زۆر کەم دەوامی کرد.

ئەمە کورتەی یەکەم بوو کە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) دەستیان تیایدا چووە خوێنی یەکتر و هەتا ئەمڕۆش دەرگای ئەو فیتنەیە دانەخراوەو تا ڕۆژی دواییش داناخرێت.

ئەمەو سەبارەت بەو فیتنەیە ئیمامی حاکم لە پێشەوایان عەلی و طلحە (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەگێرتەوە کە ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) بە زوبەیری فەرموو: (أَتُحِبُّهُ؟ فَقُلْتُ: وَمَا يَمْنَعُنِي؟ قَالَ: أَمَا إِنَّكَ سَتَخْرُجُ عَلَيْهِ وَتُقَاتِلُهُ وَأَنْتَ ظَالِمٌ)[1].

واتە: ئەی زوبەیر تۆ عەلیت خۆش دەوێت؟ گوتم: چ شتێك قەدەغەم دەکات لە خۆشەویستی، فەرمووی: دەزانیت ڕۆژێك دێت لێی هەڵدەگەڕێیتەوەو کوشتاری لەگەڵ دەکەیت تۆش ستەمکاری بەرامبەری.

پێشەوا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە خێزانەکانی خۆی فەرمووە:

(أَيَّتُكُنَّ صَاحِبَةُ الْجَمَلِ الْأَدْبَبِ، تَخْرُجُ فَتَنْبَحُهَا كِلَابُ الْحَوْبِ، يُقْتَلُ عَنْ يَمِينِهَا وَشِمَالِهَا قَتْلَى كَثِيرٌ، ثُمَّ تَنْجُو بَعْدَمَا قَدْ كَادَتْ)[2].

واتە: کامتانن خاوەنی حوشترە دەم و چاو توکاویەکە، بەڕێ دەکەوێت و دەڕوات هەتا سەگەکانی (حەوئەب)[3] لێی دەوەڕن لە لای ڕاستی و لە لای چەپیەوە خەڵکێکی زۆر دەکوژرێن، ڕزگاری دەبێت لە دوای ئەوە نزیکە قوتاری نەبێت و بکوژرێت.

---

(١) المستدرك (٣/ ٤١٢) برقم: (٥٥٧٣)، قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

(٢) مسند البزار (١١/ ٧٣) برقم: (٤٧٧٧)، وقال ابن حجر: رجاله ثقات.. وقال الحافظ ابن حجر: سنده على شرط الصحيح (فتح الباري ١٣/ ٥٥).

(٣) حەوئەب: شوێنێکی لەسەر ڕێگای شاری (بەسرە). معجم البلدان (٢/ ٣١٤).

دایکی سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە باسی ئەوەی کردووە یەکێك لە خێزانەکانی بۆ شەڕ دەچێتە دەرەوە، عائیشەش دەستی کرد بە پێکەنین، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو: (انْظُرِي يَا حُمَيْرَاءُ، أَنْ لَا تَكُونِي أَنْتِ ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَى عَلِيٍّ فَقَالَ: إِنْ وُلِّيتَ مِنْ أَمْرِهَا شَيْئًا فَارْفُقْ بِهَا)[1].

واتە: ئاگاداربە سورە[2] تۆ نەبیت، پاشان ئاوڕی دایەوە بە لای عەلیداو پێی فەرموو: ئەی عەلی ئەگەر کارێکی عائیشە کەوتە دەست تۆ نەرم بە لەگەڵیداو توند مەبە.

پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەرنەچوو بوو بۆ شەڕ، بەڵکو دەرچوو بوو بە نیەتی ئاشتەوایی نێوان موسڵمانان، وا گومانی بوو کە دەرچوونەکەی بەرهەمی چاکی دەبێ پاشان روون بویەوە کە گەڕانەوەی و دەرنەچوونی چاکتر بوو، جا کاتی دەرچوونەکەی بیر دەکەوتەوەو دەگریا تاکو پێچەکەی تەڕ دەکرد، جا هەر بەم شێوەیە هەموو پەشیمان بوون لە چوونە نێو ئەم شەڕەیاندا، هەروەك پێشەوا عەلی و تەڵحەو زوبێریش پەشیمان بوونەوە لە ڕووداوی ئەم شەڕەدا[3].

بەرگی یەکەم

---

(١) المستدرك (٣/ ١٢٩) برقم: (٤٦١٠).

(٢) مەبەستی پێی دایکمان عائیشەیە (ڕەزای خوای لێ بێ) چونکە سورکار بووە.

(٣) منهاج السنة (٢/ ١٨٥).

# ڕووداوی جەنگی ( صفين )

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ڕوودانی جەنگی صفینە...

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ، وَتَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ وَدَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا دوو کۆمەڵی زۆر گەورە شەڕ لەگەڵ یەکتردا دەکەن کوشتارێکی زۆر گەورە لە نێوانیان ڕوودەدات و هەردووکیشیان داوای یەك پەیام دەکەن.

پاش ئەوەی کە پێشەوا عەلی کۆتایی بە بەرهەڵستکاریەکەی بەسرە هێناو بارودۆخی لە ناوچەکەدا هێمن کردەوە، ئاوڕی دایەوە بە لای شامدا کە لە ژێر دەسەڵاتی موعاویەدا بوو، تا ئەو ساتەش پێشەوا موعاویە (ﷺ) بەیعەتی خیلافەتی نەدابوو بە پێشەوا عەلی(ﷺ) ئامادە نەبوو لەسەر فەرمانی پێشەوا عەلی(ﷺ) دەست لە ئەمیراتی وڵاتی شام هەڵبگرێت، بۆ ئەو مەبەستە پێشەوا عەلی (جەریری کوڕی عەبدوڵلای بجلی) ڕەوانە کرد بۆ لای پێشەوا موعاویە(ﷺ) تا داوای لێ بکات بەیعەت بدات بە خەلیفەو ڕازی بێت بە فەرمانی موعاویەش پاش وتوێژکردن لەگەڵ خەڵکی شامدا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە بەیعەت نەدات بە پێشەوا عەلی(ﷺ) تا بکوژانی پێشەوا عوسمان کە ماون لە سوپاکەی پێشەوا عەلیداو ژمارەیان نزیکەی (٢٠٠٠) کەس دەبێت تەسلیم بە موعاویە(ﷺ) دەکات، چونکە پێشەوا موعاویە(ﷺ) لە ڕێی خزمایەتیەوە خۆی بە خاوەنی خوێنی پێشەوا عوسمان(ﷺ) دەزانی[2].

---

(١) صحيح البخاري (٦/ ٢٦٠٥) باب: التعاون في بناء المسجد، برقم: (٦٧٠٤).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، للبرزنجي، لا ٣٣ .

پێشەوا عەلیش پێی وابوو كە دەبێت پێشەوا موعاویە(ﷺ) پێشتر بەیعەتی پێ بدات و بێتە ژێر ڕكێفی فەرمانی خەلیفە، پاشان داوای ئەو هەقە بكات، بۆیە موعاویە(ﷺ) لە نەزەری پێشەوا عەلیدا(ﷺ) بەر هەڵستكار بوو، پێویستی دەكرد بە خۆشی بێت یان بە شەڕ بهێنرێتەوە ژێر ڕكێفی خیلافەت.

پاش ئەوەی كە هەواڵەكانی چارەسەركردنی كێشەكە بە ڕێگای ئاشتی هیچ بەرهەمێكی نەبوو، پێشەوا عەلی(ﷺ) بە خۆی و (١٢٠٠٠٠) هەزار جەنگاوەر بەرەو شام بە ڕێكەوت و پێشەوا موعاویەی كوڕی ئەبوسوفیانیش(ﷺ) بە خۆی و (٩٠٠٠٠) جەنگاوەر بەرەو ڕوویان بویەوەو لە ناوچەی(صفین) ی سەر ڕووباری فورات هەردوو سوپاكە بە یەك گەیشتن، پاشان شەڕ لە مانگی (ذی الحجه) ی ساڵی (٣٦)ی كۆچی لە نێوان هەردوو لەشكردا دەستی پێ كردو بە درێژایی مانگەكە بەردەوام بوو، بەڵام لە مانگی (موحەڕەمی ساڵی (٣٧) ی كۆچی هەردوولا شەڕیان ڕاگرت و جەولەیەكی تری وت و وێژو هەوڵێكی تری ئاشتی دەستی پێكرد .

پێشەوا عەلی(ﷺ) عەدی كوری حاتەمی طائی(ﷺ) ڕەوانە كرد بۆ لای پێشەوا موعاویە(ﷺ)، تا سەر لە نوێ هەوڵ بدات قەناعەتی پێ بكات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ژێر ڕكێفی خیلافەت و بەیعەت بدات بە پێشەوا عەلی و با چیتر خوێنی موسڵمانان و هاوەڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ) نەڕژێت[1]..

پێشەوا موعاویەش(ﷺ) لە وەڵامدا پێی فەرموو: ئێمە ڕەخنەمان نیە لە خیلافەتی پێشەوا عەلی(ﷺ)، ناشمانەوێت خیلافەتی لێ زەوت بكەین و تاوانباریشی ناكەین بە شەهیدكردنی پێشەوا عوسمان(ﷺ)، بەڵام ئەو بكوژانی عوسمانی پەنا داوە، هەر كات تەسلیمی كردینەوە ئەوا بە خەلیفە قەبوڵی دەكەین و بەیعەتی دەدەینێ، پێشەوا موعاویەش(ﷺ) لەلای خۆیەوە وەفدێكی ڕەوانە كرد بۆ لای پێشەوا عەلی(ﷺ) بە سەرۆكایەتی (حەبیبی كوری مەسلەمەی فەهری) بۆ هەمان مەبەست، بەڵام پێشەوا عەلی(ﷺ) سوور بوو لەسەر

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، للبرزنجي، لا ٣٤ .

هەڵوێستی پێشتری خۆی و موعاویەش ئامادە نەبوو لە مەرجەکەی خۆی دابەزێت و هەوڵەکانی ئاشتی سەر لە نوێ نشوستی هێنا.

ئەمجارە شەڕەکە لە یەکی مانگی (صەفەر)دا زۆر بە گەرمترو توندتر دەستی پێکردەوە تا (١٠)ی ئەو مانگەی خایاندو نزیك بوو سوپای موعاویە بشکێت، لێرەدا عەمری کوڕی عاص(ﷺ) کە زانی نزیکە سوپاکەیان بشکێت بە موعاویەی(ﷺ) فەرموو: کارێك هەیە ئەگەر بیکەین سوپاکەی ئێمەی زیاتر پێ بەهێز دەبێت و دوو بەرەکیشی پێدەکەوێتە نێوان سوپاکەی پێشەوا عەلی(ﷺ)، موعاویەش(ﷺ) فەرمووی: ئەم کارە چیە؟

پێشەوا عەمریش(ﷺ) گوتی: قورئان بەرەو پیری پێشەوا عەلی دەبەین، داوای لێدەکەین با هەردوولا لەسەر حوکمی قورئان دابەزن، دڵنیام پێشەوا عەلی(ﷺ) حوکمی قورئان ڕەت ناکاتەوە، ئەگەر ڕازی بوون ئەوا سوپاکەمان لە شکاندن ڕزگاری دەبێت، ئەگەریش نا ئەوا کۆمەڵێکیان ڕازی دەبن و کۆمەڵێکیشیان ڕازی نابن و دووبەرەکی دەکەوێتە نێوانیان و ئێمە سوودمەند دەبین.

ئەوەبوو قورئانەکەیان بەرەو پیری پێشەوا عەلی(ﷺ) برد، ئەویش فەرمووی: بەڵێ ڕازیم بە حوکمی قورئان و فەرمانی کرد شەڕەکە ڕابگیرێت لە کاتێکدا کە تەنها هەنگاوێکیان مابوو بۆ سەرکەوتن، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی کە کۆمەڵێك لە سوپاکەی پێشەوا عەلی لێی هەڵبگەڕێنەوەو لە فەرمانی دەربچن، چونکە پێیان وابوو کە هەڵخەڵەتێنراون .. دواتریش ئەو کۆمەڵە ناونران (خەواریج)، بەڵام بەم شێوەیەو بە بانگەوازو تەحکیمی قورئان شەڕەکە لە ڕۆژی جومعەی ڕێکەوتی(١٠)ی صفری ساڵی (٣٧) کۆچی کۆتایی پێ هات[1].

پاش شەڕەکە هەردوولا لێژنەیەکیان پێکهێنا کە حوکمی قورئان بەسەر هەردوولادا بچەسپێنێت و ئەبو موسای ئەشعەری(ﷺ) نوێنەری پێشەوا عەلی(ﷺ) بوو لە لێژنەکەداو عەمری کوڕی عاصیش (ﷺ) نوێنەری پێشەوا موعاویە بوو (ﷺ)، پاشان لێژنەکە سوێندی هەردوو لایدا کە پابەند بن بە

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، للبرزنجي، لا ٣٤ .

هەر بڕیارێکەوە کە لیژنەکە دەیدات و لیژنەکەش بڕیاریدا جارێك سوپای پێشەوا عەلی بگەڕێتەوە کوفەو سوپای موعاویەش بگەڕێتەوە شام و هەریەکەو ناوچەی خۆی بە دەستەوە بێت تا بڕیاری کۆتایی لیژنەکە دەردەچێت، بەم شێوەیە شەڕی (صفین) کۆتایی پێ هات و هەردوو سوپا گەڕانەوە ناوچەی خۆیان.

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە:

کە ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) بە عەمماری کوڕی یاسری (رضي الله عنه) فەرموو: (وَيْحَ عَمَّارٍ تَقْتُلُهُ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ)[1].

واتە: موژدەت لێ بێت ئەی عەممار تۆ لە لایان کۆمەڵێکی دەست درێژی کارەوە دەکوژرێیت، ئەم هەواڵەش هاتە دی لەساڵی (٣٧) کۆچی.

پێشەوا بەزار لە زەیدی کوڕی وەهبەوە(رضي الله عنه) دەڵێ:

(بَيْنَمَا نَحْنُ حَوْلَ حُذَيْفَةَ، إِذْ قَالَ:كَيْفَ أَنْتُمْ وَقَدْ خَرَجَ أَهْلُ بَيْتِ نَبِيِّكُمْ (ﷺ) فِي فِئَتَيْنِ يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ وُجُوهَ بَعْضٍ بِالسَّيْفِ؟، فَقُلْنَا: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ، وَإِنَّ ذَلِكَ لَكَائِنٌ، قَالَ: أَيْ وَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّدًا (ﷺ) بِالْحَقِّ إِنَّ ذَلِكَ لَكَائِنٌ، فَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ فَكَيْفَ نَصْنَعُ إِنْ أَدْرَكْنَا ذَلِكَ الزَّمَانَ؟، قَالَ: انْظُرُوا الْفِرْقَةَ الَّتِي تَدْعُو إِلَى أَمْرِ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَالْزَمُوهَا فَإِنَّهَا عَلَى الْهُدَى)[2].

واتە: ئێمە لای حوزەیفە(رضي الله عنه) بووین کە فەرمووی: چی دەکەن ئێوە وا ئەهلی دینتان دەرچوون و هەندێ ملی هەندێ پەل دەدات بە شمشێر؟

گوتیان: جا چ فەرمانێکمان پێ دەکەیت؟

فەرمووی: سەیرکەن ئەو کۆمەڵەی کەوا بانگەواز دەکات بۆ کارو دەسەڵاتی پێشەوا عەلی و پابەندبن پێیەوە چونکە بەڕاستی پێشەوا عەلی(رضي الله عنه) لەگەڵ ڕاستی و هەق دایە.

---

(١) صحيح البخاري (١/ ٩٧) باب: التعاون في بناء المسجد، برقم: (٤٤٧).

(٢) مسند البزار (٧/ ٢٣٦)برقم: (٢٨١٠).

هەتا جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر بەرزاییەکی شاری مەدینە وەستاو فەرموی: (هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ : إِنِّي لأَرَى الْفِتَنَ تَقَعُ خِلاَلَ بُيُوتِكُمْ كَوَقْعِ الْمَطَرِ)[١].

واتە: ئایا ئێوە ئەوە دەبینن کە من دەیبینم؟

هاوەڵان گوتیان: نەخێر

فەرمووی: من ئاشوب دەبینم کە دێتە خوار بەسەر ماڵەکانتاندا وەکو هاتنە خوارەوەی ڕێژنەی باران.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) سەبارەت بەم فەرمودەیە دەڵێت: وێچواندنی (فیتنە)یە شوێنی باران لەبەر زۆری بووە.

واتە: ئاشوبەکان زۆرن هەموو خەڵکەکەی دەگرێتەوە.. تایبەت نابێ بە کۆمەڵێك.

ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەو جەنگانەی نێوان هاوەڵەکان وەکو جەنگی (جەمەل) و (صفین) و (حرە) و شەهید کردنی پێشەوا (عوسمان) و (حوسەین).. جگە لەوانەش ئەوەش موعجیزەیەکی ئاشکرایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)[٢].

بەرگی یەکەم

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة (١٨ / ٧ ـ مع شرح النووي) .

(٢) صحيح مسلم (١٨ / ٨ ـ مع شرح النووي).

# سەرهەڵدانی فیتنەی (خەواریج)

سەبارەت بە چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەم خەواریجانە ئەمە بوو، پاش ئەوەی کە پێشەوا عەلی بە خۆی و سوپاکەیەوە گەڕایەوە بۆ شاری کوفە (١٦) هەزار کەس لەوانەی بە تەحکیم و ڕاگرتنی شەڕەکە ڕازی نەبوون لە سوپاکەی پێشەوا عەلی هەڵگەڕانەوەو دەیانگوت: حوکم تەنها دەبێت بۆ خوا بێت بەڵام پێشەوا عەلی بە حوکمی چەند کەسێك ڕازی بووە نەك بە حوکمی خودا، بۆیە پێیان وابوو پێشەوا عەلی کافر بووەو لە ئایینی ئیسلام دەرچووەو دەبێت شەڕی لەگەڵدا بکرێت، ئەم کۆمەڵەش لە پێشەوا عەلی هەڵگەڕانەوە ناونران بە (خەواریج)[1].



---

(١) (خەواریج) گرۆهێکن لەو حەفتاو دوو گرۆهەی گومڕابوو، لەسەردەمی پێشەوا (عەلی) خۆیان ئاشکرا کردو ناویان لەخۆیان نا (ترات) واتە: (بەهەشت کڕ) یان خۆ فرۆش بە خوای گەورە، بەڵام موسڵمانەکان ناویان لێنان (خەواریج) واتە: دەرچووەکان.
پێغەمبەر(ﷺ) ناوی بردون بە سەگەکانی دۆزەخ، ئەبو ئومامە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (كِلَابُ النَّارِ شَرُّ قَتْلَى تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ) قال الترمذي: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. برقم: (٣٠٠٠). واتە: ئەوانە سەگەکانی دۆزەخن و خراپترین کوژراون لە ژێر ئاسماندا.
لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: (الْخَوَارِجُ كِلَابُ النَّارِ). سنن ابن ماجه، برقم: (١٧٣) قال الألباني حديث صحيح. واتە: خەواریجەکان سەگەکانی دۆزەخن.
سەعیدی کوری جیمان دەڵێت: خەواریجەکان زۆر جار بانگەشەیان بۆ دەکردم تا بچمە ڕیزیانەوە، منیش نزیك بوو بچمە ناو ئەو کۆمەڵ و تاقمەوە، تا خوشکەکەی باوکی بیلال خەوی بینی و لە خەویدا باوکی بیلالی برای بووەتە سەگێکی ڕەشی قەترانی و فرمێسك بە هەردوو چاویدا دێتە خوارەوە، گوتی: من لە خەوەکەمدا پێمگوت: باوکی بیلال باوکم بە قوربانت بێت ئەوە چی بووە بۆ وا دەتبینم؟ ئەویش لە خەوەکەی دا پێیگوت: ئێمە لە دوای ئێوە (واتە: دوای دەرچوونمان لە دونیا) بوینە سەگەکانی ناو دۆزەخ، باوکی بیلالیش یەکێك بوو لە سەگەکانی تاقمی خەواریج).
هەروەها (حروریە)شیان پێ گوتراوە چونکە لە دێی (حروراء) کە دوو میل لە کوفەیەوە دوور بوو کەنار گیربوون.. سەرچاوە/ معجم البلدان (٢/٢٤٥).

خەواریجەکان لەناو خۆیان (عەبدوڵڵای کوری وەهەبی ڕاسبی) یان هەڵبژارد بە سەرکردەی خۆیان، پێشەوا عەلیش بە مەبەستی ئەوەی فیتنەکەیان گەورە نەبێت و بیانگێڕێتەوە بۆ ڕاستە ڕێی کۆمەڵی موسڵمانان هەستان بە ناردنی (عەبدوڵڵای کوری عەباس) هەتا گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات و بە بەڵگەوە بۆیان بسەلمێنێت کە هەڵەن، ئەویش ڕۆیشتە لایان و سێ ڕۆژ لە ناویاندا مایەوەو بەردەوام قسەی بۆ دەکردن و بەڵگەی بۆ دەهێنانەوە، تا لە کۆتایی توانی نیوەیان قەناعەت پێ بکات و بیانگێڕێتەوە ڕیزی سوپاکەی پێشەوا عەلی و کۆمەڵی موسڵمانان، بەڵام نیوەکەی تریان هەر سوور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان، پاشان پێشەوا عەلی وەڵامی بۆ ناردن و پێی گوتن: ئێوە بە ڕێی خۆتان و ئێمەش بە ڕێی خۆمان، بە مەرجێك خوێنی کەس بە ناهەق نەڕێژن و ڕێگەی کەس نەگرن و ستەمیش لە کەس نەکەن، وە ئێمەش ڕێگەی ماڵی خواتان لێناگرین و شەڕیشتان لەگەڵ ناکەین تا ئێوە شەڕمان لەگەڵ نەکەن[1].

پاشان ئەوانەی کە مابوون لە(خەواریج)ەکان لە (نەهرەوان) کۆبوونەوەو سوپایەکی چەکداریان دروست کردو دەستیان کرد بە ستەم و ڕێگرتن لە موسڵمانان و خوێن ڕشتنی خەڵك بە ناهەق، وە یەکەم تاوان کە ئەنجامیاندا ئەوە بوو کە جارێکیان (عەبدوڵڵای کوری خەبابی کوری ئەرەت) خۆی و خێزانەکەی گەیشتنە کۆمەڵێکی (خەواریج)و بینی یەکێکیان لە ژێر دارخورمایەك دانە قەسپێکی خستە ناو دەمی خۆی، هاوڕێکانی خۆیان لێ زویر کرد چونکە بەبێ ئیزنی خاوەنەکەی خواردبووی، هەروەها یەکێکیان بەرازێکی کوشت دیسان خۆیان لێ زویر کرد، چونکە خواردنی گاورەکانی (ذمي) لەناو بردووە، ئینجا ڕوویان کردە (عەبدوڵڵا) و پێیان گوت: بیروڕات چۆنە بەرامبەر پێشەوا عەلی؟ ئەویش وەڵامی دانەوەو فەرموی: پێشەوا عەلی لەسەر ڕێگەی ڕاستە ئەو لە ئێوە شارەزاترە لە ئیسلام، ئیتر کە ئەم وەڵامەی دانەوە لە پێش چاوی خێزانەکەی شەهیدیان کرد، ئینجا ورگی خێزانەکەشیان هەڵدڕی و بە کۆرپەی ناو سکیەوە کوشتیان.

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، للبرزنجي، لا ٣٧ .

بەڵێ ... بەراز کوشتنیان پێ حەرامە، بەڵام شەهید کردنی کوڕە هاوەڵێکی پێغەمبەریان (ﷺ) پێ حەڵاڵە.

ئەم کارە نارِەوایانە پێشەوا عەلی ناچار کرد کە بەرِێ بکەوێت بۆ تەمێ کردنیان، کاتێك بە سوپاکەیەوە گەیشتە (نەهرەوان) خۆی و ئەبو ئەیوبی ئەنصاری بۆ ماوەیەکی زۆر وتوێژی لەگەڵدا کردن، بەڵام نەگەرِانەوەو سودی نەبوو، پاش ئەوە ئەبو ئەیوب ئاڵایەکی بەرز کردەوەو گوتی: هەر کەس بێتە لای ئەم ئاڵایە دڵنیابێت هیچی لێناکەین بۆ کوێ دەرِوات با برِوات، ئێمە تەنها شەرِ لەگەڵ ئەوانە دەکەین کە ئەو تاوانەیان ئەنجامداوەو خوێنی ناهەقیان رِشتووە، بەمەش خەڵکێکی زۆر لە (خەواریج)ەکان جیابوونەوە، تەنها (١٠٠٠) کەسیان مایەوە، پاشان شەرِ دەستی پێکردو هەر زوو (خەواریج)ەکان شکان و بەشی زۆری سەرکردەکانیان کوژران .

(زەیدی کوری وەهبی جوهەنی) کە یەکێك بوو لە ئەندامانی لەشکرەکەی پێشەوا عەلی لە شەرِی (خەواریج) دەگێرِێتەوە کە پێشەوا عەلی (ﷺ) فەرموی: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو:

(يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنْ أُمَّتِي يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، لَيْسَ قِرَاءَتُكُمْ إِلَى قِرَاءَتِهِمْ بِشَيْءٍ، وَلَا صَلَاتُكُمْ إِلَى صَلَاتِهِمْ بِشَيْءٍ، وَلَا صِيَامُكُمْ إِلَى صِيَامِهِمْ بِشَيْءٍ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يَحْسِبُونَ أَنَّهُ لَهُمْ وَهُوَ عَلَيْهِمْ)[١].

واتە: کۆمەڵێك دەردەچن لە ئومەتەکەم قورئان دەخوێنن قورئان خوێندنی ئێوە لە چاو قورئان خوێندنی ئەوانەدا هیچ نیە، وە نوێژەکانیشتان لە چاو نوێژی ئەوان هیچ نیە، وە رِۆژوەکانیشتان لە چاو رِۆژووی ئەواندا هیچ نیە، قورئان دەخوێنن پێیان وایە قورئان لەگەڵ ئەوانە، بەڵام لە رِاستیدا لەسەر ئەوانە.

پاشان پێشەوا عەلی (ﷺ) فەرموی: ئەو سوپایەی کە شەرِیان لەگەڵدا دەکات ئەگەر دەیانزانی چ خێرێکیان لای خوای گەورە بۆ دەنوسرێت ئەوا تەوەکولیان

---

(١) صحيح مسلم، (٢/ ٧٤٨) باب: التحريض على قتل الخوارج، برقم (١٠٦٦).

دەکردە سەر کارەکەیان واتە: بۆ بە دەست هێنانی بەهەشت، نیشانەی ئەو کۆمەڵە خەواریجەش ئەوەیە کە پیاوێکیان تێدایە قۆڵێکی باسکی پێوە نیەو لە کۆتایی قۆڵەکەشیدا گۆیەکی وەك گۆی مەمکی پێوەیە، چەند موویەکی سپی لە سەرە.

زەیدی کوڕی وەهەب(ﷺ) دەڵێت:

کاتێك شەڕەکە کۆتایی پێ هات (خەواریج)ەکان شکان، پێشەوا عەلی فەرمووی: بگەڕێن بە دوای پیاوە نیو قۆڵەکەدا، ئەوانیش گەڕان بەڵام نەیاندۆزیەوە، پاشان پێشەوا عەلی خۆی هەستا بەناو کوژراوەکان گەڕا، کۆمەڵێك جەنازەی بینی بەسەر یەکدا کەوتبوو، فەرمووی: بەسەریەکیان لابەرن، کە سەیریان کرد پیاوە نیو قۆڵەکە لە ژێریاندا بە کوژراوی کەوتووە.

پێشەوا عەلی (ﷺ) پیاوەکەی بە کوژراوی بینی تەکبیری کردو فەرموی: خوای گەورە ڕاستی فەرمووەو پێغەمبەرەکەشی بە ئەمانەت هەواڵەکەی گەیاندووە، لەو کاتەدا (عوبەیدەی سەلمانی) هەستاو بە پێشەوا عەلی گوت ئەی سەرکردەی موسڵمانان تۆ ئەو خوایەی کە هیچ خوایەك نیە جگە لەو نەبێت ، تۆ ئەمەت لە پێغەمبەر(ﷺ) گوێ لێ بووە؟

پێشەوا عەلیش(ﷺ) فەرموی: بەڵێ بەو خوایەی کە هیچ خوایەك نیە غەیری ئەو نەبێت ئەمەم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووە[١].

پاش ئەم ڕووداوانەو لەناوبردنی خەواریجەکان سێ کەسی داخ لە دڵ لە پاش ماوەی (خەواریج)ەکان، کە بریتی بوون لە(عبدالرحمن کوڕی مەلجەم و بەرکی کوڕی عەبدوڵلای تەمیمی و عەمری کوڕی بەکری تەمیمی ) لەگەڵ یەکتر کۆبوونەوەو بڕیاریاندا هەریەکەیان یەکێك لە سەرکردەکانی ئەو کاتەی موسڵمانان بکوژێت، وە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە (عبدالرحمن ی کوڕی مەلجەم) پێشەوا عەلی بکوژێت و (بەرکی کوڕی عەبدوڵلای تەمیمیش) موعاویە بکوژێت و (عەمری کوڕی بەکری تەمیم)یش عەمری کوڕی عاص

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، للبرزنجي، لا ٣٨ .

بکوژێت ، کە ئەو کاتە ئەمیری میسر بوو، بۆ ئەم مەبەستە بڕیاریاندا کاتی جێ بەجێ کردنی پیلانەکە بۆ تیرۆرکردنی هەر سێ سەرکردە کاتی نوێژی بەیانی هەڤدەی رەمەزان بێت، پاشان بە ڕێکەوتن بەرەو کوفەو شام و میسر بۆ ئەنجامدانی پیلانەکەیان، وە لەکات و ڕۆژی دیاریکراودا (بەرکی تەمیمی) لە ڕێگەی مزگەوت دا بە خەنجەرێکی ژەهراوی دای لە موعاویەو برینداری کرد، بەڵام موعاویە چاك بویەوەو نەمردو بەرکی تەمیمیش گیراو کوژرا.

پێشەوا عەمری کوڕی عاصیش(ﷺ) لە میسر بە قەدەری خوا ئەو ڕۆژە نەخۆش بوو نەیتوانی بچێتە مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی و پێش نوێژی بۆ خەڵکی بکات، بۆیە(خاریجەی کوڕی ئەبی حەبیبی عامری) لە جێی خۆی ڕاسپارد بۆ پێش نوێژی (عەمری تەمیم)یش نەیزانی کە ئەوە عەمری کوڕی عاص(ﷺ) نیە، بە خەنجەرە ژەهراویەکەی لە میحرابەکەدا لێیداو کوشتی و خەڵکەکەش گرتیان و کوشتیانەوە.

(عبدالرحمن ی کوری مەلجەم)یش لە ڕێگەی مزگەوت فرسەتی لە پێشەوا عەلی هێنا لە کاتێکدا کە خەڵکی خەبەر دەکردەوە بۆ نوێژی بەیانی، لەناو دەرگای مزگەوتەکە بە شمشێرێکی ژەهراوی دای لەسەری پێشەوا عەلی و سێ ڕۆژ بە برینداری مایەوە تا لە شەوی یەك شەممەی ڕێکەوتی نۆزدەی ڕەمەزانی ساڵی (٤٠)ی کۆچی کۆچی دوای کرد.

بۆیە عەبدوڵلای کوری عومەر(ﷺ) بە خراپترین دروست کراوەکانی خودایان دەبینێ و دەڵێت: خەواریجەکان دەرچووینە بۆ ئایەتەکانی خودا کە لەبارەی کافرەکانە کردویانەتە سەر بڕواداران[1].

ناوە ناوە ئەو کۆمەڵە بەردەوامە تا هاتنی (دەجال) دەردەکەون و پەیدا دەبن بەبەڵگەی ئەوەی کە عەبدوڵلای کوری عومەر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (يَنْشَأُ نَشْءٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، كُلَّمَا خَرَجَ قَرْنٌ قُطِعَ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ) يَقُولُ: كُلَّمَا خَرَجَ قَرْنٌ قُطِعَ، أَكْثَرَ مِنْ عِشْرِينَ مَرَّةً،

---

(١) صحيح البخاري (١٢/ ٢٨٦) كتاب استتابة المرشدين، باب: قتل الخوارج.

حَتَّى يَخْرُجَ فِي عِرَاضِهِمُ الدَّجَّالُ)[١]. واتە: کۆمەڵێ پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن بەڵام لە قورگیان ڕەت نابێت، هەر کاتێ کە کۆمەڵێکیان سەری هەڵدا لە نێو دەبردرێن تا لە فرتوفێڵەکەیاندا دەجال سەر هەڵدەدا.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (سَيَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ أَحْدَاثُ الْأَسْنَانِ، سُفَهَاءُ الْأَحْلَامِ، يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ..)[٢].

واتە: لە کۆتایی دونیا کۆمەڵێك سەر هەڵدەدەن و پەیدا دەبن کە بەتەمەن بچوکن و کەم هۆشن قسەکانیان قسەی خوایە، واتە: قورئان دەکەنە بەڵگەی قسەکانیان بەڵام بڕواکەیان لە دەم و گەرویاندایە و ناچێتە دڵیانەوە بۆیە لە دین دەردەچن هەروەکو تیر لە تیروکەوان دەردەچێت.

پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: بەڵا بەهۆیانەوە گەورەتر دەبوو، وە بە هۆی بیروباوەڕیان خراپەکاری فراوان دەبوو چونکە دەیانگوت: هەر کەسێك ئەگەر خێزاندار نەبێت داوێنپیسی بکات دەبێ بکوژرێ، وە دەستی دزیان لەبن هەنگڵیان دەبڕی لە جیاتی جومگەکانی، وە نوێژیان بە واجب دانا لەسەر ئافرەتی حەیزدار[٣].

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە بەسەر هەڵدانی ئەم کۆمەڵە گومڕایە لە گەلەکەی وە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە خەواریج پلەکەی دەگاتە ئاستی متەواتیر، ئیبنو کەثیر دەڵێت: زیاتر لە (٣٠) فەرموودە هاتووە دەربارەی خەواریج لە پەرتوکەکانی فەرموودە[٤].

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٢/ ٤٨) برقم: (٢٦٥٥). والحاكم في المستدرك (٨٥٥٨)، قال الحاكم: هذا حديث على شرط الشيخين، وقال الهيثمي: رواه الطبراني وإسناده حسن (مجمع الفوائد) (٦/ ٠٣٢).

(٢) صحيح البخاري (٦/ ٢٥٣٩) باب: قتل الخوارج والملحدين، برقم: (٦٥٣١).

(٣) فتح الباري (١٢/ ٢٨٥).

(٤) البداية والنهاية (٧/ ٢٩٠).

# دابەزینی پێشەوا حەسەن
# لە خەلیفایەتی بۆ پێشەوا معاویە

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، دابەزینی پێشەوا حەسەنە لە خەلیفایەتی بۆ موعاویە(ﷺ).

پاش ئەوەی پێشەوا عەلی(ﷺ) شەهید کرا بەیعەت درا بە پێشەوا حەسەنی کوڕی و کرا بە خەلیفە، پێشەوا حەسەنیش هەر لە ژیانی باوکی هانی باوکی دەدا کەوا بە ڕێگە چارەی شەڕ کێشەکان حەل نەکات، چونکە ئەو جەنگە نێو خۆییانەی موسڵمانانی بە ئاشوبێکی گەورە دەزانی کە هەیبەت و پاشە ڕۆژی موسڵمانانی خستبووە مەترسیەوە، هەر چەندە دەیزانی کە باوکی لەسەر هەقە، خەفەتێکی زۆری بەو جەنگە خوێناویانە دەخوارد لە نێوان هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

لە لایەکی تریشەوە متمانەی نەبوو بە خەڵکی کوفەو عێراق، چونکە دەیزانی هەر ئەوان هۆکاری سەرەکی هەموو فیتنەکانن، چەندین جار باوکیان دەستە خەڕۆ کردبوو، وە لە کاتی تەنگانەدا پشتیان لێ هەڵکردبوو، بۆیە دەترسا خۆشی وەك باوکی لێ بکەن و متمانەی ئەوەی پێنەکردن تا سەر پشتگیری لێ بکەن دژی پێشەوا موعاویە، بۆیە پاش شەش مانگ لە وەرگرتنی خیلافەت تەنازولی کرد بۆ پێشەوا موعاویەو خۆی و موسڵمانان بە گشتی بەیعەتیاندا بە موعاویەو ناکۆکی و دووبەرەکی کۆتایی پێ هات و، ئەو ساڵەش ناونرا ساڵی (الجماعة).. ئەم هەواڵەش لە ساڵی (٤٠)ی کۆچی هاتە دی.

بە کۆتایی هاتن بە خیلافەتی پێشەوا حەسەن (ﷺ) خیلافەتی ڕاشیدی کۆتایی پێهات کە (٣٠) ساڵی خایاند، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (الْخِلَافَةُ بَعْدِي ثَلَاثُونَ سَنَةً، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا)[1].

---

(١) صحيح ابن حبان (١٥/ ٣٩٢) برقم: (٦٩٤٣).

واتە: خەلیفایەتی لە دوای من (٣٠)ساڵ دەخایەنێت پاش ئەوە دەبێتە پادشایەتی.

بە ڕاستی ئەم فەرموودەیە یەکێك بوو لە بەڵگەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە پێشەوا ئەبوبەکر لە مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی (١١) ی کۆچی بوو بە خەلیفە، پێشەوا حەسەنیش لە مانگی (ربیع الاول) ی ساڵی (٤١) ی کۆچی دەستی لە خیلافەت هەڵگرت بۆ موعاویە کە ئەم ماوەیەش لە بەینی خەلیفەکان (٣٠) ساڵی تەواوی خایاند.

**ساڵەکانی حوکمڕانی خەلیفەکانی ڕاشیدین:**

پێشەوا ئەبوبەکر (٢) ساڵ و (٣) مانگ و (١٠) ڕۆژ بوو.
پێشەوا عومەر (١٠) ساڵ و (٦) مانگ و (٨) ڕۆژ بوو .
پێشەوا عثمان (١١) ساڵ و (١) مانگ و (٩) ڕۆژ بوو .
پێشەوا عەلی (٤) ساڵ و (٩) مانگ و (٧) ڕۆژ بوو .
پێشەوا حەسەن نزیکەی (٦)مانگ بوو .
ئەمەش دەکاتە (٢٧) ساڵ و (٣٥) مانگ و (٣٤) ڕۆژ .

کە بەمەش دەکاتە (٣٠) ساڵ و (٤ - ٥) ڕۆژ کە ئەمەش ڕەنگە (تداخل) ی ڕۆژەکان بێت[1].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: سوننەت وەهایە کە بە موعاویە بگوترێ پادشاو پێی نەگوترێ خەلیفە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: [وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾].

---

(١) فيض القدير، للعلامة المناوي.

زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە دەفەرموون: ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ پێشەوا عەلی و پێشەوا موعاویە (رەزای خوایان لێ بێت).

پێشەوا ئەبی بەکرە(ﷺ) دەڵێت:

جارێکیان گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) لەسەر مینبەر کە حەسەنی کوری عەلی لە تەنیشتیەوە بوو، پێغەمبەر (ﷺ) جارێك سەیری خەڵکەکەی دەکردو جارێکیش سەیری حەسەنی دەکردو دەیفەرموو:

(أَلَا إِنَ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَعَلَّهُ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ)[1].

واتە: ئەم کورەی من سەرکردەو رێزدارو گەورەیە، خوای گەورە دوو کۆمەڵی گەورەی موسڵمانان لەسەر دەستی دا ئاشت دەکاتەوە.

بەڵێ.. ئەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دی و خودای گەورە لەسەر دەستی پێشەوا حەسەن کۆتایی بەو فیتنە خوێناویە هێناو ئاگری شەڕی پێ کوژاندەوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا موسڵمانان رەزامەندییان لەسەر ئەوە داوە کە بە هەموو ئەو پاشایانەی کە لە سەردەمی پێشەوا (موعاویە)وە تا کۆتا سەردەمی سوڵتانەکانی عوسمانی درێژ دەبێتەوە بڵێن: خەلیفە.. قەناعەتیان وابووە ئەو خیلافەتەی کە پێویستە موسڵمانان دەستی پێوە بگرن و دایبمەزرێنن تا ئەو کاتەی کەمال ئەتاتورك هەڵیوەشاندەوەو هەر بەر قەرار بووەو هەبووە.

تەنانەت مێژوونوسە گەورە موسڵمانەکان بەردەوام میرەکانی بەنی ئومەییەو بەنی عەبباس و بەنی عوسمانیان هەموو بە خەلیفەکان ناو بردووە.

پێشەوا حوزەیفەی کوری یەمان (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

(تَكُونُ النُّبُوَّةُ فِيكُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَرْفَعَهَا،

---

(١) صحيح البخاري (١٠/ ٢٨) باب: قول النبي للحسن، برقم: (٢٧٠٤).

ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًا، فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا جَبْرِيَّةً، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةً عَلَى مِنْهَاجِ نُبُوَّةٍ ثُمَّ سَكَتَ)[1].

واتە: پێغەمبەرایەتی لەناوتاندا دەبێت تا ئەو کاتەی کە خوا دەیەوێت، پاشان هەر کات ویستی هەڵی بگرێت هەڵی دەگرێت، پاشان دەبێتە خیلافەت لەسەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەرایەتی دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی خوا دەیەوێت، پاشان دەبێتە پادشایەتیەکی میراتگری تا ئەوەندەی خوا دەیەوێت، پاشان کە ویستی هەڵی بگرێت هەڵی دەگرێت، پاشان دەبێتە دەسەڵاتێکی زۆرداری، ئەویش دەمێنێتەوە تا ئەوەندەی کە خوا دەیەوێت، پاشان کەی ویستی هەڵی بگرێت هەڵی دەگرێت، پاشان دەبێتەوە خیلافەت لەسە ڕێو شوێنی پێغەمبەرایەتی، پاشان بێ دەنگ بوو.

پاشای (عضوض) بریتییە لەو کاربەدەست و سوڵتانانەی کە قەپ ئەکەن بە کورسی دەسەڵاتدا، یان خەڵك ئەخۆن.

پاشای (جەبریش) بریتین لەوانەی تاکڕەوی ئەکەن لە دەسەڵاتداو دیکتاتۆریەت ئەدەنە بەر.

پێغەمبەرایەتیش زانراوەو خیلافەتیش لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرایەتی دیارو ئاشکرایە کەواتە قۆناغەکانی دەسەڵاتی ئیسلامی سەرەتا پێغەمبەرایەتیە، پاشان خیلافەتە لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرایەتی، پاشان پاشایەتییەك کە قەپ بە دەسەڵاتدا ئەکەن، پاشان دیکتاتۆریەت و پاش ئەمانە دێتەوە سەر خیلافەت لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرایەتی.. کەوا دیارە دیکتاتۆریەتیش لە ئاوابووندایەو خیلافەت دەست پێدەکاتەوە.

جارێکیان عبدالرحمن کوری ئەبوبەکر(ﷺ) لەگەڵ زیاد بە نوێنەری چوونە خزمەت پێشەوا موعاویە پێی گوت: فەرمودەیەکمان بۆ بگێڕەرەوە کە لە پێغەمبەری خوات(ﷺ) بیستبێ، بەڵکو خوا پێی بەهرەمەند بکات، گوتی:

---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٤/ ٢٧٣) برقم: (١٨٤٣٠). حسنه شعيب الأرناؤوط في تحقيق جامع العلوم والحكم (٢/ ١٢٢).

بەڵێ.. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کامتان خەوتان بینیوە؟ پیاوێك گوتی: من ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! لە خەومدا تەرازوویەکم دی کە لە ئاسمانەوە شۆڕ کرابوویەوە، تۆ و ئەبوبەکر کێشانە کرا - تۆ لە ئەبوبەکر قورستر بووی.. پاشان ئەبوبەکر عومەر کێشانە کران، عومەر قورستر بوو، پاشان تەرازووەکە بەرز کرایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی پێ ناخۆش بوو پاشان فەرمووی: (الْخِلَافَةُ بَعْدِي ثَلَاثُونَ سَنَةً، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا)[1]. واتە: خەلیفایەتی لە دوای من (٣٠)ساڵ دەخایەنێت پاش ئەوە دەبێتە پادشایەتی.

فەرمووی: ئەوە خیلافەتی پێغەمبەرایەتیە، پاش ئەوە خوای گەورە ویستی بۆ هەر کەس لەسەر بێت دەسەڵاتی پێ دەبەخشێت، بەمە موعاویە توڕە دەبێت و دەدات بە پشتیاناو دەیانکاتە دەرەوە، زیاد بە ئەبوبەکر دەڵێت: ئایا لەناو فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) جگە لەم فەرموودەیە فەموودەی ترت نەدۆزیەوە تا بۆی بگێڕیتەوە؟

گوتی: بە خوا هەتا دەمرم جگە لەم فەرموودەیە هیچی تری بۆ ناگێڕمەوە، عبدالرحمن کوری ئەبوبەکر دەڵێت: زیاد هەر خەریك بوو داوای ماوەی دەکرد، هەر کە ماوەمان دراو چووینە ژوورەوە لای موعاویە گوتی: ئەبوبەکرە! فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەوە کە لە پێغەمبەرت(ﷺ) بیستبێ، بەڵکو خوا پێی بەهرەمەندم بکات.. دەڵێت: دیسان فەرموودەکەی یەکەم جاری بۆ گێڕایەوەو، موعاویە پێی گوت: دەی باشە برا هەواڵی ئەوەمان دەدەیتێ کە ئێمە پادشاین.. ئەوە ڕەزامەندیمان لەسەر ئەوە نواند کە پادشا بین[2].

---

(١) صحيح ابن حبان (١٥/ ٣٩٢) برقم: (٦٩٤٣).

(٢) صحيح: رواه الإمام أحمد والطيالسي، ورواه أبو داود مختصرا دون الوفادة على معاوية وهو حديث حسن، وقد رواه مختصرا كذلك الترمذي: وقال: حديث حسن، ورواه الحاكم وقال: صحيح على شرط الشيخين.

# سەرهەڵدان و پەیدابوونی شیعە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر سەرهەڵدانی شیعەو دەسەڵات گرتنە دەستە.

لەم ڕۆژگارەمان ئەگەر سەیری وڵاتێکی وەکو ئێران بکەین بە هەموو شێوەیەك دژایەتی ئەهلی سوننە دەکات، ئەوەی سزایاندا سزایان دا، ئەوەی سجنیان کرد سجنیان کرد، ئەوەی کوشتیان کوشتیان، تەنانەت گەورەی شیعەکانی ئێران کە خومەینیە جوێن بە هەردوو پێشەوایەکان ئەبوبەکرو عومەر بە ئاشکرا دەدات..

شیعە زیاتر لە (٣٠) گرۆپیان هەیە، قێزەونترینیان رافیزیەکانن، چونکە ڕەفزی هەردوو پێشەوایانی ئیسلام ئەبوبەکرو عومەر دەکەن، لەم سەردەمەش ئیمامیەکان و رافزیەکان ژمارەیان زۆرە لە ئێران و عێراق و هەندێك لە ئازربایینجان.

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێ: (يَظْهَرُ فِي أُمَّتِي فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ يُسَمَّوْنَ الرَّافِضَةَ يَرْفُضُونَ الإِسْلامَ)[1].

واتە: لە ئوممەتەکەی من کۆمەڵێك سەرهەڵدەدەن پێیان دەوترێت رافیزە، ڕەفزی ئیسلام دەکەن.

شێخ محەممەد ڕەسول بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

شیعە کۆمەڵێکن لەسەرەوە ئال و بەیتی پێغەمبەریان خۆش دەوێت، بەڵام لە ژێرەوە فیکرەی مەجوسی و یەهودی و بتپەرستیان هەیە، هاوەڵانی

---

(١) ضعيف: رواه أحمد في (فضائل الصحابة) (٦٥١)، قال الألباني: إسناده ضعيف، الحجاج بن تميم ضعيف (ظلال الجنة).

پێغەمبەر(ﷺ) بە کافر دادەنێن بە تایبەتی پێشەوا ئەبوبەکرو عومەر، وە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەر(ﷺ) پێشەوایەتی داوە لە دوای خۆی بە عەلی کوری ئەبو تالیب، بەڵام هاوەڵەکان قەبوڵیان نەکردووەو نەیانداوەتێ، هەر کەسێك باوەڕی بە ئیمامەت نەبێت لای شیعە ئەوە کافرە[1].

پێشەوا عەلی (ﷺ) دەڵێت:

(لَيُحِبُّنِي قَوْمٌ حَتَّى يَدْخُلُوا النَّارَ فِي حُبِّي وَلَيُبْغِضُنِي قَوْمٌ حَتَّى يَدْخُلُوا النَّارَ فِي بُغْضِي)[2].

واتە: کۆمەڵێك منیان خۆش دەوێت هەتا دەچنە ئاگری دۆزەخەوە لە خۆشەویستی من

وە کۆمەڵێك ڕقیان لێم دەبێتەوە هەتا دەچنە ئاگری دۆزەخەوە لە ڕقی من.



---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٧٦ .

(٢) صحيح: السنة لإبن أبي عاصم (٢/ ٤٧٦) برقم: (٩٨٣). إسناده صحيح على شرط الشيخين.

# شەهید کردنی پێشەوا

# ( حوسەینی کوڕی عەلی ) ( رضي الله عنه )

یەکێ لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی شەهیدکردنی پێشەوا (حوسەین).

پێشەوا موعاویە(رضي الله عنه) کە وەفاتی کرد بەیعەت درا بە یەزید، ئیبنو عومەرو ئیبن و عەباس بەیعەتیاندا بە یەزید، بەڵام پێشەوا حوسەین و عەبدوڵلای کوری زوبەیر چوونە مەککەو بەیعەتیان بە یەزید نەدا.

نامەی زۆر هات بۆ پێشەوا حوسەین(رضي الله عنه) لە خاکی عێراقەوە، داوایان لێدەکردو هانیان دەدا کە بچێ بۆ لایان تا لە بری یەزیدی کوری موعاویە بەیعەتی پێ بدەن، هەواڵیان بۆ دەنارد کە ئەوان بەیعەتیان بەکەس نەداوەو هەتا ئێستاش هەر چاوەڕێی هاتنی تۆ دەکەین.

پێشەوا حوسەین لە مەککەوە (موسلیمی کوڕی عەقیل)ی ئامۆزای نارد بۆ عێراق تا ڕاستی ئەو دەنگ و باسەی بۆ دەربکەوێ .

(موسلیمی کوڕی عەقیل) کە چووە کوفە خەڵکی بیستیان هاتووە، ئینجا هاتنە لای و بەیعەتیان پێدا لەسەر گەورەیی و ئەمیری حوسەین سوێندیان خوارد بە ماڵ و گیان یارمەتی دەدەین، ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەیعەتیاندا گەیشتە دە هەزار کەس..

(موسلیمی کوڕی عەقیل) نامەیەکی نوسی بۆ پێشەوا حوسەین تا بێت بۆ کوفە، وە کاروبار گونجاوە خەڵکی هەموویان بەیعەتیان داوە بە پێشەوا حوسەین..

پێشەوا حوسەین لە مەککەوە خۆی ئامادەکرد بە نیازی ڕۆیشتن بۆ کوفە لە هەمان کات یەزید نامەیەکی نوسی بۆ (عوبەیدوڵلای کوری زیاد) کە بچێت بۆ کوفەو (موسلیمی کوڕی عەقیلی) بگرێت و بیکوژێ، یان دەری بکات لە کوفە.

(عوبەیدوڵای کوری زیاد) هەستا بە دەرکردنی هەندێ لە ئەمیرەکان، وە فەرمانی پێکرد کە بڕۆن بۆ کوفەو ڕێگا بە کەس نەدەن بە گوێی (موسلیمی کوڕی عەقیل) بکەن، ئەو ئەمیرانەش کارەکەیان کرد، لێرەدا هەموو ئەوانەی کە لە دەوری (موسلیمی کوڕی عەقیل) کۆبوونەوە هەموویان دەوروبەریان چۆل کرد، ئیتر خۆی بە تەنها مایەوە کەس نەبوو ڕێگەی نیشان بدات پاشان گیرا دەستی کرد بە گریان و گوتی: سوێند بەخوا بۆ خۆم ناگریم، بەڵکو بۆ حوسەین و کەس و کاری حوسەین دەگریم ئەو ئەمڕۆ لە مەککەوە دەرچووە دێت بۆ لاتان.

پێشەوا حوسەین(ﷺ) ڕووی کردە کوفە، ئەگەر چی خەڵك زۆر داوایان لێکرد کە نەچێ بۆ کوفە، یەکێك لەوان ئیبنو عەبباس بوو کە پێیگوت: پێم بڵێ: ئەگەر ئەوان ئەمیرەکەیان کوشتووە یان دوژمنەکانیان دەرکردووەو دەسەڵاتیان گرتووە بەسەر وڵات ئەوا بڕۆ بۆ لایان، بەڵام ئەگەر ئەمیرەکەیان زیندوو بێت لەناویاندا وە دەسەڵاتی بەسەریانەوە هەبێت، وە فەرمانبەرەکانی لە وڵاتدا پارەی بۆ کۆبکەنەوە ئەوا ئەوان تۆ بۆ ئاژاوەو کوشتار بانگ دەکەن من لە تۆ دڵنیا نیم، چونکە کوفیەکان لێت دوور دەکەونەوەو دڵیان دەگۆڕن لە دژت ئیتر ئەوانەی بانگیان کردوویت دەبن بە توندترین دوژمن بۆت، سوێند بەخوا وا گومان دەبەم کە تۆ لەناو ژن و منداڵەکانتدا دەکوژرێیت.

عەبدوڵلای کوری عومەر (ﷺ) لە دووری سێ ڕۆژ ڕێگا کەوتە شوێن حوسەین و پێی گوت: بۆ کوێ دەچیت؟

گوتی: بۆ عێراق کاغەزو نامەی عێراقی زۆر پێ بوو ..

گوتی: ئەمە نامەو نوسراوو بەیعەتەکانیانە..

عەبدوڵلای کوری عومەر(ﷺ) گوتی: مەڕۆ بە گوێی نەکرد..

عەبدوڵلای کوری عومەر(ﷺ) پێی گوت: من فەرمودەیەکت بۆ باس دەکەم (جبریل) هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) پێی گوت: دونیات دەوێ یان دوا ڕۆژ، پێغەمبەر(ﷺ) دوا ڕۆژی هەڵبژاردو دونیای نەویست، تۆش بەشێکی

لە پێغەمبەر(ﷺ) بە خوا کەس لە ئێوە دونیای دەست ناکەوێ و خوا بە ئێوەی نادات، چونکە ئەوە بۆ ئێوە چاکترە بە گوێی نەکرد کە بگەڕێتەوە ئیتر (عەبدوڵلای کوری عومەر) باوەشی پیاکردو گریاو گوتی: خوا حافیزت بێت تۆ دەکوژرێیت .

عەبدولاّی کوری زوبەیر(ﷺ) پێی گوت:

ئایا دەچیت بۆ لای خەڵکانێك کە باوکتیان کوشت و براکەتیان دەرکرد، پێشەوا (حوسەین) زانی (مسلمی کوڕی عەقیل) کوژراوە، بەڵام هەر نەگەڕاوە سوپاکەی پێشەوا (حوسەین) (١٥٠) پیاو بوون، وە کەس و کاری پێشەوا (حوسەین)یشی لەگەڵ بوو، پێشەوا (حوسەین) سێ شتی خستە بەردەستی (عویەیدوڵلای کوری زیاد) بە سەرکردایەتی (عەمری کوری سەعدو شەمری کوری ذی جەوشەنە)، بەڵام لێیان قبوڵ نەکرد، وە سوربوون کە دەبێ (عویەیدوڵلای کوری زیاد) چی دەوێ حوسەین وابکات.

شەڕ ڕوویدا پێشەوا (حوسەین) شەهید کرا، وە لەگەڵیشی (١٦) کەس لە نزیکەکانی شەهید کران کە لەسەر ڕووی زەوی هاوشێوەیان نەبوو.

پێشەوا حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: سەری حوسەینیان بڕی و ناردیان بۆ (عویەیدوڵلای کوری زیاد) پاشان نێردرا بۆ یەزید.

پێشەوا سەعیدی کوری موسەیەب (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەگەر پێشەوا (حوسەین) لە مەککە دەرنەچویایە بۆ عێراق ئەوە باشتر بوو بۆی.

پێشەوا سەلەمەی کوری عبدالرحمن (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: دەبوایە پێشەوا (حوسەین) خەڵکی عێراقی بناسیایەو نەچویایە بۆ لایان.

پێشەوا ئیبنوتەیمیە(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەو دەرچوونەی پێشەوا (حوسەین) بۆ کوفە هیچ بەرژەوەندیەکی دین و دونیای تێدا نەبووە، دەرچوونەکەی و کوشتنەکەی خراپ بوو، بەڵام ئەگەر لە مەککە دانیشتایەو نەرۆیشتایە ئەوا خراپەی وا ڕووی نەدەدا، ئەوەی کە پێشەوا (حوسەین) مەبەستی بوو لە بەدەست

بەرگی یەکەم

هێنانی چاکەو لابردنی خراپە هیچی بۆ بەدەست نەهات، بەڵکو خراپەکە زۆرتر بوو بە دەرچوونەکەی و کوشتنەکەی، بەوەش چاکە کەمی کرد، وە بووە هۆی بەرپابوونی خراپەو شەڕێکی گەورە، وە کوشتنی پێشەوا (حوسەین) بوو بەهۆی بەرپابوونی ئاژاوە.

پێشەوا ئیبنو عەباس(ﷺ) دەڵێت: (رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فِيمَا يَرَى النَّائِمُ نِصْفَ النَّهَارِ، أَشْعَثَ أَغْبَرَ مَعَهُ قَارُورَةٌ فِيهَا دَمٌ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا هَذَا؟ قَالَ: هَذَا دَمُ الْحُسَيْنِ وَأَصْحَابِهِ، لَمْ أَزَلْ أَلْتَقِطُهُ مُنْذُ الْيَوْمَ، قَالَ: فَأُحْصِيَ ذَلِكَ الْيَوْمُ فَوَجَدُوهُ قُتِلَ قَبْلَ ذَلِكَ بِيَوْمٍ)[1].

واتە: لە خەومدا بە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتم دەبینم قژی بژو ئاڵۆزکاوە سەرو چاوی تەپو تۆز دایگرتووە شوشەیەکی بە دەستەوە بوو پڕی بوو لە خوێن، گوتم: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) دایك و باوکم بە قوربانت بێت ئەمە چیە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: خوێنی حوسەین و هاوەڵەکانیەتی لە بەیانیەوە خەریکم کۆیدەکەمەوە، جا دەڵێت: ئەو ڕۆژەمان ژمارد ئەو ڕۆژە بوو کە حوسەین و هاوەڵانی تێدا شەهید کرابوو.

ئەوانەی کەوا پێشەوا حوسەینیان شەهید کرد خەڵکی عێراق بوون، لەبەر ئەوە خەڵکی عێراق خۆشی لە خۆنابینێت پاش شەهید کردنی پێشەوا حوسەین.

زەیدی کوری جەدعان دەڵێت: ڕۆژێك ئیبنو عەباس لە خەو هەڵدەستێت و دەڵێت: (انا لله وإنا إليه راجعون) ئینجا دەڵێت: سوێند بە خوا حوسەین شەهید کراوە، هاوەڵان گوتیان: چۆن دەزانی؟ گوتی: لە خەومدا پێغەمبەرم(ﷺ) بینی شوشەیەکی پڕ لە خوێنی بە دەستەوە بوو فەرمووی: ئایا دەزانی ئومەتەکەم دوای من چیان کرد؟ حوسەینیان کوشت ئەمە خوێنی خۆی و هاوەڵەکانیەتی بۆ لای خوای گەورە بەرز دەکەمەوە.

---

(١) المستدرك (٤/ ٤٣٩) برقم: (٨٢٠١). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ.

بەڕگی یەکەم

پێشەوا ترمذی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە لە (ڕەزین)وە ئەویش لە (سەلما)وە کە دەڵێت: چووم بۆ لای ئوم سەلەمەی دایکی بڕواداران بینیم دەگری، گوتم: بۆچی دەگریت؟ گوتی: پێغەمبەرم(ﷺ) لە خەودا بینی سەرو ڕیشی تەپ و تۆز بوو، گوتم: بۆچی وایت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئێستا حوسەینم بینی کوژرا.

پێشەوا ئیبنو موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە عەممارەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە دەڵێت: گوێم لە ئوم سەلەمە بوو بۆ حوسەین دەگریا و دەیگوت: گوێم لە (جن) بوو بۆ حوسەین دەگریان و هاواریان دەکرد.

پێشەوا قورطبي (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەوانەی پێشەوا حوسەینیان شەهید کرد هیچ بەزەییان پێدا نەهاتەوە لە کاتی شەهید کردنی، جا لە ڕۆژی هەینی کە (١٠) ڕۆژ تێپەڕی بوو لە مانگی موحەرەم ساڵی (٦١)ی کۆچی شەهیدیان کرد لە کەربەلا.

## پەیدابوونی قەدەریەو مورجیئە

قەدەریەکان:

کۆمەڵێکن قەدەر ڕەت دەکەنەوە، ئەوانیش دابەش دەبن بۆ چوار چین، وەکو پێشەوا ئیبنو تەیمیە باسی دەکات.

مورجیئە:

کۆمەڵێکن کە دەڵێن باوەڕ بریتیە لە (قەول) بەس، وە کردەوە لە باوەڕ دەردەچێت، جگە لەوەش دەڵێن: باوەڕ زیادو کەم ناکات، بەڵام لای ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕ قەول و ئیعتیقادو کردەوەیە بە خواپەرستی زیاد دەبێت و بە گوناه کەم دەبێت.

پێشەوا ئەنەس (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (صِنْفَانِ مِنْ أُمَّتِي لَا يَرِدَانِ عَلَيَّ الْحَوْضَ، وَلَا يَدْخُلَانِ الْجَنَّةَ: الْقَدَرِيَّةُ، وَالْمُرْجِئَةُ)[1].

واتە: دوو کۆمەڵ هەن لە ئوممەتەکەم کە نایەنە لام لەسەر حەوزی کەوسەر، وە ناچنە بەهەشتیش، قەدریەو مورجیئە.

پێشەوا موعازی کوری جەبەل (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (مَا بَعَثَ اللَّهُ تَعَالَى نَبِيًّا قَطُّ إِلَّا فِي أُمَّتِهِ قَدَرِيَّةٌ وَمُرْجِئَةٌ، إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ الْقَدَرِيَّةَ وَالْمُرْجِئَةَ عَلَى لِسَانِ سَبْعِينَ نَبِيًّا)[2].

---

(١) صحيح: رواه الطبراني في الأوسط (٤/ ٢٨١) برقم: (٤٢٠٤). قال الألباني: حديث صحيح.

(٢) السنة لإبن أبي عاصم (١/ ١٤٢) برقم: (٣٢٥).

بەرگی یەکەم

واتە: خوای پەروەردگار هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە ئیلا لە ئوممەتەکەی قەدەریەو مورجیئە هەبوون، خوای گەورە نەفرەت دەکات لە قەدەریەو مورجیئە لەسەر زمانی (٧٠) پێغەمبەر.

پێشەوا ئیبنو عەباس (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

(صِنْفَانِ مِنْ أُمَّتِي لَيْسَ لَهُمَا فِي الْإِسْلَامِ، أَوْ فِي الْآخِرَةِ نَصِيبٌ: الْقَدَرِيَّةُ، وَالْمُرْجِئَةُ)[١].

واتە: دوو کۆمەڵ لە ئوممەتی من پەیوەندیان بە ئیسلام نیە، یان بێبەشن لە ڕۆژی دوایی لەوانە قەدەریەکان و مورجیئەکان.

پێشەوا ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

(آخِرُ الْكَلَامِ فِي الْقَدَرِ لِشِرَارِ هَذِهِ الْأُمَّةِ فِي آخِرِ الزَّمَانِ)[٢].

بە ڕای بەندە لەم سەردەمە فیکرەی مورجیئەو قەدەریە زۆر زۆر بووە، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن و بانگەشەی بۆ بکەن.

---

(١) السنة لإبن أبي عاصم (٢/ ٤٦١) برقم: (٩٤٧).

(٢) مسند البزار (٢/ ٣٨٦) برقم: (٧٧٩٦). وهذ الحديث لا نعلم رواه عَن الزُّهْرِيّ، عن سَعِيد إلاَّ عنبسة. وهو لين الحديث تفرد بهذا الحديث من حديث الزُّهْرِيّ.

# ڕووداوی حــەڕڕە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی، ڕووداوی حەڕڕەیە[١].
حەڕڕە یەکێکە لەم فیتنانەی کە ڕوویدا لە شاری مەدینە، ئەمەش لە سەردەمی یەزیدی کوری موعاویە، کە بووە هۆی خوێن ڕشتنی هاوەڵانێکی زۆر لە شاری مەدینەی پێغەمبەر(ﷺ) .

پێشەوا ئەبو هوریرە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ ، لَيَكُونَنَّ بِالْمَدِينَةِ مَلْحَمَةٌ يُقَالُ لَهَا : الْحَالِقَةُ ، لَا أَقُولُ حَالِقَةَ الشَّعَرِ وَلَكِنْ حَالِقَةُ الدِّينِ ، فَاخْرُجُوا مِنَ الْمَدِينَةِ وَلَوْ عَلَى قَدْرِ بَرِيدٍ)[٢].

پێشەوا سەعیدی کوری موسەیەب دەڵێت: فیتنەی یەکەم کە پەیدابوو هیچ هاوەڵێ نەمایەوە لە بەژداربووانی بەدر لە پاشان فیتنەی دووەم کە هات ئەو هاوەڵانەی کە بەشداربوون لە حودەیبیە هیچیان نەمان.. وە دەڵێت: وا گومان دەبەم فیتنەی سێهەم ڕوویدات کەسێکی بە سوود نامێنێ لە نێو خەڵکدا کە تۆزێ هۆشی هەبێ.

پێشەوا پێشەوا بەغەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: مەبەست لە فیتنەی یەکەم کوشتنی عوثمانە، وە دووەم ڕووداوی حەڕڕەیە[٣].

پێشەوا ئیبنو کەثیر(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) باسی ڕووداوەکانی ساڵی (٢٨٧)ی کۆچی دەکات و دەڵێت:

---

(١) حەررە: یەکێکە لە گەڕەکەکانی خۆر هەڵاتی مەدینە کە لەوێدا جەنگ لە نێوان خەڵکی مەدینەو سوپای یەزیدی کوری موعاویە ڕوویدا. معجم البلدان (٢/ ٢٤٩).

(٢) ضعیف: تاریخ المدینة المنورة (أخبار المدینة النبویة) (١/ ١٦٩)برقم:(٦٢٩) موقوف ضعیف.

(٣) شرح السنة، للبغوي (١٤/ ٣٩٦).

لەم ساڵەدا تاقمی قەرمەتی دەستیان دایە جموجۆڵ، قەرمەتییەکان تاقمێکی مولحیدو زەندیق[1] بوون کە بە شوێن فەلسەفەی فارسەکاندا دەڕۆیشتن کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی (مەزدەك و زەردەشت) هەبوو، کە بیروڕای ئەو دوانە شتە حەرامەکان حەڵاڵن بۆیان، پاشان هەر ئەمان بوون کە بوونە شوێنکەوتەی هەموو زووڕناڵدێرێك بۆ بێدینی، بە زۆری لەلایەن شیعەی دوانزە ئیمامییەوە تەحریك دەکران و گەندەڵ دەبوون، لە ڕێگەی بیروڕاکانی ئەوانەوە دەچوونەوە ناو بەتاڵ و خورافات، لەبەر ئەوەی لە هەموو کەس بێعەقڵ تربوون.. ئەم تاقمە پێشیان دەگوترێت (ئیسماعیلیەکان) لەبەر ئەوەی (ئیسماعیلی ئەعرەجی کوڕی جەعفەری صادق) یان بەهی خۆیان دەزانی.. پێشیان ئەگوتن (قەرمەتییەکان) لەبەر ئەوەی قەرمەتی کوڕی ئەشعەثی گاوانیان بە گەورەی خۆیانی دەزانی.. دەڵێن: سەرۆکەکەیان لەسەرەتای کارەکەیدا فەرمانی بە شوێنەکەوتوەکانی دەکرد کە پەنجا نوێژ لە شەوو ڕۆژێکدا بکەن تا سەرقاڵیان بکات بە نوێژکردنەوەو نەیانپەرژێتە سەر ئەوەی ئەم بەرنامەی چیەو خەریکی چ فێڵ و تەڵەکەبازییەکە، پاشان دوانزە نەقیبی داناو ڕێبازێکی بۆ شوێنکەوتوانی دانا ئەویش بانگەشە بۆ ئیمامێك بکەن لەناو ئەهلی بەیتدا[2].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: قەرمەتییەکان زۆر هەواداری فاتیمییەکان بوون، ڕێبەرەکەیان ناونابوو (مەهدی) و ناوی (ئەبو موحەممەد عوبەیدوڵلای کوری مەیمونی قەداح) بوو، لە (سەلیمە)وە خووم فرۆش بوو، کابرایەکی جولەکە بوو، وای ڕاگەیاند کە موسڵمان بووەو لە (سەلیمە) وە چوو بەرەو وڵاتانی ئەفەریقیاو لەناو خەڵکدا دەیگوت: من لە نەوەی (فاتیمە)م و خەڵکێکی زۆری نەفام و بەربەر بڕوایان پێکردو ئەویش دەوڵەتێکی لێ تەشکیل دان و (سەجلماسە)ی گرت و شارێکی بەناوی (مەهدیە) دروست کردو کردیە پایتەختی دەوڵەتەکەی، قەرمەتییەکان بەردەوام نامەیان بۆ دەنوسی و خەڵکیان لە دەور کۆدەکردەوە[3]..

---

(١) زەندیق: بریتیە لە کەسێك لە ناخەوە بڕوای بە هیچ دینێك نیە. (المنجد، مادە تزندق).

(٢) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٥٣ .

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٢١٣ .

## بیروڕای قەرمەتیەکان:

١- قەناعەتیان بەدەوڵەتی گشتی هەیە و بڕوایان بە موڵکیەتی تاکە کەسی نیە لە هیچ شتێکدا.

٢- توندو تیژی وەسیلەی کاریگەری دەستیانە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان.

٣- بڕوایان وایە بەهەشت واتە: خۆشی و لەزەتی ئەم دونیاو جەهەننەمیش بریتیە لە ڕۆژووگرتن و حەجکردن و نوێژ.

٤- پەنا دەبەنە بەر (تەئویل) بۆ هەڵوەشاندنەوەی دین.

٥-هەموو کەسێك لەناو خۆیاندا قەبوڵ دەکەن هەر دینێکی هەبێ و بەدڵی ئەو دەکەن[1].

## ڕەگ و ڕیشەی بیروڕاکانیان:

١- فەلسەفەیەکی ماتریالیزمیان هەیە کە زۆربەی لە فەیلەسوف و ڕێبەرانی فارسەوە وەرگیراوە.

٢-بنەماکانی خەواریج و دەهرییەکان لە فیکرو لە سیاسەتیاندا بە ئاشکرا دیارە.

٣- بناغەی بیروڕایان ئەوەیە خەڵك هەموو مافیان لەدوو شتدا هەیە، ماڵی یەکتری و ژنی یەکتری.

٤- زیرەکانە بۆچوونەکانی مەزدەك و زەردەشت بەکار دەهێنن.

٥- فیکرەی جەوهەری لایان ئەوەیە زۆرترین خەڵك تەییار بکەن بۆ مەبەستەکانیان کە لای خۆیان ڕۆشنەو لای ئەوان نادیارە[2].

---

(١) الموسوعة المسيرة، (١/ ٣٩٧).

(٢) الموسوعة المسيرة، (١/٣٩٨).

هۆیەکەی بریتیە لەوەی کە خەڵکی شاری مەدینە یەزیدیان لە خەلیفایەتی داماڵی و (عەبدوڵلای کوری موتیعیان) کرد بە گەورەی قورەیش و (عەبدوڵلای کوری حەنزەلە)یان کرد بە گەورەی ئەنسار،

وە خەڵکی کۆبوونەوە بۆ دەرکردنی فەرمانبەرەکەی یەزید لە شاری مەدینەو دەرکردنی بەنی ئومەییە لە مەدینە، بەنی ئومەییە هەموویان لە ماڵی (مەروانی کوری حەکەم) کۆبوونەوە، وە خەڵکی مەدینە ئابلوقەیاندا لە ماڵی (عەبدوڵلای کوری عومەر) بە خەڵکی مەدینەی دەگوت نەدەبووایە بەیعەت بدەن بە (عەبدوڵلای کوری موتیع و عەبدوڵلای کوری حەنزەلە) لەسەر مردن،

(عەبدوڵلای کوری عومەر) خۆی و کەس و کارەکەی دوور گرت لە خەڵك (یەزیدی کوری موعاویە)ش سوپایەکی نارد بەرەو شاری مەدینە کە نزیکەی (١٥٠٠٠) هەزار کەس بوون بە سەرۆکایەتی (موسلیمی کوری عەقەبە)، وە پێی گوت: سێ ڕۆژ خەڵك بانگ بکە با بێنەوە بۆ گوێڕایەڵی، ئەگەر گەڕانەوە ئەوا لێیان وەرگرە ئەگەر نا داوای کۆمەك لە خوا بکەو شەڕیان لەگەڵ بکە، وە ئەگەر سەرکەوتی بەسەریاندا ئەوا سێ ڕۆژ شاری مەدینە بۆ تۆ حەلاڵ بێت چی دەکەی بیکە پاشان واز لە خەڵك بێنە، ئەگەر شاری مەدینەت تەواو کرد بڕۆ بۆ شاری مەککە بۆ ئابلوقەی (عەبدوڵلای کوری زوبەیر) دوای شەڕێکی سەخت خەڵکی مەدینە شاریان بەجێهێشت و هەڵهاتن (موسلیمی کوری عەقەبە) سێ ڕۆژ کەوتە گیانی خەڵکی مەدینەو دەستی کرد بە کوشتن و تالانکردنی ماڵ و سامانی خەڵکی شاری مەدینە..

پێشەوا زەهری (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ژمارەی کوژراوەکان (٧٠٠) کەسی بەناوبانگی کۆچەری و پشتیوانەکان و هاوسۆزەکانیان بوو، نزیکەی (١٠٠٠٠) هەزار کۆیلە و ئازاد بوون کە نەدەناسران[1].

---

(١) البداية والنهاية (٨ / ٢١٧ ـ ٢٢٤)، ومعجم البلدان (٢ / ٢٤٩) .

ئیبنو تەیمیە(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لە ڕۆژانی شومی کارەساتی -حەررە- کە ئەو کارەساتە پڕ شوم و شەرمەزاریە کە لەسەردەمی حوکمڕانیەتی (یەزیدی) ڕوویدا کە ناخۆشترین کارەسات بوو بەسەر خەڵکی مەدینە، لەو کات مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) جگە لە (سەعیدی کوری موسەیەب) هیچ کەسی تێدا نەمابوو، وە بانگ لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) نەدەدرا، (سەعید) دەڵێت: کاتی هەموو نوێژەکان لەناو گۆڕی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەنگی بانگم دەبیست[1]!!

---

(١) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٥٧ .

## هەڵگرتن و بردنی بەردە ڕەشەکەی کەعبە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی بەردە ڕەشەکەی کەعبە دەدزرێت و دەبردرێت..

پێشەوا ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يرفع الركن..)[١].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا روکن هەڵدەگیرێت..

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوری عاص دەڵێت: (إن الله تعالى يرفع الحجر الأسود قبل يوم القيامة)[٢].

واتە: بە دڵنیایی خوای گەورە حەجەری ئەسوەد هەڵدەگرێت لە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی..

شێخ محەممەد بەرزنجی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

لەسەردەمی خیلافەی موقتەدیر، لە ڕۆژی تەرویە دوژمنی خوا ئەبو تاهیری قەرمەتی هەستا بە شکاندنی بەردە ڕەشەکەو پاشان بردنی، پاشان لەبەرامبەر پەنجا هەزار دینار گەڕاندیەوە[٣].

---

(١) ضعيف: رواه ابن عبد الحكم في فتوح مصر (رقم ٢٥٥) والديلمي (١٧١/٤)، وسنده ضعيف، أبو زرعة هذا قال في التقريب: ضعيف شيعي، وابن لهيعة في حفظه ضعف، وبهذا أعله الألباني في الضعيفة (رقم ٤٧٨٩) وذكره في لوامع الأنوار البهية (١٣٢/٢) وعزاه للسجزي.. وهذا الإسناد لا بأس به في الشواهد والمتابعات..

(٢) صحيح: رواه الأزرقي (رقم ٤٧٤) وهذا سند قوي إذا توبع أو كان له شواهد، فالحديث حسن.

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة (لا ١٠٠).

پێشەوا عومەری کوری خەتاب (ﷺ) دەڵێت:

کەعبەی پیرۆز سێ جار دەڕوخێنرێت و لە جاری سێهەم یان چوارەم بەردە ڕەشەکە بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان، بۆیە پێش بەرزکردنەوەی عیبادەت و تەوافی بە دەوردا بکەن[1].

پێشەوا کەعب (ﷺ) دەڵێت:

کەعبە چوار جار دەڕوخێنرێت و لە چوارەمین جاری ئیتر بەردە ڕەشەکە بەرز ئەکرێتەوە بۆ ئاسمان، بۆیە چێژ لە عیبادەتەکانی کەعبە ببینن[2].



---

(١) المصنف لأبن ابي شيبة ، برقم: (٩١٧٦).

(٢) المصنف لأبن ابي شيبة ، برقم: (٩١٧٨).

# فیتنەی گوتەی ئەوەی کە قورئان دروستکراوی خوایە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سەرهەڵدانی کەسانێکە کە دەڵێن: قورئان دروستکراوی خوای گەورەیە..

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لا يذهب الناس حتى يقولوا القرآن مخلوق وليس بخالق ولكنه كلام الله منه بدأ وإليه يعود)[1].

واتە: .. هەتا دەڵێن: قورئان دروستکراوە نەك دروستکار، بەڵکو کەلامی خوای گەورەیە هەر ئەوها دەستی پێکردووەو هەر ئەوهاش دەگەڕێتەوە..

لە سەردەمی عەباسیەکان فیتنەی ئەوە پەیدا بوو کە قورئان دروست کراوە، بێگومان ئەمەش بۆچوونی خەلیفەی عەباسی مەئمون بوو لەگەڵ دەست و پێوەندەکانی، وە جەهەمیەکان و موعتەزیلەکانیش لە ژێر سێبەریدا ڕەواجیاندا بەم بۆچوونەدا تا بەهۆیەوە زۆرێك لە زانایانی ئیسلام توشی دەردەسەری بوون، وە بەڵایەکی گەورە کەوتە سەر موسڵمانان و کاتێکی زۆر بەم هۆیەوە سەر قاڵی کردبوون، بە هۆیەوە چەندین بۆ چوونی نامۆ کەوتە نێو بیروباوەڕی موسڵمانان..

بەم شێوەیە فیتنەیەکی گەورە ڕوویدا کە سەرژمێری ناکرێ، وە ئێستاش ڕۆژ بە ڕۆژ فیتنە سەر هەڵدەدات و یەك بەدوای یەك دێت و لە زیادبوونە.

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە بە پەرتەوازەیی و ئەم گەلە کە گەلانی پێشوو هەر هەموویان پەرتەوازە بوون و بەهۆیەوە لەناوچوون، لە فەرموودەی

---

(١) رواه اللالكائي والأصبهاني..

پێشەوا ئەبو هورەیرە هاتووە کە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَافْتَرَقَتِ النَّصَارَى عَلَى اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً)[1].

واتە: جولەکەکان پەرتەوازە بوون بۆ هەفتاو یەك کۆمەڵ، وە نەصرانیەکانیش بۆ هەفتاو دوو کۆمەڵ ، وە ئومەتی منیش پەرتەوازە دەبێ بۆ هەفتاو سێ کۆمەڵ.



(١) رواه الحاكم في (المستدرك) (١/ ٦) كتاب: الإيمان، برقم: (٩). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ.

## سەرهەڵدانی ئاگرێک لە خاکی حیجاز

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی سەرهەڵدانی ئاگرێکە لە خاکی حیجاز.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ، تُضِيءُ أَعْنَاقَ الْإِبِلِ بِبُصْرَى)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا ئاگرێك لە خاکی حیجاز دەردەچێت کە ملی حوشتر لە شاری بوصرا[٢] ڕووناك دەکاتەوە.

ئەگەر سەیری ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە وشەی (یکون)ی بەکار هێناوە، ئەمەش بۆ بەردەوامیەت و نویٚ بوونەوەیە، واتە: تا ڕۆژی دواییش ئەم ئاگرە سەرهەڵدەداتەوە.

وە حیکمەت لە دەرچوونی ئەم ئاگرە تا ڕۆژی دوایی دوو دانەی ترە:

**یەکەم:** بە بیرهێنانەوەی خەڵکیە لە ئاگرێك کە خەڵکی ڕاپێچ دەکات لە ڕۆژهەڵات تا ڕۆژئاوا.

**دووەم:** بە بیرهێنانەوەی کۆتا ئاگری ڕۆژی دواییە، خوا پەنامان بدات.

مێژوو نووسان دەڵێن: پێغەمبەر(ﷺ) چۆنی ڕاگەیاندبوو ڕوویداو ملی حوشترانی لە بوصرا ڕووناك دەکردەوە کەوا دەیانتوانی لەبەر تیشکی ئەو ئاگرە پەرتوك بخوێننەوە[٣].

---

(١) صحيح البخاري، كتاب الفتن، باب خروج النار ، (١٣ / ٧٨ ـ مع الفتح) ، وصحيح مسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة ، (١٨ / ٣٠ ـ مع شرح النووي).

(٢) پێشەوا نەوەوی: دەفەرمووی: (بوصرا) شارێکی ناسراوە لە شام بریتیە لە شاری حۆڕان کە سێ قۆناغ لە شاری دیمەشقەوە دوورە.

(٣) الإشاعة لأشراط الساعة، لا ٧٠ .

پێشەوا ئیبنو کەسیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەم ڕووداوە دەفەرموێ: لە ساڵی (٦٥٤) کۆچی ئەو ئاگرەی حیجاز دەرچوو کە ملی حوشترانی ڕووناك دەکردەوە[١].

پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يسيل واد من أودية الحجاز بالنار، تُضِيءُ أَعْنَاقَ الْإِبِلِ بِبُصْرَى)[٢].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا ئاگرێك لە دۆڵێك لە دۆڵەکانی خاکی حیجاز نەڕژێت، ملی حوشتر لە شاری بوصرا ڕووناك دەکاتەوە.

پێشەوا حوزەیفەی کوڕی ئەسید(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تخرج نار من رومان أو ركوبة، تُضِيءُ منها أَعْنَاقَ الْإِبِلِ بِبُصْرَى)[٣].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا ئاگرێك لە ڕۆمان[٤] یان ڕەکوبە[٥] دەرنەچێت، ملی حوشتر لە شاری بوصرا ڕووناك دەکاتەوە.

پێشەوا شەهابەدینی ئەبو شامەی حافزی مەقدیسی لە پەرتوکی (الذیل وشرحه) باسی ئەو ڕووداوە دەکات و دەڵێت: هەندێك نووسراو لە شاری مەدینەی پیرۆز بۆ دیمەشق هاتن کە ئاگرێك لە ڕۆژی پێنج شەممەی جەمادی دووەمی ئەم ساڵ بەرپا بووە، کەوا دەنگێکی زۆر گەورە لە شاری مەدینە هات و پاشان بوومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویدا کە دارو دیواری دەهەژاند، جا ئاگرێکی

---

(١) النهاية في الفتن والملاحم (١/١٤) .

(٢) أخرجه ابن ابي عدي في (الكامل في الضعفاء) (٦/ ١٢٣).

(٣) أخرجه الطبراني في (المعجم الكبير) (١٢/ ٢٣٣).

(٤) مەبەست لە ڕۆمان: بیری ڕۆمە کە لە شاری مەدینە ناسراوە.

(٥) ڕەکوبە: جێگایەکی بەرزە لەسەر ڕووی زەوی لەسەر ئەو ڕێگایەی مەدینەیە کە بەرەو شام دەڕوات. المسيح الدجال ونهايه العالم ، لا ٢٥.

مەزن لە (حەڕڕە) دەرکەوت لە نزیك (قورەیضە)[1]، ئێمە لەناو ماڵی خۆمان لە شاری مەدینە ئاگرەکەمان وا دەدیت دەتگوت: لەلای خۆمانە، چونکە ئاگرێکی گەورە بوو، جا ئاگرەکە بە دۆڵەکاندا ڕۆیشت تا گەیشتە دۆڵی (شەظا) کە ئاوی لیٚ هەڵدەقولاٚ[2]، وە ئاوەکەی (شەظا)ی وشك کردو چیتر ئاوی لیٚ نەهاتە دەرەوە، سوێند بە خوا ئێمە کۆمەڵێك بووین و دەرکەوتین تا تەماشای بکەین، وای لێهات خاکە سوتاوەکەشی ڕێی حاجیەکانی عێراقی گرت، جا ئاگرەکە هات تا گەیشتە خاکە سوتاوەکە، پاشان لەوە ترساین بگاتە ئێمەش بەڵام ئاگرەکە ڕاوەستا، پاشان بە لای ڕۆژهەڵاتدا ڕێگای گرتە بەر تا چیای ئاگرینی لێدەردەکەوت، خودای گەورە لە ئایەتێکی قورئاندا ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرمویٚ: [إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ ][3].

واتە: بە ڕاستی دۆزەخ پریشکی وەك کۆشك دەهاوێت، بەرەو دواوە دەڕۆن، دەڵێی کاروانی حوشتری زەردن.

هەروەها ئاگرەکە خاکیشی خوارد، ئەم نوسراوەش لە پێنجەم ڕۆژی ڕەجەبی ساڵی (٦٥٤) ی کۆچیدا نووسراوە، تا ئێستاش ئاگرەکە لە زیادبووندایەو نەگۆڕاوە، ئەم ئاگرە هەر زێدە دەبیٚ و نازانین پاش ئەمە چی ڕوو دەدات[4].

لە نوسراوێکی تر هاتووە کەوا لە ڕۆژهەڵاتی شاری مەدینەی پیرۆز ئاگرێکی گەورە کەوتۆتەوە، نیو ڕۆژە ڕیٚ لە شاری مەدینە دوور بوو، ئەم ئاگرەش لە زەویدا هەڵدەقولاٚو دۆڵێکی هەڵبەستا تا لەگەڵ کێوی ئوحد ڕاستی کردەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئاگرەکە دەربچێت ناوە ناوە لە مەدینەدا دەنگێکی گەورە دەهات، وە لە شوێنێکدا بوو کە پێی دەڵێن: ئەجیلین جا بە هۆی ئەو

---

(١) وفاء الوفاء، للسمهودي (١/ ١٤١).

(٢) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، محمد بيومي، لا ١٩.

(٣) سورة المرسلات ، الآية : (٣٢ ـ ٣٣).

(٤) الإشاعة لأشراط الساعة، لا (٧٠) .

ئاگرە خەڵکێکی زۆر وازی لە گوناە هێناو تەوبەیەکی تەواویان کرد[١]، بۆیە ئەوانەی ئەم ڕووداوەشیان دیت سوێندیان دەخواردو دەیانگوت: سوێند بە خوا جارێك زەوی لەرزی ئێمە لە دەوری ژووری پێغەمبەر(ﷺ) بووین، مینبەرەکەی لەگەڵ هەژا بە شێوەیەك لێی ترساین، چونکە گوێمان لە دەنگی ئەو ئاسنە بوو کە تێیدایە، ئێمە زۆر ترساین و چوینە لای ئەمیرو پێمانگوت: ئەی ئەمیر ئەشکەنجە دەوری داوین، بگەڕێوە بۆ لای خودا، جا ئەمیریش هەموو کۆیلەکانی خۆی ئازاد کردو ماڵی کۆمەڵێکی بۆ گێڕانەوە[٢].

ئەو ئاگرەش ئەوەندە گەورە بوو هەتا بە ڕۆژ رۆژ گیراو بە شەویش مانگ گیرا، لە کاتی دەرچونی ئەو ئاگرە..

ئەبو شامە لە مێژووەکەیدا دەربارەی دەرچوونی ئەو ئاگرە دەڵێت: لە سەرەتای ڕۆژدا مانگ گیراو پاشان لە سەرەتای ڕۆژدا خۆریش گیرا، چەند ڕۆژێك بە ڕەنگێکی گۆڕاو ڕووناکیەکەی کزمایەوە[٣].

لەو کاتەی کە ئەم ئاگرە بەرپا بوو لە خاکی حیجاز، شاری بەغدا نوقمی ژێر ئاو بوو، هەتا وای لێهات ئاو گەیشتە ئەو کۆشك و تەلارەی خەلیفەی بەغداد، نزیکەی (٣٨٠) خانووی ڕووخاند[٤].

شاعیر دەربارەی نقوم بوونی شاری بەغدا و ئاگرەکەی حیجاز دەڵێت :

سبحان من أصبحت مشيئته جارية في الورى بقدار

أغرق بغداد بالمياه كما أحرق أرض الحجاز بالنار[٥]

---

(١) البداية والنهاية، (١٣/ ١٩٢).

(٢) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، محمد بيومي، لا ٢٠.

(٣) فتح الباري (١٣/ ٧٩).

(٤) النهاية في الفتن والملاحم (١/١٥) .

(٥) البداية والنهاية (١٣/ ١٨٩).

واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە ویستی وی بە پێوانە و خەملاندنی ورد لە هەموو بوونەوەردا دەگەڕێ، بەغدای لە ئاودا نقوم کردو خاکی حیجازیشی بە ئاگر سوتاند.

بەڵام ئەبو شامە دەڵێ : ڕاستر ئەوە بوو کە بڵێی:

في سنة أغرق العراق وقد    أحرق أرض الحجاز بالنار[1]

واتە: لە ساڵێکدا عێراق نوقمی کردو خاکی حیجازیشی بە ئاگر سوتاند.

یەکێ لەو زانا گەورانەی کە لە کاتی کەوتنەوەی ئاگرەکە زیندوو بوو پێشەوا نەوەوی بوو کە دەڵێت: لە سەردەمی ئێمە لە ساڵی (٦٥٤)ی کۆچی ئاگرێك لە مەدینە کەوتەوە، کەوا ئاگرێکی زۆر مەزن بوو لەلای ڕۆژهەڵاتی شاری مەدینە، کەسانێکی شاری مەدینە باسی ئەو ئاگرەیان بۆ کردم کە لەو کاتەدا ئەوان لەوێ بوون[2].



## ئیعجازی زانستی لەم نیشانەیەی ڕۆژی دوایی :

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ [إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ][3].

واتە: بە ڕاستی دۆزەخ پریشکی وەك کۆشك دەهاوێت، بەرەو دوا دەڕۆن، دەڵێی کاروانی حوشتری زەردن.

لەم سەردەمەی ئێستا زانایانی گەردوونناسی ئەڵمانی چەندەها وێنەی تەقینەوەکانی ناوەکی گەرمی سەر ڕووی خۆریان بە دەست کەوتووە کە لەناویدا دیارە کە لەم تەقینەوەدا چەندەها بڵێسەی ئاگر بۆ ملیۆنەها کیلۆمەتر لە بۆشایی

---

(١) الجواب الصحيح (٤/ ١٧).

(٢) شرح صحيح مسلم (١٨/ ٢٨).

(٣) سورة المرسلات، الآية: (٣٢ ـ ٣٣).

ئاسماندا بەرز دەبێتەوە لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە زانایانی ئەڵمانی بینیان زۆربەی ئەو بڵێسە خۆرانە لە هەندێ شێوەکانیاندا زۆربەی بە وشتری زەرد دەچن لە ڕۆیشتنیاندا، (ڕەنگی بڵێسەی خۆر لە بنەڕەتدا زەردە) ئەمەش چەندەها جار دووبارە دەبێتەوە، کە ئەمەش قەت ناکرێت بە ڕێکەوت (صدفە) بێت.

ئەمەش ڕووی ئیعجازی تەعبیری قورئان کە دەفەرموێ: [كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾][1].

لەم ئایەتەدا ئەم بڵێسە دیار دەکات، کە زاڵ بوونە بەسەر کافرەکاندا، ئەم بڵێسانە وەك کۆشکێکی گەورەیە لە بەرزیو گەورەییدا بە وشتری زەرد دەچن.

ئەوەی ئاشکرایە کە ئەم خۆرە دەبێتە سەرچاوەی ئازاردان لە ڕۆژی دوایی، چونکە زۆر لە بونەوەران نزیك دەبێتەوە، هەتا لە ئارەقەی خۆیاندا دەخنکێن، وەکو لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە، ئەگەریش دەکرێت کە خوای گەورە ڕاستەوخۆ بە بڵێسەی خۆر ئازارمان بدات، کاتێ ئەم بڵێسانە ڕاستەوخۆ بە بەرمان دەکەون[2].

بەرگی یەکەم

---

(١) سورة المرسلات ، الآية : (٣٣).

(٢) سەرچاوەی ئەڵمانی: Meyers handbuch uber das Weltall.

# تایبەت بوونی دەسكەوت
# بە دەوڵەمەندەكانەوە

لە نیشانەكانی نزیكبوونەوەی كۆتایی بونەوەر دەستكەوتی شەڕ تایبەت دەبێت بە دەوڵەمەندو بەرپرسەكان..

فەیــء: دەستكەوتی موجاهیدانە، ماڵ بێت یان شتی تر، بەبێ شەڕ، ئیتر ئایا بەهۆی هەڵاتنی دوژمن یان خۆبەدەستەوەدانی و شتی لەو شێوە، ئەم جۆرە ماڵە دابەش دەكرێت بە پێی فەرموودەی خوای گەورە.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: [مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ ][١].

واتە: ئەوەی خوا دەست پێغەمبەری خست (بەبێ جەنگ) لە (سەروەت و سامانی) دێهاتییەكان ئەوە بۆ خواو پێغەمبەرە وە بۆ خزمان و هەتیوان وە بۆ هەژاران و ڕێبوارانی كەم دەست تا دەست بە دەستی پێنەكرێ (ئەو سامانە) لەناو دەوڵەمەندەكانتدا و بەس..

بەم شێوەیە خوای گەورە فەرمانی كردووە دابەش بكرێت، تاكو دەوڵەمەندەكان دەستی نەگرنە سەرو زاڵ ببنە سەر هەژارەكان.. بەڵام لە كۆتایی بونەوەر خەڵكی بەم دابەشكردنە كار ناكەن و دەوڵەمەندو سەرۆكەكان لە نێو خۆیاندا ئەو ماڵانە دەبەن.

---

(١) سورة الحشر، الآية: (٧).

پێشەوا ئەبو هوریرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إِذَا اتُّخِذَ الفَيْءُ دُوَلاً ..)[1].

واتە: ئەگەر دەسکەوتی بێ شەڕ تایبەت کرا بە دەوڵەمەندەکان...

کەواتە لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت دەستکەوت تەنها دەدرێت بە کەسی دەوڵەمەند و کەسایەتیە هەژارەکان لێی بێبەش دەبن.

(١) سنن الترمذي (٨/ ٤١٤) باب: ما جاء في علامة حلول المسخ والخسف، برقم: (٢٣٧٢).

# شەڕکردن لەگەڵ تورک (مەغۆل و تەتار)

لە نیشانە بچوکەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی شەڕکردنە لەگەڵ تورک[1].

فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) باس لە هەندێك ڕووداوی گرنگ دەکەن کە دوای وەفاتی خۆی ڕوودەدات، لەوانە ئەو فەرموودانەی کە باس لە جەنگی موسڵمانان دەکەن لەگەڵ مەغۆل.. تیایاندا پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی قەومێك دەکات کە جەنگ لەگەڵ موسڵمانان دەکەن، ئەو وەسفانەی ئەو بۆ ئەو قەومەی کردووەو بە (تورك) ناویان دەبات زۆر لە شێوەو وەسفی مەغۆل دەچن، بۆیە هەست دەکەین ئەو فەرموودانە جۆرێك لە ئیعجازی زانستی و غەیبیان تێدایە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطَرَّقَةُ)[2].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا شەڕ لەگەڵ کەسانێك دەکەن کە پێڵاوی لە موو دروست کراو لە پێ دەکەن، وە ڕۆژی دوایی نایەت تا شەڕ لەگەڵ میللەتێك دەکەن کە دەم و چاویان هەر دەڵێی قەڵغانی بە چەرم داپۆشراوە.

---

(١) سەبارەت بە تورك زانایانی ئیسلام جیاوازن کە تورك نەسڵەکەی کێیە؟
پێشەوا (خەطابی) (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێت: تورك ئەسڵەکەی لە بەنو قەنطورایە..
پێشەوا (کەراع) (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێت: تورك نەسڵەکەی لە دیلەمە..
(ئەبو عەمر) دەڵێت: تورك نەسڵەکەی لە کوڕانی (یافث)ە..
(وەهبی کوری مونەبە) دەڵێت: تورك ئەسلەکەی کوڕی مامی (یەئجوج و مەئجوج)ە، لەو کاتەی (ذوالقرنین) سەدەکەی داخست هەندێ لە (یەئجوج و مەئجوج)ەکان لەوێ نەبوون و بەر سەددەکە نەکەوتن بۆیە ناویان لێنراوە تورك.. هەندێ زانای تر دەڵێن: لە کوڕی (ئەفریدونی کوری سام ی کوری نوح)ە. سەرچاوە: فتح الباری (٦/ ١٠٤).
(٢) صحيح البخاري (٣/ ١٣١٥) باب: علامات النبوة في الإسلام، برقم: (٣٣٩٤).

لە فەرموودەیەکی تر پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ التُّرْكَ، قَوْمًا وُجُوهُهُمْ كَالْمَجَانِّ الْمُطْرَقَةِ يَلْبَسُونَ الشَّعَرَ، وَيَمْشُونَ فِي الشَّعَرِ)[1].

واتە: ڕۆژی دوایی نایەت تا شەڕ لەگەڵ میللەتێك دەکەن کەوا تورکن، ئەم میللەتە دەم و چاویان هەر دەڵێی قەڵغانی بە چەرم داپۆشراوە، پێڵاوی لە موو دروست کراو لە پێ دەکەن و لەسەری دەڕۆن.

الْمَجَانُّ: قەلغان.

الْمُطَرَّقَةُ: بە تورق دەگوترێت کە پێستەیەکی ئەستورەو قەڵغانی پێ دادەپۆشن.

نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ: کەوشێك لە پێ دەکەن لە فەروو یان (چەرمێك خوری بە ناوەکەیدا ئەدوورن)[2].

پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی بوریدە لە باوکی دەگێڕێتەوە دەڵێت: ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبووین گوێمان لێ بوو دەیفەرموو: (إِنَّ أُمَّتِي يَسُوقُهَا قَوْمٌ عِرَاضُ الْأَوْجُهِ صِغَارُ الْأَعْيُنِ كَأَنَّ وُجُوهَهُمْ الْحَجَفُ ثَلَاثَ مِرَارٍ حَتَّى يُلْحِقُوهُمْ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ أَمَّا السَّابِقَةُ الْأُولَى فَيَنْجُو مَنْ هَرَبَ مِنْهُمْ وَأَمَّا الثَّانِيَةُ فَيَهْلِكُ بَعْضٌ وَيَنْجُو بَعْضٌ وَأَمَّا الثَّالِثَةُ فَيُصْطَلَوْنَ كُلُّهُمْ مَنْ بَقِيَ مِنْهُمْ قَالُوا يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَنْ هُمْ قَالَ هُمْ التُّرْكُ قَالَ أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيَرْبِطُنَّ خُيُولَهُمْ إِلَى سَوَارِي مَسَاجِدِ الْمُسْلِمِينَ)[3].

واتە: ئومەتەکەم لەلایەن کۆمەڵێکی دەم و چاو پانەوە ڕاپێچ دەکرێن، چاوەکانیان بچوکە، دەم و چاویان دەڵێی قەڵغانە (سێ جار)، تەنانەت لە دوورگەی عەرەبیشدا شوێنیان دەکەون و ڕاویان دەنێن، لە جاری یەکەمدا هەر

---

(١) صحيح مسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٧١٧٣).

(٢) شرح صحيح مسلم (١٨/ ٣٧).

(٣) مسند الإمام أحمد (٣٨/ ٤٤) برقم: (٢٢٩٥١).

کەسێك هەڵبێت و ڕابکات ڕزگاری دەبێت، لە جاری دووەمدا هەندێك تیا دەچن و هەندێکی تر ڕزگاریان دەبێت، بەڵام لە جاری سێهەمدا هەموو ئەوانەی کە دەمێننەوە دروێنەو قەلاچۆ دەکرێن، هاوەڵەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوانە کێن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەوانە تورکن، ئینجا فەرموی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە وڵاخ و ئەسپەکانیان بە دیواری مزگەوتەکانی موسڵمانانەوە دەبەستنەوە.

پاش گێڕانەوەی فەرموودەکە (عەبدوڵلا) دەڵێت: هەر بۆیە (بورەیدە)ی باوکم هەمیشە دوو وولاخی بۆ باروکۆچەوە ئامادە بوو بۆ ڕاکردن لە ترسی ئەو نەهامەتیەی کە لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستبوو کە دووچاری ئومەتەکەی دەبێت لەسەر دەستی ئەو تورکانە.

جا پێغەمبەر(ﷺ) چۆنی فەرموو: ئاوا هاتە دی.

پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە بارەی ئەو تەتەرانەی کەوا جیهانی ئیسلامیان داگیر کرد بوو دەفەرموێ: ئەو تورکانەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردوون لە سەردەمی ئێمەدا هەبوون، بە هەموو سیفاتەکانیانەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی لێوە کردبوو، چاوی بچوك ڕەنگی سوور، لوتی کورت و فش، ڕووی پان وەکو قەڵغانی پیستە پۆش، پێڵاوی موویان لە پێ بوو، بەم هەموو سیفاتانەوە لە سەردەمی ئێمەدا هەبوون، موسڵمانانیش چەندین جار لەگەڵیان دەجەنگان[١].

پێشەوا ئیبنو تەیمیەش کە خۆی لە ڕووداوەکاندا ژیاوە دەڵێ: ئەگەر خۆت ئەو گەلە ببینی نازانی وەکو پێغەمبەر(ﷺ) وەسفیان بکەی[٢].

بێگومان زۆرێك لە تەتارەکان هاتنە نێو ئاینی ئیسلام، وە لەسەر دەستیاندا خێرێکی زۆر ڕووی کردە ئیسلام و موسڵمانان، وە دەوڵەتێکی گەورەی ئیسلامیان

---

(١) شرح النووي على صحيح مسلم (١٨/ ٣٧ ـ ٣٨).

(٢) نبوة محمد من الشك إلى اليقين، لا ١٩٢.

پێك هێنا كە ئیسلام بە هۆیەوە شكۆمەند بوو، لەسەردەمی ئەم دەوڵەتەدا فتوحاتی گەورە بەردەستە بووە، یەكیٚ لەوان ڕزگاركردنی قوسطنطنیهیە كە پایتەختی ڕۆم بوو كە جارێكی تریش ڕزگار دەكریٚ لە پێش دەرچوونی دەجال، دوای ئەوەی كە پێغەمبەر(ﷺ) باسی شەڕ لەگەڵ توركی كرد فەرمووی: دەبینن كە چاكترینی خەڵكی ئەوانەن كە زۆریەیان ڕوویان لەم ئاینە كردووە تاكو دێنە ناوی، وە خەڵك پێكهاتەن جا چاكترینیان لەسەردەمی نەزانیدا چاكترینیانە لەسەردەمی موسڵمانەتیاندا[١].

بێگومان موسڵمانان شەڕیان لەگەڵ توركدا كرد لەسەردەمی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لیٚ بێت) ئەوەش لەكاتی خیلافەی بەنی ئومەویەكان بوو لە سەردەمی موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان.

پێشەوا ئەبو یەعلا دەگێڕێتەوە لە موعاویەی كوڕی خودەیج(ﷺ) دەڵیٚ:

(كُنْتُ عِنْدَ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ حِينَ جَاءَهُ كِتَابُ عَامِلِهِ يُخْبِرُهُ أَنَّهُ وَقَعَ بِالتُّرْكِ وَهَزَمَهُمْ وَكَثْرَةَ مَنْ قَتَلَ مِنْهُمْ وَكَثْرَةَ مَا غَنِمَ، فَغَضِبَ مُعَاوِيَةُ مِنْ ذَلِكَ ثُمَّ أَمَرَ أَنْ يُكْتَبَ إِلَيْهِ: قَدْ فَهِمْتُ مَا ذَكَرْتَ مِمَّا قُلْتَ وَغَنِمْتَ فَلا أَعْلَمَنَّ مَا عُدْتَ لِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ وَلا قَاتَلْتَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَكَ أَمْرِي، قُلْتُ لَهُ: لِمَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: لَتَظْهَرَنَّ التُّرْكُ عَلَى الْعَرَبِ حَتَّى تَلْحَقَهَا بِمَنَابِتِ الشِّيحِ وَالْقَيْصُومِ، فَأَنَا أَكْرَهُ قِتَالَهُمْ لِذَلِكَ)[٢].

واتە: من لەلای موعاویەی كوری ئەبو سوفیان بووم، كاتیٚ هەواڵدەرێكی جەنگی هات و هەواڵی پێدا كەوا گەیشتۆتە توركەكان و تێكی شكاندون و زۆری لیٚ كوشتون و ماڵاتێكی زۆریشی لیٚ گرتوون، جا موعاویە تورە بوو لەمە، پاشان فەرمانی كرد كە بۆی بنوسن: من تێگەیشتم كە چیت گوت لەوەی كوشتوتەو دەستت كەوتووە جا كاری وا دووبارە نەكەیتەوە تاكو فەرمانی منت بۆ دیٚ، دەڵیٚ: لەبەرچی ئەی فەرمانەدەی موسڵمانان؟ گوتی: من گوێم

---

(١) صحيح البخاري (٦/ ٦٠٤ مع الفتح).

(٢) مسند أبي يعلى، (١٣/ ٣٦٦) برقم: (٧٣٧٦).

بەرگی یەكەم

لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو كە دەیفەرموو: تورك بەسەر عەرەباندا سەر دەكەون تاكو ڕاویان دەنێن، جا من حەز ناكەم شەڕیان لەگەڵ بكەم لەبەر ئەمە.

جا قسەیەك هەبوو كە بەناو بانگ بوو لەسەردەمی هاوەڵاندا كە دەیانگوت: واز بێنن لە تورك تا وازی لێتان هێناوە.

## پەیوەندی نێوان مەغۆل و تورك:

لە ڕاستیدا زانایان زۆر بە درێژی ئەم باسەیان كردووەو ڕای جیاوازیان هەیە و جیاكردنەوەی ئەم دوو قەومە لە یەكتر زۆر ئاڵۆزە، بە تایبەتی كاتێك زمانی مەغۆلی و توركی زۆر لەیەكەوە نزیكن و یەك بنەچەیان هەیەو دەگەڕێنەوە بۆ ئەو زمانانەی كە پێیان دەگوترێ (Altaic)، هەروەها وشەیەكی تر كە پێش پەیدابوونی (مەغۆل) بەكار هاتووە وشەی (تەتەر)ە، كە تا كاتی پەیدابوونی سەركردەی بەناوبانگی مەغۆلی (جەنگیزخان) بەكارهاتووە، لە دوای ئەوە ئیتر وشەی (Mongol) لەبری (تەتەر) بەكار هێنراوە، بۆیە هەندێك دەڵێن: (تەتەر) و (مەغۆل) بە هەموو تیرەكانیانەوە هۆزەكانی قەومێك بوون و (جەنگیزخان) توانی هەموو هۆزەكان یەك بخات و ناویان بنێت (مەغۆل).

هەندێكیش پێیان وایە كە (مەغۆل) وشەیەكە ئەو هۆزە سەركەوتووە بەكاری هێناوە كە وەك هێزێكی كارای سەربازی و سیاسی دەركەوت و ئەو وشەیەی فەرز كرد بەسەر هۆزەكانی تر، دەنا خۆشیان لە بنەڕەتدا هەر (تەتەر) بوون كە ئەوانیش هۆزێكی سەر بە قەومی (تورك)ن[1]!

زانایان ڕای جۆراو جۆریان لەم بارەوە هەیە، ئایا (تەتەر) و (مەغۆل) دوو قەومی جیاوازن یان (مەغۆل) لە بنچینەدا (تەتەر)ن؟

وە ئایا ئەگەر (تەتەر)و (مەغۆل) دوو قەومی جیاواز بن، ئایا لە ڕەگەزدا (تورك)ن و لە بنەچەدا هۆزی (تورك) بوون یان دوو قەومی سەربەخۆن؟

---

(١) موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة، لا ٢٦٧.

بەشی یەكەم

بە هەر حاڵ ئەوەی لەم باسەدا بەلای ئێمەوە گرنگە ئەوەیە کە ئەگەر زانایانی کۆن و نوێ ڕێکبکەون لەسەر ئەوەی کە (تورك) و (مەغۆل) دوو قەومی جیاوازن، کاریگەری لەسەر باسەکەی ئێمە نابێت چونکە لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەو دووە لە بنەڕەتدا دوو هۆزی سەر بە یەك نەژادن و زمانیشیان یەك بنەچەی هەیە.

مەغۆل وڵاتانی موسڵمانانیان داگیر کرد:

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لە نێوان تورکان و موسڵماناندا هیچ نێوان و پەیوەندیەك نەبوو تا ئەوەی کە وردە وردە خاکیان ڕزگار کراو غەنائیمی زۆریان دەست کەوت و تیایدا تەماح گیربوون لەوەی کە بە ئازاو نەبەرد ناوبانگیان دەرکردبوو تا ئەوەی کە زۆربەی سەربازەکانی خەلیفە موعتەصەم لەم تورکانە بوو، پاشان تورکەکان زاڵ بوون بەسەر دەسەڵاتداو ئەوەی متەوەکیلیان کوشت یەکە یەکە دەسەڵاتیان گەیشتە دەست، پاشان هەر لە تورك بوون وڵاتانی عەجەمیان خستە ژێر دەستی خۆیان، پاشان کەس و کاری سەلجوقیەکان کە دەسەڵاتەکەیان درێژ بوویەوە تاکو ناوچەکانی عێراق و شام و ڕۆم ڕۆیشت[1].

لە ساڵی (٤٦٣)ی کۆچی لە جەنگی (ملاذ کرد) سوڵتانی سەلجوقی (الب ئەرسەلان) سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێنا بەسەر ڕۆمەکان و کاریگەری زۆری لە دوای خۆی بە جێهێشت، بەمەش سەلجوقیەکان دەسەڵاتیان فرەوانتر بوو، لە تورکستانی چینەوە هەتا ڕۆخەکانی دەریای (مەرمەڕ)[2]، لە لایەکی تریشەوە لە (قەوقازە)وە هەتا خەلیجی (بەصرە) دوای (٣٠) ساڵ لەو جەنگە واتە: لە ساڵی (٤٩٤) کۆچی جەنگی خاچپەرستان دەستی پێ کرد، ئەم هێرشانەیان دوو سەدەی خایاند واتە: لە ساڵی (٦٩٠)ی کۆچی سوڵتان (ئەشرف) شاری عەککای پاك کردەوە لە خاچپەرستان، لە کاتێکدا هێرشی خاچپەرستان لەسەر وڵاتی شام و میسر بوو، مەغۆلەکانیش بەرەو بەغدا هاتن

---

(١) فتح الباري (٦/ ٦٠٩ ـ ٦١٠).

(٢) أشراط الساعة، ماهر أحمد الصوفي، لا ١١٥ .

و وەك گێژەڵووکە هەرچی بهاتایە ڕێیان لوولیان دەداو ڕایان دەماڵی، هەتا لە شەڕی (عین جالوت) موسڵمانان تێکیان شکاندن و وەستاندنیانن.

هەر لەو سەردەمەشدا موسڵمانان لە ئەندەلوس ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بوون، دواتر توانیان بۆ ماوەیەکی زۆر خۆیان بگرن، وە لە دوای دوو سەدە لە کۆتایی هاتنی جەنگی خاچپەرستان (غەرناطە)ش لە دەست موسڵمانان دەرچوو، پاش ئەوە بە (٥٠) ساڵ موسڵمانان بە هۆی (قوسطنطنیە) ەوە گڕوتینیان تێکەوتەوەو ڕووەو ئەوروپا بۆ جارێکی تر کشان[١].

ئەمانە هەمووی لە ماوەی چوار سەدە ڕوویدا واتە: لە ساڵی (٤٩٤)ی کۆچی هەتا (٨٥٧)ی کۆچی کە فەتحی (قوسطنطنیە) کراو ئەو قەڵا مەزنە گیرا.

لویسی نۆیەم کە سەرکردایەتی چەند هێرشێکی خاچپەرستەکانی کردو تێکشکا، هەندێ لە پیاوەکانی سەرکردەی مەغۆلی بانگ کرد بۆ (فەرەنسا) و ڕێککەوتنامەی سەربازی لەگەڵیدا مۆر کرد، کە هەردوولا دژ بە موسڵمانان بجەنگن، ئینجا لە ساڵی (٦٤٩)ی کۆچی، دیاری زۆری نارد بۆ سەرکردەی مەغۆلەکان.

هۆلاکۆ ژنەکەی گاور بوو، وە هەندێ لە وەزیرو دەستەو دارەکەشی گاور بوون، ئەم ژنە خزمەتی چاکی بە ئەوروپا کرد، بەوەی کە کاری کردە سەر هۆلاکۆی مێردی کە هێرش نەباتە سەر ئەوروپا، بەڵکو ڕوو بکاتە وڵاتە ئیسلامیەکان و پەلاماری ئەوان بدات، بەڵێ خاچپەرستەکان و مەغۆلەکان ڕێکەوتن کە مەغۆلەکان خیلافەتی ئیسلامی لە بەغدا بڕوخێنن و خاچپەرستەکانیش پەلاماری میسر بدەن و سەرقاڵیان بکەن تا نەتوانن بچن بە دەنگ موسڵمانانی بەغداوە[٢]، هێرشی مەغۆلەکان کارەساتێکی گەورە بوو بۆ موسڵمانان، کە تیایدا خەلیفەو دارو دەستەکەی نزیکەی ملیۆنێك و شەست هەزار موسڵمان کوژران،

---

(١) موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة، لا ٢٦٨.

(٢) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، لا ٨٠ .

که تا چەند میلێك ئاوی دیجلەو فورات سوربوون، ئەمە بێجگە لەوەی کە بە هەزارەها دەست نووس و پەڕاوی زانستی سووتێنران و خرانە ئاوی ڕووبارەوە.

لە ڕاستیدا فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەمووی هاتونەتە دی، بۆیە ئومەتی ئیسلام نزیکەی یەك سەدە شەڕی لەگەڵ ئەم تورکانە کرد، سەرەتا لە هێرشەکانی جەنگیزخانی یەکەم سەرکردەی تەتارو مەغۆلەکانەوە دەستی پێکرد بۆ سەر مەملەکەتی خەواریزم شا لە ئەفغانستان، دواتر پەلاماردانی ئێران و داگیرکردنی، پاشان بە سەرکردایەتی (هۆلاکۆ)ی کوڕەزای جەنگیزخان لە ساڵی (٦٥٦) کۆچی ڕوویان کردە شاری بەغدادی پایتەختی خیلافەتی ئیسلامی و ئەویشیان داگیر کردو خەلیفەی موسڵمانانیان کوشت و کۆتاییان بە خیلافەتی عەباسی هێناو نەهامەتیەکی هێندە گەورەیان بەسەر ئومەتی ئیسلام هێنا کە لە مێژووی خۆیدا شتی وای بەسەر نەهاتبوو، هەر شارو مەملەکەتێکیش کە داگیریان دەکرد پاش قەتل و عام کردنی هەموو خەڵکەکەی تەخت و تاراجی شارەکەشیان بەسەریەکدا دەڕووخاندو دەیان سوتاندن بە جۆرێك کە تەنها لە شاری (بەغداد) زیاتر لە یەك ملیۆن موسڵمانیان کوشت، دواتر لە وڵاتی شام لەسەر دەستی سەرکردەیەکی ئیسلامی بە ناوی (سیف الدین قطز)ەوە موسڵمانەکان توانیان لە جەنگی(عین جالوت) بیانشکێنن[1]. خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: [قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ].

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێت: بانگەشە دەکرێن بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی میللەتێکی خاوەن زەبری توند، کە دەبێت شەڕیان لەگەڵدا بکەن یان موسڵمان ببن.

پێشەوا تاج الدین سوبوکی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: لەو کاتەی خودای گەورە دونیای دروست کردووە هیچ فیتنەیەکی گەورەم نەبیستووە لە فیتنەی تەتار گەورەتر بێت.

---

(١) علامات الساعة الصغرى والكبرى (لا ٧).

بەرگی یەکەم

سەعدی شیرازی بە قەسیدەیەکی فارسی دەربارەی خەلیفە موستەعسەم کە تورکەکان لایان برد دەڵێت:

آسمان راحق برد کرخزن ببارد بر زمين

بر زوال ملك مستعـــــصم أمير المؤمنين

واتە: پێویستە ئاسمان لەسەر زەوی بگریەت بە لاچوونی خەلیفە موستەعسەم، چونکە تەتەرەکان مزگەوتەکانیان ڕووخاندو قورئانەکانیان سوتاندو پیاوانیان دەکوشت و ئافرەتانیان دەهێشتەوە.

(مەغۆلەکان) لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی عەباسیدا موسڵمانبوون و مەملەکەتێکی ئیسلامییان دروست کردو ناویان نا هۆی ئاڵتونی (Golden Horde) کە ڕەنگی خێوەتگاکانیان بوو.. (بەرەکەت خان) یەکەم ئیمپڕاتۆری مەغۆلی بوو کە موسڵمان بوو پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ پادشای میسر (زاهیر بیبرس) هەبوو.. هاوپەیمانی یەك بوون و بەردەوام دیارییان لەگەڵ یەك دەگۆڕیەوە، (زاهیر بیبرس) کچی (بەرەکەت خان)ی خواست و بوو بە خێزانی و فەرمانی دەرکرد کە لە مینبەرەکانی (قاهیرە) و (قودس) و (مەککە) و (مەدینە) دوعا بۆ (بەرەکەت خان) بکرێت[١].

دواتریش (مەغۆل) سالآنێکی زۆر پەیوەندی توندو تۆڵیان لەگەڵ (عوسمانیەکان) هەبوو لە دژی (قەیسەرەکانی ئەوروپا).. (مەغۆل) زۆر بایەخیان بە دروستکردنی مزگەوت دەدا، ئەو مزگەوتانەشی کە دروستیان کردوون هەتا ئێستاش ماون و بە توحفەیەکی میعماری دادەنرێن، بە نمونە مزگەوتی شارەکانی (بوخارا) و (سەمەرقەند).

هەروەها زانای زۆر گەورەیان تیا هەڵکەوتووە کە موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە بۆ خوێندن گەشتیان بۆ لا دەکرن، بە نموونە وەك (قطب الدين محمد الرازي) و (سعدالدين التفتازاني).

---

(١) صحيح أشراط الساعة الصغرى والكبرى، لا ٨٠ .

## ئیعجازی غەیبی و زانستی لە فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ):

١) هەواڵدانی جەنگی موسڵمانان لەگەڵ قەومی تورك (مەغۆل)دا.

٢) بە شێوەیەك وەسفی ئەو قەومەی کردووە کە زۆر لەگەڵ شکلی تورك (مەغۆل) دا ڕێ دەکەوێت، بە مەرجێگ هەرگیز لە ژیانیدا ئەوانی نەبینیبوو.

٣) ئاماژەیان بۆ دەکات بە قەوم (قوما)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان لەسەر بناغەی خێڵەکی و نەتەوەیی و ڕەگەز پەرستی جەنگ لەگەڵ موسڵمانان دەکەن، نەك لەسەر بناغەی بیروڕا و باوەڕ بە نمونە وەك جولەکەکان.

٤) بە وەسف و پێوانەی زانستی وەسفی ئەو قەومە دەکات، کە زانایانی ئەمڕۆی نەژاد شوناسیش لە پۆلێن کردنی نەژادی مرۆڤایەتیدا هەر پشت بەو پێوانانە دەبەستن (شێوەی ڕوو، چاو، لوت، ڕەنگی پێست).

٥) ئاماژە دەکات کە ئەو قەومە لەناوچە ساردەکان دەژین کاتێك دەڵێت: فەروو لەبەر دەکەن و ..

٦) ئاماژە دەکات ئەو قەومە بۆ دەستخستنی ڕۆزییان پشت بە ئاژەڵداری و شوان کاری و ڕاوکردن دەکەن چونکە فەروو لەبەر دەکەن.

٧) ئاماژە دەکات ئەو قەومە دەست بەسەر ناوچەیەکدا دەگرن کە خورمای زۆری لێیە، کە ئەوەش لەگەڵ وەسفی وڵاتی عێراقدا ڕێك دەکەوێت.

٨) ئاماژەی تێدایە کە ئەوان بە ئەسپ شاڵاو دەبەن.

٩) ئاماژەیەکی شاراوە دەکات بۆ ئەوەی کە موسڵمان دەبن و بە باشی دێنە ناو ئیسلامەوە[1].

---

(١) موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة، لا ٢٦٩.

## لەنێوچوونی هۆزی قورەیش

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی هۆزی قوڕەیش لەناودەچێت و نامێنێت..

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (أَسْرَعُ قَبَائِلِ الْعَرَبِ فَنَاءً قُرَيْشٌ وَيُوشِكُ أَنْ تَمُرَّ الْمَرْأَةُ بِالنَّعْلِ فَتَقُولَ إِنَّ هَذَا نَعْلُ قُرَشِيٍّ)[1]. واتە: خێراترین هۆزەکان بە لەناوچوون هۆزی قورەیشە، دوور نیە ئافرەتێك بە لای پێڵاوێکدا تێپەڕ ببێت و بڵێ: ئەوە پێڵاوی کەسێکی قوریشییە.

هۆزی قورەیش لە هۆزە عەرەبەکانن، لە نەوەی (فهری کوڕی مالیکی کوڕی نەزری بەنی کینانە)ن، قورەیشیش نازناوێکە زاڵ بوو بەسەر نەوەکانیدا لە وشەی (التقارش)ەوە هاتووە، واتە: بازرگانی، چونکە ئەوان بازرگان بوون..

قورەیشیش چەند تیرەیەکن: (بنو الحارث بن فهر) و (بنو جذيمة) و (بنو عائذة) و (بنو لؤي بن غالب) و (بنو عامر بن لؤي) و (بنو عدي بن كعب بن لؤي) و (بنو مخزوم)و (بنو تميم)و (بنو زهرة بن كلاب) و (بنو أسد) و (بنو عبدالدار) و (بنو نوفل) و (بنو عبدالمطلب) و (بنو أمية) و (بنو هاشم) و تیرەی تریش.

لە پاش هاتنی ئیسلام قورەیش تیرەی زیاتر لێ بوویەوە، وەکو: بەکری و عومەری و عوسمانی و عەلەویەکان و کەسانی تر.. نیشتەجێ بوونیان لە بنچینەدا لە دوورگەی عەرەب بووە، دواتر بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەتەوە.. پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوین کە ئەوان لە کەمبووندان تاکو تەواو دەبن یان زۆر کەم دەبنەوە.

دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لام و فەرموی: (يَا عَائِشَةُ ، قَوْمُكِ أَسْرَعُ أُمَّتِي بِي لَحَاقًا..)[2]. واتە: ئەی عائیشە قەومەکەی تۆ خێراترین ئوممەتن لە گەیشتنیان بە من..

---

(١) صحيح:مسند الإمام أحمد (٢/ ٣٣٦) برقم: (٨٤١٨). قال الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

(٢) صحيح: مسند الإمام أحمد (٦/ ٨١) برقم: (٢٤٥٦٣) قال شعيب الأرناؤوط: رجاله ثقات رجال الشيخين وأورده الهيثمي في المجمع ١٠ / ٢٧ - ٢٨ وذكر أن رجاله رجال الصحيح .

# شەڕکردن لەگەڵ عەجەم

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی کۆتایی بونەوەر کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە شەڕکردنە لەگەڵ عەجەم، وە خاکی عەجەمیش وڵاتی ئێران و دەوروبەرەکەیەتی.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا خُوزًا وَكَرْمَانَ مِنَ الأَعَاجِمِ، حُمْرَ الْوُجُوهِ فُطْسَ الأُنُوفِ، صِغَارَ الأَعْيُنِ، وُجُوهُهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ، نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ)[١].

واتە: ڕۆژی دوایی نایت هەتا شەڕ لەگەڵ خوزو کرمان دەکەن میللەتێکی عەجەمی دەم و چاو سوورن.

خوز: شاری ئەهوازە کە شارێکی عەرەبیە..

کرمان: شارێکە لە ئێران لەسەر سنوری ئەفغانستان[٢].

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) باسی پێڵاوەکانیان دەکات کە لە مووی مەڕو ماڵات دروست کراوە، هەروەك و کڵاشی کوردی ئەمڕۆی خۆمان، ئەو میللەتەش میللەتی تورکە، وە تورکیش کاتی خۆی بەو میللەتە دەگوترا کە خەڵکی وڵاتی مەنغۆلیاو قەفقیساو سنورەکانی ئەمڕۆی ڕووسیا لەگەڵ چین و یابان دا، کە کاتی خۆی بەو مەملەکەتانە دەگوترا (خۆزو کرمان)، وە روخساری دەم و چاوی خەڵکەکەی جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕووخساری خەڵکی تر، تەنانەت تورکەکانی ئەمڕۆش بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر خەڵکی ئەو ناوچانەو نزیکەی

---

(١) صحيح البخاري، كتاب المناقب، باب علامات النبوة، (٦ / ٦٠٤. مع الفتح) رقم الحديث: (٣٥٩٠).

(٢) بلدان الخلافة الشرقية، (لا ٣٧ ـ ٣٤٩).

(٨٠٠) ساڵ پێش ئێستا لە ناوچەکانی خۆیانەوە کۆچیان کردووە بەرەو خۆرئاواو لە شوێنی تورکیای ئەمڕۆدا نیشتەجێ بوون و هەتا ئەمڕۆش بە تورك ناو دەبرێن[١].

پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت:

دەگونجێ کە وەڵام بۆ ئەمە ئەوەبێ کە ئەم فەرموودەیە جیاواز بێت لەگەڵ ئەم فەرموودەی کە باسی تورکەکان دەکات، بەڵام ئاگادارکردنەوەکە یەك دەگرێتەوە بە دەرچوونی ئەم دوو گەلە[٢].

دوای توێژینەوەیەکی زۆر گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە پێم وایە ئەوەی کە ئەم بۆچوونە بەهێز دەکات فەرموودەیەکە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(يُوشِكُ أَنْ يَمْلَأَ اللَّهُ أَيْدِيَكُمْ مِنَ الْعَجَمِ، ثُمَّ يَجْعَلَهُمْ أُسُدًا لَا يَفِرُّونَ يُقَاتِلُونَ مُقَاتِلِيكُمْ وَيَأْكُلُونَ فَيْئَكُمْ)[٣].

واتە: نزیکە خوای گەورە دەستان پڕ بکات لە عەجەمان، لە پاشان ببنە شێرو شەڕ لە شەڕگەیان بکەن و لەگەڵ دوژمنتان بجەنگن و غەنیمەتەکان بخۆن.

لەم فەرموودەیە بۆمان ڕوون بویەوە کە شەڕی عەجەم بە یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی دادەنرێت.



---

(١) أشراط الساعة، ماهر أحمد الصوفي، (لا ١١٥) .

(٢) فتح الباري (٦/ ٦٠٧).

(٣) صحيح: رواه الحاكم في (المستدرك) (٤/ ٥٦٤) برقم: (٨٥٨٣). وقال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الإِسْنَادِ.

# ئوممەتی ئیسلام پارچە پارچە ئەبێت

پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) ئاگاداری کردووین کە ئوممەتەکەی دەبێتە (٧٣) دەستەوەو هەمووی دەچێتە دۆزەخەوە تەنها یەك دەستەیان نەبیٚ کە ڕزگاری دەبیٚ و ناچێتە دۆزەخەوە ئەویش ئەهلی سوننەو جەماعەیە.

هەر چەندە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو (٧٢) کۆمەڵە کێن و چۆن دەتوانریٚ دیاری بکرێن؟ بەڵام دەربارەی (تاقمی سەرکەوتوو) (الطائفة المنصورة) جیاوازییان نیەو دیاری کراویشە کە کێن و پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) خۆی باسی لیٚ کردووە، بەڵام پێش ئەوەی بچینە سەر ئەو باسە، چەند یاسایەك باس دەکەین کە (جمهوری سەلەف) لەسەری یەك دەنگن:

١- بوونی جیاوازی و ڕای جیا جیا لەناو ئەم ئوممەتەدا شتێکی جێگیرو بڕاوەیەو قورئان و سوننەت یەکلایان کردۆتەوە.

٢- پێغەمبەر (ﷺ) دیاری کردووە کە ئەو کۆمەڵە تیاچووانە (٧٢) بەشن و ئەوەیشی کە ڕزگاری دەبیٚ یەك بەشە.

٣- پێغەمبەر(ﷺ) دیاری کردووە کە ئەو کۆمەڵە ڕزگار بووە ئەوانەن کە بە پوختەیی دەستیان بە قورئان و سوننەتەوە گرتووە.

٤- ئەو تاقمە تیاچووانە ئەهلی ئاگرن و بەڵام هەر هەموویان بەهەتا هەتایی لە ئاگردا نامێننەوە.

٥- دیاری کردنی گروپ و کۆمەڵ بڕینیان بەسەر ئەو (٧٢) بەشەیەی کە لە فەرموودەکەدا هاتووە شتێکی ناڕەوایەو دەمدانە لەکارە نادیارەکان، بەو مەرجانە نەبێت کە زاناو پێشینانمان دایان ناوە.

پارچە پارچە بوونی ئوممەتی ئیسلامی بۆ زیاتر لە حەفتا کۆمەڵ کە هەموویان لە ئاگردان یەکێکیان نەبێت، قسەیەکی زۆر هەیە دەربارەی واتاکانی و دەربارەی ڕێگەکانی سەلماندنی[1]..

پێشەوا عەوفی کوڕی مالیك(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَافْتَرَقَتِ النَّصَارَى عَلَى اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَفْتَرِقَنَّ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً وَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ، وَاثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَنْ هِيَ؟ قَالَ: الْجَمَاعَةُ)[2].

واتە: جولەکە بوون بە حەفتاو یەك کۆمەڵ، تەنها یەکێکیان بۆ بەهەشتە ئەوانی تر بۆ ناو ئاگری دۆزەخە..

گاورەکانیش بوون بە حەفتاو دوو کۆمەڵ، تەنها یەکێکیان بۆ بەهەشتە ئەوانی تر بۆ ناو ئاگری دۆزەخە..

ئوممەتی منیش دەبێ بە حەفتاو سێ کۆمەڵ، تەنها یەکێکیان بۆ بەهەشتە ئەوانی تر هەمووی بۆ ئاگری دۆزەخە

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو کەسەی بۆ بەهەشتە کێیە؟

فەرموی: ئەو کەسەیە کە لەگەڵ (کۆمەڵ)ە.

---

(١) شتێك پێویستە بزانرێت دەربارەی ئەم فەرموودە کە لە هەردوو صەحیحەکەدا نەهاتووە لەگەڵ ئەوەدا بابەتەکەی زۆر گرنگیشە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەرجی (صحیح) بوونی هیچ کام لە بوخاری و موسلیمی تێدا نیە.
ئەوەشی کە دەگوترێ دەی خۆ پێشەوا بوخاری و موسلیم هەموو فەرموودە صەحیحەکانیان لەخۆنەگرتووە، ئەوە بێگومان وایە بەڵام چ بوخاری و چ موسلیم زۆر لەسەر ئەوە سووربوون کە (باب)ێکی گرنگ چیە لە زانستدا جێی نەهێڵن تا ئەگەر یەك فەرموودەش بوویێت ڕیوایەتی نەکەن تێیدا!

(٢) المعجم الكبير (١٨/ ٧٠)، برقم: (١٤٨٣٧).

پێشەوا ئیبنو تەیمیە(ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: پایەو ئەساسی هەموو شتێك پابەندبوونە بەعەهدو پەیمانی خوا، نابیٚ بە هیچ شێوەیەك ئاژاوەو پەرتەوازەیی ببیٚ، هەر بەمەش خوای گەورە لە کتێبەکەیدا وەسیەتی بۆ کردوین.

بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە بە پەرتەوازەیی و ئەم گەلە کە گەلانی پێشوو هەر هەموویان پەرتەوازە بوون و بەهۆیەوە لەناوچوون، هەروەك لە فەرموودەی پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) هاتووە کە دەڵیٚ:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَافْتَرَقَتِ النَّصَارَى عَلَى اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً)[١].

واتە: جولەکەکان پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو یەك کۆمەڵ وە گاورەکانیش بۆ حەفتاو دوو کۆمەڵ وە ئومەتی منیش پەرتەوازە دەبیٚ بۆ حەفتاو سیٚ کۆمەڵ.

پێشەوا موعاویەی کوری ئەبی سوفیان (ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویٚ: (أَلَا إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ(ﷺ) قَامَ فِينَا فَقَالَ: أَلَا إِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ افْتَرَقُوا عَلَى اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، وَإِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ، اثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ وَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ، وَهِيَ الْجَمَاعَةُ)[٢].

واتە: ئاگاداربن خاوەن پەرتوکەکانی پێش ئێوە (واتە: جوولەکەو گاور) بوون بە هەفتاو دوو کۆمەڵ، ئەم ئومەتەش دەبێتە هەفتاو سیٚ کۆمەڵ، هەفتاو دوویان لە دۆزەخدان، تەنها یەکێکیان لە بەهەشت دایە ئەویش (الجماعە)یە واتە: کۆمەڵە.

پێشەوا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(ﷺ) دەڵێت: (إِنَّمَا الْجَمَاعَةُ مَا وَافَقَ طَاعَةَ اللَّهِ وَإِنْ كُنْتَ وَحْدَكَ)[٣].

---

(١) صحيح: المستدرك، (١/ ٦) كتاب: الإيمان، برقم: (٩). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ.

(٢) الشريعة، (١/ ٣١٤) باب: ذكر افتراق الأمم، برقم: (٢٩).

(٣) شرح أصول اعتقاد لأهل السنة والجماعة (١/ ١٢١) برقم: (١٦٠).

واتە: وشەی (الجماعە) بریتیە لە شویٚن کەوتنی قورئان و سوننەت گەر بەتەنهاش بیٚت.

پیٚشەوا عومەری کوری عەبدولعەزیزیش (رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ) دەڵیٚت: (سَنَّ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) وَوُلَاةُ الْأَمْرِ بَعْدَهُ سُنَنًا, الْأَخْذُ بِهَا تَصْدِيقٌ لِكِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ, وَاسْتِكْمَالٌ لِطَاعَتِهِ, وَقُوَّةٌ عَلَى دِينِ اللَّهِ, لَيْسَ لِأَحَدٍ تَغْيِيرُهَا وَلَا تَبْدِيلُهَا, وَلَا النَّظَرُ فِي رَأْيِ مَنْ خَالَفَهَا, فَمَنِ اقْتَدَى بِمَا سَنُّوا اهْتَدَى , وَمَنِ اسْتَبْصَرَ بِهَا أَبْصَرَ, وَمَنْ خَالَفَهَا وَاتَّبَعَ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ وَلَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مَا تَوَلَّاهُ وَأَصْلَاهُ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا)[1].

واتە: پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) پاشان پیٚشەواکانی موسڵمانان لە دوای ئەوە ریٚ و شویٚنیان بۆ دیاری کردووین، کارکردن پیٚیان بەراست خستنەوەی کتیٚبەکەی خوایە، هەروەها تەواو ملکەچ بوونە بۆ جیٚبەجیٚ کردنی ئاینەکەی خوا، هیچ کەسیٚك بۆی نیە بیگۆریٚت یان ئاڵوگۆری بکات یان تەماشای بۆ چوونەکانی دژ بەو بکات، ئەو کەسەشی بیکاتە پیٚشەوای خۆی هیدایەت دراو دەبیٚت، وە ئەو کەسەش بیکاتە رووناکی خۆی ریٚگەی خۆی پیٚ دەدۆزیٚتەوە بەڵام ئەو کەسەی بە پیٚچەوانەی ئەو کار بکات و شویٚن ریٚگەیەکی تر بکەویٚت جگە لە ریٚگەی برواداران ئەو کەسە خوای گەورە بەو ریٚگە چەوتەی خۆی دەیبات تا دەیگەیەنیٚتە ناو دۆزەخ و توشی خراپترین چارەنووسی دەکات.

وە هەر کۆمەڵیٚکیش خەڵکی بۆ لای خۆی بانگ دەکات و لافی ئەوەش لیٚ دەدات کە تەنها خۆی لەسەر هەقەو باقی گرۆهەکانی تر باتیلە.

پیٚشەوا عەبدوڵلای کوری حەی(ﷺ) دەڵیٚت: جاریٚکیان لەگەڵ موعاویەی کوری ئەبو سوفیان (ﷺ) چووین بۆ حەج، کە گەیشتینە شاری مەککە، پاش ئەوەی کە نویٚژی نیوەرۆی کرد، هەستایە سەرپیٚ و گوتی: پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ أَهْلَ الْكِتَابَيْنِ افْتَرَقُوا فِي دِينِهِمْ عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، وَإِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً - يَعْنِي : الْأَهْوَاءَ - كُلُّهَا فِي النَّارِ إِلاَّ وَاحِدَةً، وَهِيَ الْجَمَاعَةُ،

---

(١) شرح أصول اعتقاد لأهل السنة والجماعة (١/ ١٠٥) برقم: (١٣٤).

وَإِنَّهُ سَيَخْرُجُ فِي أُمَّتِي أَقْوَامٌ تَجَارَى بِهِمْ تِلْكَ الأَهْوَاءُ كَمَا يَتَجَارَى الْكَلْبُ بِصَاحِبِهِ، لاَ يَبْقَى مِنْهُ عِرْقٌ وَلاَ مَفْصِلٌ إِلاَّ دَخَلَهُ وَاللَّهِ يَا مَعْشَرَ الْعَرَبِ لَئِنْ لَمْ تَقُومُوا بِمَا جَاءَ بِهِ نَبِيُّكُمْ (ﷺ)، لَغَيْرُكُمْ مِنَ النَّاسِ أَحْرَى أَنْ لاَ يَقُومَ بِهِ)[١].

واتە: جولەکەو گاورەکان لەسەر دینەکەیان بوونە حەفتاو دوو کۆمەڵ، ئوممەتی منیش دەبێتە حەفتاو سێ کۆمەڵ، هەموویان دەچنە ئاگرەوە تەنها یەکێکیان نەبێت، کە ئەوانیش کۆمەڵە سەرەکیەکەن (الجماعە)، لە ئوممەتەکەی من کۆمەڵێك پەیدا دەبن تێکەڵ بەو هەواو ئارەزووانە دەبن و شوێنی دەکەون هەروەك چۆن ئەو کەسەی کە سەگ قەپی لێگرتووە ژەهرەکەی بە خوێنیدا دەڕوات و بە گیانیدا بڵاودەبێتەوە، تا وای لێدێت هیچ دەمارو ماسولکەیەکی نامێنێت کە تێی نەچێت، پاشان موعاویە گوتی: سوێند بە خوا ئەی میللەتی عەرەب، ئەگەر ئێوە نەتوانن ئاینی پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) ڕابگرن و پێی هەستن، ئەوا خەڵکی تر لە پێشترن کە پێی هەڵنەستن و جێ بەجێی نەکەن.

بە نیسبەت کۆتا دەقی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) جیا ڕایی لە نێو زانایانی فەرموودەناس هەیە[٢].

---

(١) مسند الإمام أحمد (٢٨/ ١٣٥) برقم: (١٦٩٣٧). وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

(٢) پێشەوا شەوکانیش باسی قسەکانی ئیبنو کەثیر دەکات لەسەر ئەم فەرموودەو پاشان دەڵێت: منیش دەڵێم ئەو زیادەیەی کە دەڵێ: (كلها في النار إلا واحدة) واتە: هەموویان دەچنە ئاگرەوە تەنها یەکێکیان نەبێت، کۆمەڵێك لە زانایانی فەرموودەناس بە(ضعيف)ی دەدەنە قەڵەم.

لە ئیبنو حەزمیشەوە گوزاراوەتەوە کە گوتویەتی: ئەو زیادەیە (موضوع)ە، نە بەرزکراوەتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نەبەرزیش کراوەتەوە بۆ هاوەڵەکان، واتە: (مرفوع) نیەو (موقوف)یش نیە، (مرفوع) فەرمودەیەکە تا دەگاتە پێغەمبەر (سەنەدەکەی) نەوەستێ، (موقوف) یش فەرمودەیەکە تا دەگاتە هاوەڵان نەوەستێ، بەهەمان شێوە هەموو ئەو فەرموودانەی سەرزەنشتی (قەدەریەکان) و (مورجیئەکان) و (ئەشعەریەکان) دەکەن، هەموو فەرمودەی (ضعيف)ن. سەرچاوە/ العواصم والقواصم، (١/ ٦٨٦-٦٨٧).

ئەم فەرمودانە ئیشکالیان تێدایە لەلایان زانایانی فەرموودەناس، بەڵام لێرەدا ئیشکالێکی گەورەتر هەیە کە گوایە ئەم ئوممەتی ئیسلامە لە جوولەکەو گاور زیاتر پارچە پارچە

ئەوەی پێویست بە ڕوونکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات لەم فەرموودانەدا ئەوەیە ئەو حەفتاو سێ کۆمەڵەی کە پێغەمبەر(ﷺ) باسیان دەکات مەبەست پێیان کامەیە؟ ئایا ئەو حەفتاو سێ کۆمەڵە تەنها موسڵمانەکان دەگرێتەوە لە نێو خۆیان یان هەموو ئەو کۆمەڵ و حیزب و بیروباوەڕە نا ئیسلامیانە دەگرێتەوە کە لە کۆنەوەو هەتا ئەمڕۆش سەریان هەڵداوەو دروست بوون؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەگەر لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ورد ببینەوە دەبینین دەفەرموێت: (سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ)[1].

واتە: ئوممەتەکەی من دەبێتە حەفتاو سێ کۆمەڵە.

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی ئەو کۆمەڵ و دەستەو گرۆهانە دەگرێتەوە کە لە چوار چێوەی ئیسلام و بەرنامەکەی خودا کاردەکەن، بەڵام بە هۆی هەواو ئارەزوو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانەوە هەندێك بیرۆکەو ڕێچکەی تایبەتیان لە ڕاستە ڕێی ئیسلام دابڕیوەو لە کۆمەڵی موسڵمانان و شوێن پێی پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانی لایانداوە، نمونەی ئەمانەش لە مێژووی

دەبن، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە یانی چی ئەو تاقمانە هەموو دەچنە ئاگر، تەنیا یەکێکیان نەبێت؟ ئەمە وادەکات هەر یەك لەو تاقمانە لافی ئەوە لێ بدات کە تەنها هەر ئەو تاقمە ڕزگاربووەکەیەو ئەوەی لەگەڵ ئەم نەبێ ئەوە خەسارەتمەندو دۆڕاوە، دەی ئەمە بۆ خۆی مایەی پارچە پارچەکردنی ئوممەتی ئیسلامیەو وایان لێدەکات ئەم قسە بەوی تر بڵێت: کە ئەوەش هەموو لایەك لاواز دەکات و دوژمنەکانیان بەهێز دەکات و وایان لێ دێ چاویان تێببڕن.

زانای گەورە ئیبنو وەزیر هەموو ئەو فەرموودانە عەیبدار دەکات و بەتایبەتی ئەو زیادەیەی کە لە ڕیوایەتەکانی تردا هاتووە، چونکە ئەم فەرموودە بە ڕای ئەو بووەتە هۆی ئەوەی هەندێك لەم ئوممەتە هەندێکی تر بەسەر لێشێواو بزانێ و نەك ئەوە بەڵکو هەندێك هەندێکی تر بە کافر بزانن!!

ئەوەتا ئەبو موحەممەدی کوڕی حەزم ڕەتی هەموو ئەوانە دەداتەوە کە خەڵکی بەکافر دەداتە قەڵەم لەبەر ئەوەی جیاوازی بیروڕای هەیە لە شتانێکدا کە ئەو باسیان دەکات. سەرچاوە/ الفصل في الملل والاهواء والنحل، (٣/ ٢٩٢).

(١) اصحيح: رواه الحاكم في المستدرك، (١/ ٦) كتاب: الإيمان، برقم: (٩). قال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ.

بەشی یەکەم

ئیسلامدا زۆرن وەکو (خەواریجەکان و[١] موعتەزیلەکان و[٢] مورجیئەکان و[٣] جەبریەکان و رافیزیەکان[٤]).

مێژوونوسی گەورە ئیبنو کەسیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە پەرتوکی (البداية والنهاية) باسی ئەم بەرەکانە دەکات و دەڵێت: لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا تەنها لە شاری بەغدا نزیکەی حەفتا کۆمەڵی لەو جۆرەی تێدابوو کە هەموویان خۆیان بە کۆمەڵی سەرەکی موسڵمانان دەزانی، زۆر جاریش بە هۆی بیرو بۆچوونە جیاوازەکانیانەوە ڕووبەڕووبوونەوەو تێك هەڵبژان لە نێوانیاندا دروست دەبوو.

---

(١) (خەواریج): یەکەم تاقمێك بوون لە مێژووی ئیسلامدا دەرکەوتن، دەرچوون لە ژێر دەستی ئەمیری باوەڕداران (عەلی کوری ئەبی تالیب) و هەندێك لە هاوەڵانیان کافر کرد.. لە بیروباوەڕیان: پێویست بوونی دەرچوون بەسەر پێشەوایانی موسڵمانان کە ستەم و فسقیان تێدا بێ.. وە کافرکردنی بکەری تاوانی گەورە.. وە قسەی ئەوەی کە بە نەمری ئاگردا دەمێنێتەوە، وە ئینکارکردن و باوەڕ نەبوون بە شەفاعەت.

(٢) (موعتەزیلە): کۆمەڵێکی ئیسلامین لە کۆتاییەکانی سەردەمی ئومەویدا دروست بوون، پشتیان بە ژیری ڕووت بەستووە لە تێگەیشتنیان بۆ عەقیدەو بیرو باوەڕ ئەویش بەهۆی کاریگەربونیان بە هەندێ فەلسەفەی هێنراو.. کە وای لێکردن لە عەقیدەو بیروباوەڕی سەلەف لابدەن.. هۆی ناوبردنیشیان بە موعتەزیلە دەگەڕێتەوە بۆ کەنارگیربوونی (واصیلی کوری عەتا) لە کۆڕی دەرسەکانی حەسەنی بەسری.. لە بیرو باوەڕیان و ئینکارکردنی هەموو سیفەتەکان .. وە قسەی ئەوە کە خاوەن تاوانی گەورە نەکافرەو نە باوەڕدارە..وە قسەی ئەوەی کە قورئان دروست کراوە.

(٣) (مورجیئە): یەکێکن لە تاقمە کەلامیەکان کە خاوەنی کۆمەڵێ مەفاهیمی هەڵەن لە مەسەلەی عەقیدەو باوەڕدا.. هیچ بوون و کیانێکیان نەماوە.. قسەو باسەکانیان لەناو زۆرێك لە تاقمەکانی دیکەدا بڵاوبوونەتەوە.. یەکەم کەسیش کە لەسەر (ئیرجا) قسەی کردووە (زەری کوڕی عەبدوڵلا) بوو.. توندترین جۆرەکانی (ئیرجا) ئەوانەن کە دەڵێن: باوەڕ تەنها مەعریفەو زانیاریە، بێباوەڕیش تەنها نەفامی و بێ ئاگاییە بە خواو بەس.. لە قسەی ئەمانەشەوە ئەوە وەردەگیرێ کە ئیبلیس و فیرعەون ئیمانداری تەواو بوون.

(٤) (رافیزە): ئەوانەن کە جێنشینایەتی ئەبوبەکرو عومەریان ڕەفز کردو وەریان نەگرت.. گومانیان وابوو کە جێنشینی بۆ عەلییە.. پەیوەندیان هەبووە بە بۆچونەکانی (عەبدوڵلای کوری سەبەء)ی جولەکەوە.. دەڵێن: کە ئیمامەت پایەکە لە پایەکانی دین.. پێشەواکان بێ تاوانن و زۆربەی هەرە زۆری هاوەڵەکانیان پێ کافرە.

ئەم كۆمەڵانە جیاوازی نێوانیان بە هۆی لێكدانەوەی جیاوازیان بوو بۆ دەقە ئیسلامیەكان، بەڵام لە چوارچێوەی ئیسلام و ئومەتی پێغەمبەریشدا (ﷺ) بوون بە زیاتر لە حەفتا كۆمەڵەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) لە دەرحەقیاندا دەفەرموێت: هەموویان دەچنە ئاگر بە هۆی شوێن كەوتنی هەواو ئارەزوو بەرژەوەندیەكانی خۆیانەوە، تەنها كۆمەڵە سەرەكیەكان نەبێت كە لە ڕێ و شوێنی من و هاوەڵەكانم لایان نەداوە.

ئەو كۆمەڵ و حیزب و بیروباوەڕانەی كە هەر لە سەرەتاوە باوەڕیان بەوە نیە كە قورئان دەستوور بێت و ئیسلام بەرنامەی ژیان بێت و شوێن كەوتەی بەرنامەو یاسا دروستكراوەكانی دەستی مرۆڤەكان بن و دوژمنایەتی بەرنامەی ئیسلام و كۆمەڵی موسلمانان بن، ئەوانە لە ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) ناژمێردرێن ناچنە ڕیزی حەفتاو سێ فیرقەكەوە، چونكە ئەمانە لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامن و كێشەی ئەوان لە چوارچێوەی ئیسلام و ئومەتی ئیسلامیدا نیە، بەڵكو كێشەكەیان لەگەڵ ئومەتی ئیسلام و خودی ئیسلام خۆیدایە.

پێشەوا ئەبو حاتەم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: لە هەندێ زانای ئومەتم بیستووە كە یەكەم دەستەو تاقمێك لەم ئومەتە جیابونەتەوە ئەمانە بوون: (زەنادیقە.. قەدەریە.. مورجیئە.. حروریە.. شیعە) ئەمانە ڕیشەو بنچینەی تاقمە ئیسلامیەكانن، پاشان هەر یەكەو بووەتە چەند بەشێكەوە، بەڵام لە بنەڕەتدا هەر یەك دەگرنەوەو دەچنەوە سەر یەك ڕێگە، تەنانەت هەندێكیان هەندێكی تر كافر دەكەن، بەهەر حاڵ (زەنادیقە) دەبێتە (١١) بەشەوە كە (موعەتەلەو مەنانیە)ش لەخۆ دەگرێت.. قەدەریە دەبێتە (١٨) بەشەوە، شیعە دەبێتە (١٣) بەشەوە، كۆی هەمووی دەكاتە (٧٢) تاقم[1].

پێشەوا قورتبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە تەفسیرەكەیدا باسی بەرەكان

---

(١) الإبانة (١/ ٣٨٦٣٨٠).

دەكات و دەڵێت: ئەم بەرەكانە ئەمانەن: (الحرورية[1] والقدرية[2] والجهمية[3]

---

(١) (الحروريه) دوانزه لقی لێ دەبێتەوە كه ئەمانەن:
*(ئەزرەقیه)كان دەڵێن: لا نعلم أحدا مؤمنا وكفروا أهل القبلة إلا من دان بقولهم.
*(ئەباضیه)كان دەڵێن: من أخذ بقولنا فهو مؤمن ومن أعرض عنه فهو منافق.
*(ثعلبیه)كان دەڵێن: إن الله عزوجل لم يقض ولم يقدر.
*( خازیمیه)كان دەڵێن: لا ندري ماالإيمان، والخلق كلهم معذورون.
*(خەلفیه)كان دەڵێن: أن من ترك الجهاد من ذكر أو أنثى كفر.
*(كوزیه)كان دەڵێن: ليس لأحد أن يمس أحدا لأنه لا من النجس ولا أن يؤاكله حتى يتوب ويغتسل.
*(كەنزیه)كان دەڵێن: لا يسع أحدا أن يعطى مائة أحدا، لأنه ربما لم يكن مستحقا بل يكنزه في الأرض حتى يظهر أهل الحق.
*(شەمرەخیه)كان دەڵێن: لا بأس بمس النساء الأجانب لأنهن رياحين.
*(ئەخنەسیه)كان دەڵێن: لا يلحق الميت بعد موته خير ولا شر.
*(حەكەمیه)كان دەڵێن: من حاكم إلى مخلوق فهو كافر.
*(موعتەزیله)كان دەڵێن: اشتبه علينا أمر علي ومعاوية فنحن نتبرأ من صليت.
*(مەیمونیه)كان دەڵێن: لا إمام إلا برضا أهل محبتنا.

(٢) (قەدەریەكان) ئەمەشیان دوانزه لقی لێ دەبێتەوە كه ئەمانەن:
*(ئەحمەریه)كان دەڵێن: أن في شرط العدل من الله أن يملك عباده أمورهم ويحول بينهم وبين معاصيهم.
*(ثنویه كان)كان دەڵێن: أن اخير من الله والشر من الشيطان.
*(موعتەزیلەكان)كان دەڵێن: خلق القرآن وجحدوا صفات الربوبية.
*(كەیسانیه)كان دەڵێن: لا ندري هذه الأفعال من الله أو من العباد؟ ولا نعلم أيثاب الناس بعد أو يعقبون.
*(شەیطانیه)كان دەڵێن: إن الله تعالى لم أصحهما الشيطان.
*(شەریكیه)كان دەڵێن: إن السئات كلها مقدرة إلا الكفر.
*(وەهمیه)كان دەڵێن: ليس لأفعال الخلق وكلاهم ذات ولا للحسنة والسيئة ذات.
*(زەبریه)كان دەڵێن: كل كتاب نزل من عندالله فالعمل به حق ناسخا كان أو منسوخا. *(مەسعەدیەكان) كان دەڵێن: أن من عصى ثم تاب لم تقبل توبته.
*(ناكیثیه)كان دەڵێن: أن من نكث بيعة رسول الله(ﷺ) فلا إثم عليه.
*(قاسیطیه)كان دەڵێن: تبعوا إبراهيم بن النظام في قوله: من زعم أن الله شئ فهو كافر.

(٣) (جەهمیەكان) ئەمەشیان دوانزه لقی لێ دەبێتەوە كه ئەمانەن:
*(موعەتەله)كان دەڵێن: أن كل ما يقعه عليه وهم الإنسان فهو مخلوق وأن من إدعى أن الله يرى فهو كافر.
*(مەریسیه)كان دەڵێن: أكثر صفات الله تعالى مخلوقة.
*(مولتەزقه)كان دەڵێن: جعلوا الباري سبحانه في كل مكان.
*(واریدیه)كان دەڵێن: لا يدخل النار من عرف ربه ومن دخلها لم يخرج منها أبدا .
*(زەنادیقه)كان دەڵێن: ليس لأحد أن يثبت لنفسه ربا لأن الإثبات لا يكون إلا بعد إدراك الحواس وما لا يدرك لا يثبت .
*(خەرقیه)كان دەڵێن: أن الكافر تحرقه النار مرة واحدة ثم يبقى محترقا أبدا لا يجد حر النار.
*(مەخلوقیه)كان دەڵێن: أن القرآن مخلوق.
*( فانیه)كان دەڵێن: أن الجنة والنار بفنيان ومنهم من قال لم يخلقا.
*(عەبدیه)كان دەڵێن: جحدوا الرسل وقالوا: إنما هم حكماء.
*(واقیفیه)كان دەڵێن: لا نقول إن القرآن مخلوق .
*(قەبریه)كان دەڵێن: نحن ينكرون عذاب القبر والشفاعة .
*(لەفظیه)كان دەڵێن: لفظنا بالقرآن مخلوق.

والمرجئة[١] والرافضة[٢] والجبرية[٣])یەن، هەر یەکێکیش لەوان (١٢) لقی لێ دەبێتەوە، پاش ئەمانەش ئەگەر هەموویان کۆبکەینەوە ئەوا دەبن بە (٧٢) بەرەکە.

ئیبنو تەیمیە دەڵێت: هەر کەسێ بە تێکڕا تەکفیری ئەم (٧٢) بەشەیە بکات، بەڕاستی پێچیەوانەی کیتاب و سوننەت و ئیجماعی هاوەڵان و تابیعینی کردووە[٤].

---

(١) (مورجیئەکان) ئەمەشیان دوانزە لقی لێ دەبێتەوە کە ئەمانەن:
*(تاریکیە)کان دەڵێن : ليس لله عزوجل على خلقه فريظة سوى الإيمان به فمن آمن به فليفعل ما شاء.
*(سائیبیە)کان دەڵێن: إن الله تعالى سيب خلقه ليفعلوا ماشاؤوا.
*(راجیە)کان دەڵێن: لا يسمى الطائع طائعا ولا العاصي عاصيا للأنا لا ندري ماله ثم الله تعالى .
*(سالبیە)کان دەڵێن: الطاعة ليست من الإي .
*(بەهیشیە)کان دەڵێن: الإيمان علم ومن لا يعلم الحق من الباطل والحلال من الحرام فهو كافر .
*(عەمەلیە)کان دەڵێن: الإيمان عمل.
*(مەنقوسیە)کان دەڵێن: الإيمان لا يزيد ولا ينقص .
*(موستەثنیە)کان دەڵێن: الإستثناء من الإيمان .
*(موشەبەهە)کان دەڵێن: بصر كبصر ويد كيد.
*(حەشویە)کان دەڵێن: حكم الأحاديث كلها واحد فعندهم أن تارك النفل كتارك الفرض.
*(ظاهریة)کان دەڵێن: نحن النين نفوا القياس.
*(بیدعیە)کان دەڵێن: نحن أول من ابتدع هذه الأحداث في هذه الأمة .

(٢) (رافیزە): ئەوانەن کە جێنشینایەتی ئەبوبەکرو عومەریان رەفز کردو وەریان نەگرت.. گومانیان وابوو کە جێنشینی بۆ عەلییە.. پەیوەندیان هەبووە بە بۆچونەکانی (عەبدوڵلای کوری سەبەء)ی جولەکەوە.. دەڵێن: کە ئیمامەت پایەکە لە پایەکانی دین.. پێشەواکان بێ تاوانن و زۆربەی هەرە زۆری هاوەڵەکانیان پێ کافرە.

(٣) (جەبریەکان) ئەمەشیان دوانزە لقی لێ دەبێتەوە کە ئەمانەن:
*(موضطریە)کان دەڵێن: لا فعل للأدمي الله يفعل الكل.
*(ئەفعالیە)کان دەڵێن: لنا أفعال ولكن لا استطاعة لنا فيها وإنما نحن كالبهائم بالحبل. *(مەفروغیە) کان دەڵێن: كل الأشياء قد خلقت والآن لا أصاحهما شئ .
*(نەجاریە)کان دەڵێن: أن الله تعالى يعذب الناس على فعله لا على فعله.
*(مەنانییە)کان دەڵێن: نحن عليك بما يخطر بقلبك فافعل ما توسمت منه الخير.
*(کەسبیە)کان دەڵێن: لا يكتسب العبد ثوابا ولا عقابا.
*(سابیقیە)کان دەڵێن: من شاء فليعمل ومن شاء فلا يعمل فإن السعيد لا تضره ذنوبه والشقي لا ينفعه بره.
*(حوبیە)کان دەڵێن: من شرب كأس محبة الله تعالى سقطت عنه عبادة الأركان .
*(خەوفیە)کان دەڵێن: من أحب الله تعالى لم يسعه أن يخافه لأن الحبيب لا يخاف حبيبه. *(فیکریە) کان دەڵێن: من ازداد علما أسقط عنه بقدر ذلك من العبادة .
*(خەشبیە)کان دەڵێن: الدنيا بين العبادة سواء لا تفاضل بينهم فيما ورثهم أبوهم آدم. *(مەنییە)کان دەڵێن: منا الفعل ولنا الإستطاعة.

(٤) منهاج السنة، لا ٥ .

## ئازادکردنی شاری ئەستەمبۆڵ
## لەسەردەمی محەممەد فاتح

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئازادکردنی شاری (ئەستەمبۆڵ)ە.

پێشەوا ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (هَلْ سَمِعْتُمْ بِمَدِينَةٍ جَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَرِّ وَجَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَحْرِ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَغْزُوهَا سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ بَنِي إِسْحَاقَ، حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا نَزَلُوا، فَلَمْ يُقَاتِلُوا بِسِلَاحٍ وَلَمْ يَرْمُوا بِسَهْمٍ قَالَ: فَيَقُولُونَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ فَيَسْقُطُ أَحَدُ جَانِبَيْهَا، قَالَ ثَوْرٌ: وَلَا أَعْلَمُهُ إِلَّا قَالَ: جَانِبُهَا الَّذِي يَلِي الْبَحْرَ، ثُمَّ يَقُولُونَ الثَّانِيَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، فَيَسْقُطُ جَانِبُهَا الْآخَرُ، ثُمَّ يَقُولُونَ الثَّالِثَةَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ فَيُفَرَّجُ لَهُمْ فَيَدْخُلُونَهَا فَيَغْنَمُونَ..)[1].

واتە: شارێکتان بیستووە بەشێکی لە وشکایی دایەو بەشێکی لە ئاودایە گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا حەفتا هەزار لە نەوەکانی ئیسحاق هێرشی بۆ دەکەن، کاتێك کە دەیگەنێ دادەبەزن نە بە چەك شەڕیان لەگەڵ دەکەن و نە تیریشیان تێدەگرن، هەر ئەوەندە دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر) لایەکی دەڕوخێت، پاشان بۆ دووەم جار دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر) لایەکەی تریشی دەڕوخێت، پاشان بۆ جاری سێیەم دەڵێن: (لا إله إلا الله والله أكبر) ئەمجارە بۆیان دەکرێتەوەو دەچنە ناوی و دەستکەوتێکی زۆریان دەبێت.

---

(١) صحيح مسلم (٤/ ٤٣٢٢) كتاب: الفتن وأشراط الساعة، باب: لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل، برقم: (٠٢٩٢).

هەندێ لە زانایانی تازەی سەردەم پێیان وایە ئازادکردنی شاری (ئەستەنبۆڵ) هێشتا کاتی نەهاتووەو ئازاکردنەکەی وەك فەرموودەی ساغ هاتووە، بەبێ چەك و کوشتار دەبێت و تەنها بە وشەی (لا إله إلا الله والله أکبر) ڕزگار دەکرێت، ئەمەش وەك ئیعجازێك لەو سەردەمە ڕوودەدات، لەو زانایانە (أحمد شاکر.. محمد ناصرالدین الألباني.. حمود التویجري.. د.رضاء الله بن محمد إدریس المباکفوري)[1].

(قوسطنطنیه) بیزەنتەی کۆنە.. قوستنتینی گەورە لە ساڵی (٣٢٤) ی کۆچی سەر لە نوێ دروستی کردۆتەوەو ناوی نا قوستنەتنیە.

لە فەرموودەیەکی تر دەفەرموێ: (لا تقوم الساعة حتی یفتح الله علی المؤمنین القسطنطنیة الرومیة بالتسبیح والتکبیر)[2].

واتە: کۆتایی بونەوەر نایەت هەتا بڕوادارەکان قوستنتنیەی ڕۆما ئازاد دەکەن بە تەسبیح و تەکبیر...

ئەبو قومبیل دەڵێ: لە خزمەت (عەبدوڵلای کوری عەمر) بوین، پرسیاری لێکرا، ئایا کام شار سەرەتا ئازاد دەکرێ؟ (قوسطنطنیه) یان (رۆمیه)؟ (عەبدوڵلا)ش فەرمانیدا سندوقێکی هەبوو کە بۆی بێنن، کە بۆیان هێنا نوسراوێکی تێدا دەرهێناو پێی گوتن: کاتێك لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بوین خەریکی نوسینەوە بوین، لە ناکاو پرسیاری لێکرا، کە ئایا کام شار لە پێشدا ئازاد دەکرێت، (قوسطنطنیه) یان (رۆمیه)؟ فەرموی: لە پێشدا شارەکەی (هیرقل) ئازاد دەکرێت واتە: (قوسطنطنیه)[3].

---

(١) إتحاف الجماعة (١/ ٢٣٣ ـ ٣٣٣) وعمدة التفسیر عن ابن کثیر (٢/ ٦٥٢).

(٢) رواه الدیلمي، کنز العمال، (١٠٦٨٣) فهارس سبل الهدي الرشاد في سیرة خیر العباد، الإمام محمد بن یوسف الصالحي الشامي، (١/ ٤٥٤) المتوفي ٢٤٩ هـ جمع وترتیب خالد عبدالفتاح، دار الکتب العلمیة.

(٣) صحیح: رواه الإمام أحمد ورجاله صحیح، غیر أبي قبیل وهو ثقة، کما قال الهیثمي، والحاکم في المستدرك، وقال: صحیح الإسناد، وصححه الألباني في مجمع الزوائد (٦/ ٤٣٢).

پێشەوا موعاویە لە سەردەمی خۆی (یەزیدی) کوڕی نارد بۆ ئازادکردنی ئەو شارە، بەڵام نەیتوانی و گەڕایەوە، بەڵام دواتر هەر لە سەردەمی حوکمی ئومەویەکان، (مەسلەمەی کوڕی عبدالملیك) توانی بە سوپایەکەوە بگاتە نزیکی ئەو شارەو ئابڵوقەی خستنە سەر، گەرچی ئەویش نەیتوانی ئازادی بکات، بەڵام ڕێککەوتنێکی لەگەڵ خەڵکەکەی واژۆکرد، بەوەی کە مزگەتێك لەو شارە دروست بکرێت بەناوی مزگەوتی (مەسلەمە) لە (قوسطنطنیە)، بۆیە مزگەوتەکەش دروست کرا[1].

دواتر لە سەردەمی حوکمڕانی (عوسمان)یەکان و لەسەر دەستی (موحەممەد فاتح) ئازاد کرا لە ساڵی (٨٥٧) کۆچی و کرایە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانیەکان و ناوەکەیان گۆڕی بە (ئاستانە)[2].

## چۆنیەتی ئازادکردنی شاری ئەستەمبوڵ بە کورتی:

(موحەممەد فاتح) لە ژیانی ئاواتی ئەوە بوو شاری (قوسطنطنیە) ئازاد بکات لە کاتێکدا ئازادکردنی زۆر ئەستەم بوو لەو سەردەم، ئەم ئاواتەشی بەوە بۆ دروست بوو کە باوکی هەر لە منداڵیەوە دەیبرد بۆ بەشداری کردن لە شەڕەکاندا تا ترسی بشکێ و چاوی بکرێتەوە، پاشان مامۆستاکەشی (اق شمس الدین) زۆرجار دەیبرد بۆ کەنار دەریاو لە دوورەوە قەڵاکانی (قوسطنطنیە)یەی پیشان دەداو دەیگوت: ئەو شارە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە کە لەسەر دەستی یەکێ لە سەرکردە موسڵمانە چاکەکاندا ئازاد دەکرێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەر زوو هەواڵی دابوو کە ئەو سوپایەی فەتحی (قوسطنطنیە) یان شاری (ئەستەمبوڵ) دەکات سوپایەکی چاکەو ئەمیرەکەشی چاکەو خوا لێیان خۆش دەبێت، ئەمەش وای کرد کە موسڵمانان چەندین جار هەوڵی گرتنی بدەن، لە (٨٠٠) ساڵدا (١٠) جار هەوڵی بۆ درا، تەنانەت (ئەبو ئەیوبی ئەنصاڕی) لە سوپای (یەزید)

---

(١) الفتن والملاحم، ابن كثير (٨٦).

(٢) تأريخ الدولة العثمانية، د. علي حسون (٣١) والمنجد في الاعلام (٤٣٨ ـ ٤٣٩).

بوو کە دەوری ئەو شارەیان بۆ چەند ساڵێك دا، سەرەنجام ئەبو ئەیوب نەخۆش کەوت و وەسیەتی کرد کە تا کوێ نزیك بوونەوە لە قەڵاکە لەوێدا بینێژن، لێیان پرسی: بۆ حەزدەکەی لە نزیك قەڵاکە بنێژرێیت، فەرمووی: بۆ ئەوەی کە بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتمەوە من نزیکترین کەس بم لە قەڵاکەوەو سا بەڵکو لەگەڵ ئەو سوپایەدا حەشر بکرێم کە ئازادی دەکەن.

شاری (ئەستەمبۆل) گرتنی ئاسان نەبوو، چونکە دوو لای ئاو بوو، وە (٥٠٠) کەشتی جەنگی پاسەوانیان دەکردو شوێنەکەی زۆر گرنگ بوو.

ناپلیۆن[1] دەڵێت: ئەگەر هەموو دونیا وڵاتێك بێت باشترین پایتەخت بۆی (قوسطنطنیە)یە.

---

(١) پیاوانی مێژوو کەسیان وەکو ناپلیۆن شوێن پەنجەیان بەسەر مێژووی جیهانەوە بەجێ نەهێشتووە، (ناپلیۆن) لە (١٥)ی ئابی (١٧٦٩) لە ئەجاکسیۆی دورگەی کۆرسکا لە دایك بووە، لە منداڵیدا خۆی دەشوبهاندە ئەو پیاوە کۆنانەی هێزو ئەوانەی شتی لەسەر خوێندبوونەوەو ناوبانگیان هەبوو، بە تایبەتی کاتێك لە تەمەنی (١٩) ساڵی ئەکادیمیای سەربازی پاریسی تەواو کرد، کە گەیشتە تەمەنی (٢٤) ساڵی کرایە سەر لەشکر، بۆ سەندنەوەی شاری (تۆلۆن) لە دەستی بەریتانیەکان دوای سەرکەوتنی لەو جەنگەدا سەرکردایەتی سوپای فەرەنسای کرد بۆ سەرکەوتن بەسەر نەمسادا، دوای ئەوە ناپلیۆن بوو بە حاکمی گشتی فەرەنساو دەستی دایە چاکسازی لە هەموو دەزگاکانی دەوڵەت.. لە ساڵی (١٨٠٤) ناپلیۆن خۆی بە ئیمپراتۆر لەسەر فەرەنسا ڕاگەیاند لە دە ساڵی یەکەمی ئیمپراتۆریەتەکەی فەرەنسا لە شەڕێکی نیمچە بەردەوام دابوو، لەگەڵ ئەوەشدا توانی بەسەر کەوتنەکانی ئەوروپاو ئیسپانیا داگیر بکات و بەرەو سنوورەکانی روسیاش پێش ڕەوی بکات، لە ساڵی (١٨١٢)دا ناپلیۆن بڕیاریدا ڕووسیا داگیر بکات، بە سوپایەك کە لە شەش سەد هەزار زیاتر بوو، لەگەڵ ئەوەی سوپاکە گەیشتبونە مۆسکۆ، بەڵام لەبەر بێ توانایی و نەگەیشتنی کۆمەك و ماندوبون و سەرماو سۆڵە ناچاربوون پاشەکشە بکەن.

لە ڕێگەی گەڕانەوەدا هەموو سوپاکە فەوتان و تەنیا نزیکەی (١٠٠) هەزار کەسیان بە سەلامەتی گەیشتنەوە وڵات، دوای ئەوەی (ناپلیۆن) چەند شکستێکی تری هێنا، ناچار لەسەر کورسی حوکم دابەزی و دوور خرایەوە بۆ دورگەی (ئیلبا)، بەڵام لە تاراوگەکەی هەڵات و گەڕایەوە فەرەنساو سوپایەکی نوێی کۆکردەوەو کەوتە جەنگ، بەڵام ئەمجارەش لە جەنگی (واتەرلۆ) شکستی هێنا لە بەرامبەر سوپای لینگتۆن و بلۆتشردا، لە ساڵی (١٨١٥) لەم شکستەدا (ناپلیۆن) خۆی دایە دەستی بەریتانیاوە ئەوانیش وەکو زیندانیەك ناردیانە دورگەی (سانت هیلینا) و لەوێدا مایەوە تا ڕۆژی مردنی لە (٥) ی ئایاری (١٨٢١)، (ناپلیۆن) سەرکردایەتی فەرەنسای کرد بۆ مەزنی و هێزێکی نوێ، بەڵام دەشبێ بوترێت هۆی سەرەکی بوو لە دروست کردنی ئازارو مەینەتی و وێران کردنی ژیانی نەتەوەکەیدا.سەرچاوە: بانکی زانیاری، وەرگێرانی مستەفا سەعید، لا ١٤٤.

(محەممەد فاتح) هەر لە منداڵیەوە بلیمەت بوو پێنج زمانی دەزانی، هەموو جار مامۆستاکەی پێی دەگوت: من وا دەزانم تۆ ئەو ئەمیرەیت کە شاری (قوسطنطنیە) ئازاد دەکەیت، وە لە تەمەنی (٢٣)ساڵی باوکی مردو ئەو بوو بە خەلیفە.

سوڵتان (محەممەد فاتح) کە تەمەنی گەیشتە (٢٠) ساڵ (سوڵتان موراد)ی باوکی دەسەڵات و حوکمی بۆ بەجێ هێشت، سوڵتان (محەممەد فاتح) دەیویست فەتحی قوستەنتنیە بکات، سوپای پێکەوە ناو نامەیەکی نارد بۆ باوکی و پێی گوت: من یادت دەخەمەوە کە دەبێ بە قسەی وەلی ئەمر بکرێت، کە تۆ پێویستە بێیت بۆ (ئەدرنە)و حوکمی وڵات بکەیتەوە، (سوڵتان موراد)ی باوکیشی کاتێ نامەکەی پێگەیشت و خوێندیەوەو زۆر گریا زانی کوڕەکەی پێگەیشتووەو دەیەوێ خزمەتی ئیسلام بکات، بۆیە هاتە (ئەدرنە) و حوکمی گرتەوە دەست، لاوی خواناسی نەبەردیش (محەممەد فاتح) دەوری قوستەنتنیەی گرت، پێش هێرش بردن ترسێك هەبوو لە دڵی موسڵمانان لە قایمی قەڵاو لەو سەربازانەی کە لەسەر قەڵاکەوە بوون، هەرچی نزیك ببایەتەوە ئاوی گەرم و ڕۆنی قرچاوی گەرمیان دەکرد بە سەریان، لێرەش لاوێکی خواناسی پێگەیشتوو کە عەقڵی لە تەمەنی گەورەتر بوو هاتە مەیدان و گوتی: ئێمە هاتووین لە پێناوی خوادا گیانمان بەخت بکەین چۆن لە ڕۆنی قرچاو دەترسێین.

بەڵێ.. ئەم لاوە ناوی (حەسەن ئولو بادلی) بوو، (٣٠) گەنجی تێکۆشەری لە دەور کۆبویەوە، کە پەیمانیان دا نەگەڕێنەوە دواوە، ئینجا موسڵمانان قەڵاکەیان دایە بەر مەنجەنیق و ئەو (٣٠) کەسە هێرشیان برد یەك لە دوای یەك شەهید بوون، سەرەنجام (حەسەن) یەکەم کەس بوو پێی نایە ناو قەڵاکەوەو دەرگای کردەوەو دوایی موسڵمانانیش ڕژانە ناو قەڵاکەوە، بەمەش سەرکەوتنێکی بێ وێنەیان بۆ ئیسلام تۆمار کرد.

ڕۆژێك (محەممەد فاتح) لە شارەزایانی پرسی: هۆی چیە (قسطنطنیە) ئازاد ناکرێ؟ گوتیان: لەبەر سێ هۆ:

١) ئەوان لە قەڵای قایم دان و ئەو سوپایەی کە دەچێت لە دەشتێکی کاکی بە کاکی ڕووت، ناتوانێ خۆی بگرێ و ناتوانرێ بە ئاسانیش قەڵا دروست بکات.

٢) قەڵاکانیان بەرزە بە تۆپی قورس نەبێ کاریان تێناکرێ.

٣) زنجیرەی ئاسنیان لەو ئاوە داناوە کە لە دەوری قەڵاکەیەو کەشتی ناتوانێ پیایدا بڕوات.

مێژوو نووسان دەڵێن: (موحەممەد فاتح) داوای لە ئیمپراتۆریەتی (قوسطنطنیە) کرد کلیلی ئەو شارەی تەسلیم بکات، ئەویش ڕازی نابێ (موحەممەد فاتح)یش بەو پەڕی بوێریەوە دەڵێت: زۆر چاکە با کلیلەکان نەدات، هەر لەم نزیکانە یان پایتەختەکەم لە (قوسطنطنیە) دەبێت یان گۆڕەکەم.

بەڵێ.. هیممەتی مەردانەی (موحەممەد فاتح) کە تەمەنی گەیشتبووە (٢٥)ساڵێك کەوتە کارو لە (٣) مانگدا قەڵایەکیان بەرامبەر قەڵاکانی ڕۆمەکان دروست کرد، پێش ئەوەی زستان بێت بە سەریان.. بۆ دروستکردنی تۆپی قورس گوتیان: زانایەکی شارەزای مەجەری هەیە لە لای ڕۆمەکان بەندەو کارەکەش بەو دەکرێت، گوتی: ئاسانە ئازادی دەکەین و دەیفڕێنین.

ئەوەبوو (٣) کەسی بلیمەتی ناردو توانیان ئەو زانایە لە بەندیخانە دەربکەن و بیفڕێنن و بیهێنن بۆ لای سوڵتان (محەممەد فاتح)، ئەو زانایەش تۆپی قورسی بۆ دروستکردن تا بگاتە قەڵاکان و هەر (تۆپ)ێکیش (١٠٠) کەسی بە دەور بوو.

ئینجا بۆ رزگاربوون لە زنجیرەکانی ناو ئاوەکە درەختی ئەو ناوەی بڕیەوەو چەوری کردن و (٧٠) کەشتی بەسەر ئەو دارانەدا ڕاکێشا بەناو دەشت و دۆڵ و شاخدا لەلایەکی ترەوە لە پشت زنجیرەکانەوە خستنیە ناو ئاوەکە، ئەم کارەشی لە یەك شەودا جێبەجێ کردو بەیانی زوو لە ناکاو پەلاماری کەشتیەکانی دوژمنی داو زۆربەیانی سوتاند.

(محەممەد فاتح) زۆر هانی سەربازەکانی دەداو ورەی بەرز دەکردنەوەو پێی دەگوتن: حەز دەکەن شوێنکەوتەی پێغەمبەربن(ﷺ)، ئەمشەو زۆر سەڵاوات بدەن لەسەر گیانی ئەو زاتە، ئەمشەو فەرمودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) دێتە دی، ئینجا

داوای لێکردن کە ئەو شەوە پێش ڕۆیشتن یەکی دوو رکات نوێژ بکەن و لە خوا بپاڕێنەوە کە کارەکەیان بۆ ئاسان بکات[1].

(محەممەد فاتح) پاش ئەوەی سەرکەوت بەسەر دوژمنەکان گوتی: من بە دوو خاڵ سەرکەوتم:

١) دڵێکی ڕەقم هەیە وەکو بەرد نەرم نابێ هەتا ئەوەی دەمەوێ جێبەجێی دەکەم.

٢) دوو چاوی فرمێسک ڕێژم هەیە کە لە ترسی خوا ئەسرین دەڕێژێ.

**پرسیارێك:** بۆچی ئەو هەموو سەرکردانە هەوڵی ئازادکردنی خاکی ئەستەنبۆڵیان داوە؟

**وەڵام:** چونکە پێغەمبە(ﷺ) فەرموویەتی: (لَتُفْتَحَنَّ الْقُسْطَنْطِينِيَّةُ، فَلَنِعْمَ الْأَمِيرُ أَمِيرُهَا، وَلَنِعْمَ الْجَيْشُ ذَلِكَ الْجَيْشُ)[2].

واتە: شاری قوستەنتنیە ئازاد دەکرێ، پێشەواکەی باشترین پێشەوایە، وە سوپاکەی باشترین سوپایە.

هەروەها لە پێش هاتنی دەجالیش دووبارە ئەم شارە ئازاد دەکرێتەوە لەلایان موسڵمانانەوە.

---

(١) تاريخ الدولة العلية الثمانية، محمد فريد، لا ١٦٢ .

(٢) المعجم الكبير، للطبراني (٣٨/٢)، وصحح هذا الوجه ابن منده في معرفة الصحابة، (لا ٢٢٩).

## سەرهەڵدانی دوانزە خەلیفە

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دوانزە خەلیفە سەرهەڵدەدەن..

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إِنَّ هَذَا الْأَمْرَ لَا يَنْقَضِي حَتَّى يَمْضِيَ فِيهِمِ اثْنَا عَشَرَ خَلِيفَةً.. كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ)[١].

واتە: ئەم فەرمانە نابڕێتەوە تاکو دوانزە خەلیفە فەرمانڕەوایەتی نەکەن، وە هەموویان لە قورەیشن.

پێشەوا جابری کوری سەمورە(ﷺ) دەڵێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (يكون اثنا عشر خليفة كلهم من قريش)[٢].

واتە: دوانزە خەلیفە دێت کە هەموویان لە قورەیشن.

لە ریوایەتی ئەبو داود هاتووە: (لا يزال هذا الدين قائماً حتى يكون عليكم اثنا عشر خليفة)[٣].

واتە: بە بەردەوامی ئەو ئایینە هەر ڕاوەستاوەو ناڕوات هەتا دوانزە خەلیفەتان بەسەر دێت.

لە ریوایەتێکی تر فەرموویەتی: (لا يزال هذا الدين عزيزاً إلى اثنى عشر خليفة)[٤].

واتە: بە بەردەوامی ئەم ئایینە خۆشەویستە هەتا دەگاتە دوانزە خەلیفە.

---

(١) صحيح مسلم (٣/ ١٤٥٣) كتاب: الإمارة، باب: الناس تبع لقريش، برقم: (١٨٢١).
(٢) صحيح البخاري (١٣/ ٢١١) كتاب: الأحكام، باب: في الإستخلاف.
(٣) رواه ابو داود (٤/ ١٠٦) كتاب: المهدي، برقم: (٣٥٩٨).
(٤) رواه ابو داود (٤/ ١٠٦) كتاب: المهدي، برقم: (٣٥٩٩).

پێشەوا ئیبنو کەثیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: ئەم فەرموودە بەڵگەی تیایە کە پێویستە دوانزە خەلیفەی دادوەر بێن و ئەوانەش پێشەواکانی شیعە نین، چونکە زۆرێك لەوانە هیچ بەرپرسیاریەتی نەبووە لە دەوڵەتی ئیسلام، بەڵام ئەو دوانزەیە خەلیفەن و بەرپرسیاریەتی گەورە لە ئەستۆ دەگرن و دادگەریش دەبن[١].

ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە کە پێغەمبەرمان محەممەد (ﷺ) باسی فەرمووە.

ئەگەر سەیری مێژوو بکەین دەبینین موسڵمانان بەهێزو یەك ڕیزبوون لە سەردەمی چوار خەلیفەی راشدین، ئینجا جیاوازی دروست بوو تا پێشەوا حەسەنی کوڕی عەلی تەنازولی کرد بۆ پێشەوا موعاویە، موسڵمانان یەککەوتنەوە لەسەردەمی پێشەوا موعاویە، پاشان ڕا جیایی دروست بویەوە لەسەردەمی یەزید، پاشان بە شەهیدبوونی (عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر) و مردنی (مەڕوانی کوڕی حەکەم)، موسڵمانان بوون بە یەکریز لە سەردەمی (عبدالملك کوڕی مەروان) و (وەلیدی کوڕی عبدالملك) و (سولەیمانی کوڕی عبدالملك) و (عومەری کوڕی عبدالعزیز) و ( یەزیدی کوڕی عبدالملك) و (هیشام کوڕی عبدالملك)، بەمەش ژمارەیان دەبێت بە یانزە خەلیفە، دوای هیشام دەوڵەتی عەباسی هێنایە کایەوەو پەرتەوازەیی دروست بوویەوە، و یەکریزی نەماو ئومەویەکان لە ئەندەلوس سەریان هەڵدایەوە.

تا ئەمرۆش حاڵەکە بەردەوامە، ماوەتەوە بڵێین کە پێغەمبەرمان محەممەد (ﷺ) هەواڵی داوە کە لە نزیك قیامەتدا لەسەر دەستی محەممەدی مەهدی موسڵمانەکان دەبن بە یەك ڕیز، کە ئەویش قورەیشیەو ژمارەکەش دەبێ بە دوانزە، بۆیە ئەمەش بە نیشانەیەك لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی هەژمار دەکرێت..

---

(١) تفسير القرآن العظيم، ابن كثير، (٦/ ٧٨).

دروست بوونی گومانێك و وەڵامدانەوەی:

زۆر جار پرسیارێك دەکرێت و دەوترێ:

لەلای هەندێك لە شیعەکان ئەو دوانزە ئیمامەی کە لە فەرمووده‌کەی پێشەوا موسلیم هاتووە دوانزە ئیمامی شیعەکانە کە کۆتاییەکەی بە مەهدی دێت، بەڵام پێشەوا ئیبنو تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) وەڵامی ئەم گومانە دەداتەوەو دەڵێت:

ئەم فەرموودەیەی کە هاتووە نابێت بوترێت مەبەست پێی دوانزە ئیمامی شیعەکانە، بەڵکو فەرموودەکەی پێغەمبەرمان محەممەد(ﷺ) مەبەستی لەوەیە کە لەو سەردەم ئیسلام زیندوو دەبێتەوە، چونکە ئەگەر سەیری دەقی فەرموودەکان بکەین ئەوە چەند وسەیەك بەدی دەکەین کە فەرموویەتی: (لا يزال هذا الدين عزيزاً) یان (لا يزال هذا الدين قائماً) ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەمیشە ئیسلام بە بەرزی دەمێنێتەوە، بەڵام لە سەردەمی ئەم دوانزە خەلیفەیە عیززەت بە دەستدەهێنن و حوکمی ئیسلام دێتە ئاراوە[1].

وە فەرموویەتی: (كلهم من قريش) هەمووی لە قوڕەیشن، ئەگەر هەمووی تایبەت بوایە بە پێشەوا عەلی و منداڵەکانی دەبوایە جیای بکردایەتەوە، وە نەیفەرمووە (كلهم من ولد إسماعيل) یان (كلهم من العرب)، ئەگەر وای فەرمووبوایە ئەو کات خەلیفایەتی دەبووە هۆزایەتی، کەواتە وشەی قوڕەیشی بە گشتی هێناوە نەك بە هۆزێکی تایبەت وەکو (بەنی تەمیم و بەنی عەدی و بەنی عەبدی شەمس و بەنی هاشم) وە خەلیفەکانی ڕاشدین هەمووی لەو هۆزانە بوونە.

---

(١) منهاج السنة النبوية (٨/ ٢٥٣).

ئەو دوانزە خەلیفەیە کێن؟

- چوار خەلیفەی ڕاشیدین، پێشەوایان ئەبوبەکرو عومەرو عوثمان و عەلی (ڕەزای خوایان لێ بێ).
- پێشەوا موعاویە (ﷺ) لەگەڵ کوڕەکەی یەزید.
- عەبدوالمەلیکی کوڕی مەڕوان و هەر چوار منداڵەکەی (وەلیدو سولەیمان و یەزیدو هیشام).
- پێشەوا عومەری کوری عەبدولعەزیز (ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

بەم شێوەیە دوانزە خەلیفەکە ئەوانە بوون کە لە دوای پێغەمبەری خواوە هاتوون، نەك مەبەست پێی ئیمامی شیعەکان بێت.

# شەهید بوونی ئوم حیرام

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی شەهیدبوونی ئوم حیرامە..

پێشەوا ئوم حیرام (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت:

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) خەوتبوو لە خەوەکەیدا بە پێکەنین خەبەری بویەوە، ئوم حیرام گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ پێدەکەنی؟

فەرمووی: (أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ هَذَا الْبَحْرَ قَدْ أَوْجَبُوا قَالَ: قَالَتْ أُمُّ حَرَامٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَنَا فِيهِمْ؟ قَالَ: أَنْتِ فِيهِمْ قَالَ: أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ مَدِينَةَ قَيْصَرَ مَغْفُورٌ لَهُمْ قَالَتْ أُمُّ حَرَامٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ, أَنَا مِنْهُمْ؟ قَالَ: لَا..)[1].

واتە : یەکەمین سوپا لە ئوممەتم کە غەزا دەکەن و دەچنە دەریاوە، بەهەشتیان بە دەست هێناوە.

ئوم حیرام گوتی:

منیان تێدام ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟

فەرمووی: بەڵێ تۆ لەگەڵیان دای..

ئینجا فەرمووی:

یەکەم سوپا لە ئومەتم کە هەوڵی گرتنی شاری قەیصر دەدەن، خوا لێیان خۆش بووە.

---

(١) صحيح: المستدرك، (٤/ ٥٩٩) برقم: (٨٦٦٨)، وقال الإمام الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الْبُخَارِيِّ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیان لەگەڵدام..

فەرمووی : نەخێر.

ئوم حیرام دەڵێ: ئیتر زانیم شەهید دەبم..

هاوەڵانیش پێیان دەگوت: شەهیدی زیندوو.

ئوم حیرام هەر چاوەڕێی ڕۆژی شەهید بوونی بوو تا پێشەوا ئەبوبەکرو عومەر وەفاتیان کردو لە خیلافەتی پێشەوا عوسمان، کەشتی گەلی ئیسلامی دامەزرا و چوون بۆ فەتحی دوورگەی (قوبرص) لە ساڵی (٢٧) ی کۆچی، کە تەمەنی ئوم حیرام (٦٠) ساڵ بوو ، کە بە سەرکەوتوویی دابەزین لەسەر دوورگەکە، ئوم حیرام لە حوشترەکەی کەوتە خوارەوەو شەهید بوو، بەڵێ وەك پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵیدا بە یەکەم شەهید لەسەر خاکی (قوبرص) کە تا ئێستاش مەزارەکەی ماوەو هەرچی بچێ وەك شوێنێکی (سیاحی) سەردانی دەکات .

ئەم فەرموودەیە هەواڵ دەدات بە دروستکردنی کەشتی جەنگ و چوونە ناو دەریا، کە ئەمەش لەسەردەمی پێشەوا موعاویەی کوری ئەبو سفیان هاتە دی.

وە هەواڵ دەدات بەوەی کە (ئوم حرام) دەمێنێ تا ئەو کاتەو بەشداری دەکات لەو چوونە ناو دەریایە .

بەڵێ.. (ئوم حرام) لەگەڵ عوبادەی کوڕی صامتی مێردی چوونە ناو ئەو کەشتیەوەو چوون بەرەو فەتحی (قوبرص)، کە لە کەنار دەریاکە دابەزی (ئوم حرام) لەسەر وڵاخ کەوتە خوارەوەو شەهید بوو، قەبرەکەشی تا ئێستا ماوە لەو شوێنەدا .

وە هەواڵ دەدات بە ئازادکردنی شاری (ئەستەمبۆڵ و قوبرص) کە ئەمەش ڕوویدا لە سەردەمی (محەممەد فاتح).

## سوتاندنی کەعبەی موشەڕڕەف

لە نیشانەکانی نزیکبونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەسانێك هەڵدەستن بە سوتاندنی کەعبەی ماڵی خوای گەورە.

دایکمان مەیمونە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا .. حُرِّقَ الْبَيْتُ الْعَتِيقُ)[1].

واتە: ئێوە حاڵتان چۆن دەبێت کاتێك ماڵی خوا سوتێنرا.

ئەم فەرموودەیەش هاتە دی وەکو هەموو ئەو موعجیزانەی کە لە پێشتردا ڕوونمان کردەوە..

لە ئێوارەی عەسری ڕۆژی شەممەی ٢٣ شەعبانی ساڵی ١٣٣٤ی کۆچی، کاتێك شەڕ هەڵگیرسا لە نێوان شەریف حوسەین و یەکێك لە جوندیەکانی دەوڵەتی عوسمانی.



---

(١) صحيح: مسند الإمام أحمد (٦/ ٣٣٣) برقم: (٢٦٧٨٢) قال الشيخ الأرناؤوط: إسناده حسن.

# ڕووخاندنی کەعبەی موشەڕڕەف

لە نیشانەکانی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی کەعبەی ماڵی خوا دەڕوخێنرێت، چۆن سوتانەکەی نیشانەیەکی قیامەت بوو، بە هەمان شێوە ڕووخاندنەکەی نیشانەیەکە لە قیامەت.

پێشەوا عومەری کوری خەتاب (ﷺ) دەڵێت: پێم گەیشتووە کە کەعبەی پیرۆز سێ جار دەڕوخێنرێت و لە جاری سێهەم یان چوارەم بەردە ڕەشەکە بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان، بۆیە پێش بەرزکردنەوەی عیبادەت و تەوافی بە دەوردا بکەن[1].

پێشەوا کەعب (ﷺ) دەڵێت: کەعبە چوار جار دەڕوخێنرێت و لە چوارەمین جاری ئیتر بەردە ڕەشەکە بەرز ئەکرێتەوە بۆ ئاسمان، بۆیە چێژ لە عیبادەتەکانی کەعبە ببینن[2].

**تێبینی/ کەعبە تا ئێستا سێ جاران ڕووخاوە:**

یەکەم جار: پێش ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك قورەیش ڕووخاندیان و دروستیان کردەوە چونکە بە هۆی لافاوەوە دیوارەکانی لاواز ببون.

دووەم جار: لە سەردەمی عەبدوڵلای کوری زوبەیردا کاتێك لەگەڵ حوصەینی کوری نمیر چواردەوری مەککەیان دا بۆ شەڕکردن لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی زوبەیردا و مەنجەنیقیان گرتە کەعبە ئیتر دیوارەکانی دارمان، بۆیە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر کەعبەی ڕووخاندو جارێکی تر دروستی کردەوە لەسەر ئەو شێوەیەی کە پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) بنیاتی نابوو.

---

(١) المصنف لأبن ابي شيبة ، برقم: (٩١٧٦).

(٢) المصنف لأبن ابي شيبة ، برقم: (٩١٧٨).

بەرگی یەکەم

پێشەوا موجاهید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: کە کەعبەیان ڕووخاند سێ ڕۆژ ڕامان کردلە مەککە چونکە چاوەڕێ بووین سزای خوای گەورە بێت.

**سێیەم جار:** ئەو کاتەی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی دەستی گرت بەسەر مەککەداو کەعبەی ڕووخاندو لەسەر ئەم شێوەیەی ئێستا دروستی کردەوە.

**بۆ جاری چوارەم:** لە کۆتایی بونەوەر لە دوای ئەوەی کە هیچ کەس لەسەر زەوی ناوی (الله) ناهێنن، پیاوێکی حەبەشی لاتی کەچەڵی پشت کوڕ بەو لاوازیەی خۆی ئەچێت کەعبە ئەڕوخێنێت و ئیتر بەردە ڕەشەکەش بەرز ئەبێتەوە بۆ ئاسمان، چونکە ئەو بەردە بەردی بەهەشتەو کاتێکیش هاتە سەر زەوی سپی بوو، بەڵام تاوانی مرۆڤەکان ڕەشی کرد.

# ناوەڕۆک

بەرگی یەكەم

# زانستی نوێ
# و
# کۆتایی بوونەوەر

لای هەموو مرۆڤێك ئاشکراو ڕوونە کە خوای پەروەردگار پێغەمبەرمانی محەممەد(ﷺ) ناردووە بۆ ئەوەی ببێتە موژدەدەرو ترسێنەر تا ڕۆژی دوایی.

ئەم ئوممەتەش کۆتا ئوممەتە، پێغەمبەری خۆشەویستمان (محمد) کۆتایی پێغەمبەرانە، خوای پەروەردگار ئەم ئوممەتەی تایبەتمەند کردووە کە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لێوەی سەر هەڵبدات و لەسەر زمانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی بکاتەوە. زانستی سەردەم ڕاستی نزیکبوونەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی دەردەخات، بۆیە زۆر پێویستە لەسەر موسڵمانی ژیر، بیر لە کاتی هاتنی ڕوودانی ئەم ڕۆژە ترسناکە بکاتەوە.

خوای گەورە ئەوەندە هۆکارو توانای پێ بەخشیوین کە ئیتر هیچ بیانویەکمان بۆ نەمێنێتەوە لە کاتی هەر بەڵایەکدا، نایەتە بەر هەستم ئادەمیزادێك هەبێت لە دەرگای زانایەك بدات و پرسیاری لێ بکات نیشانەکانی کۆتایی بونەوەر چییە؟ لەبەر ئەوەی بابەتەکەی بەلاوە گرنگ نیە.




کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بلاو کردنەوە

▪ 07504671394 - 07824671394
▪ فەیس بووك : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
▪ هەولێر - بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری